# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: ژیانی دووەمی مرۆڤ
نووسین: سالارعمر
پێداچوونەوە: م. زید دوزتەپەیی
نەخشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی
نەخشەسازیی بەرگ: زریان هەمزە
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٢ کۆچی – ٢٠٢١ میلادی-٢٧٢١ کوردی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « ٣٦٨ »ی ساڵی «٢٠٢١»ی پێ دراوە.

﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا﴾ [الإسراء ٣٢]

هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهو تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە.

تێبینی : ئەوەی لەم کتێبەدا باس کراوە ئاگادارکردنەوەیە بۆ خەڵکی تا لێی دووربکەونەوە و خۆیان بپارێزن
تکایە ئەم کتێبە بۆفێربوونی پیلان نیە بۆیە کەس دووبارەی نەکاتەوە و بەرامبەرەکەی پێ لەناو نەبات

## بەر لە دەستپێك

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ژیانی یەکەمی مرۆڤ ،کاتێ مرۆڤ لەدایك دەبێ بەگیانێکی پاك و جەستەیەکی پاك و فیترەتێکی پاك و دەروونێکی ڕووناك و بیروباوەڕێکی پاك وچاك لەدایك دەبێت،جا ئەگەر مرۆڤ لەسەر ئەو ژیانە پاکە ژیا و ژینی بەڕێکرد ئەو کاتە ژیان پاك و ڕەوشت چاك و دەروون بەرز و ڕێژین ساف و کەسایەتی بەرز دەبێتە ناو و نازناو و پێناسی کەسەکە

بەڵام گەر مرۆڤ لەو ڕێژینەساف و پاکە لەو فیترەتەپاکە لایدا تووشی لاڕێی و هەڵەی گەورە و بیروباوەڕی خراپ و ناو و نازناوی سوك دەبێت و بەرەوژیانی دووەمی دەچێت.

جا هۆکارەکان و ڕێچکەکانیش زۆرن کە مرۆڤ لە فیترەتە پاکەکەی لادەدەن و توشی هەڵە و پەڵەی زۆری دەکەن ولەژیانی یەکەم دووری دەخەنەوە،وەك (داوێن پیسی، شەراب خواردنەوە،تلیاك ، درۆکردن،دووڕوویی ،زمان پیسی و چەندینی تر ...)

ئەوەی ئێمە لەم پەرتوکە مەبەستمانە باسی بکەین بابەتێکی گرنگ و پڕ مەترسیە کە ئەمڕۆ مرۆڤی لەژینی یەکەم دوورخستۆتەوە و بێئاگابووە و بردوێتیە ناو ژیانی دووەمی،بێگومان ژیانی دووەمیش بریتیەلە شکاندنی شکۆ و ڕێزی مرۆڤ و هێنانەخوارەوەی نرخی مرۆڤایەتیە،مرۆڤ لەئاستی مرۆڤایەتی دەهێنێتە ئاستی ئاژەڵ و بگرە خوار ئاستی ئاژەڵیش ئەو بابەتە مەترسی دارەش بریتیەلە ( داوێن پیسی) ...

لەم پەرتوکەدا باس لە کۆمەڵێ هۆکاری داوێن پیسی دەکەین کە کە ئەمڕۆ مرۆڤ بێئاگایانە کەوتۆتە تەڵەی بەدڕەوشتی بەهەموو چین و توێژەکانەوە بێ ئەوەی هەستیشی پێبکا،بەهیوای ئەوەی کەوا ئێستا ئەوانەی لەژینی یەکەم دابڕاون و کەوتونەتە ژیانی دووەم بەخۆیان دابچنەوەو بگەڕێنەوە سەر فیترەتە پاکەکەی خۆیان کە تەوحید و ڕەوشتی جوانە، وە دەست هەڵبگرن لەو کار و کردەوانەی کە دەیکەن

وە ئەو کەسانەشی کەوتوونەتە ناو هۆکارەکان و نزیك بوونەتەوە لەژیانی دووەم ،ئەوانیش بەخێرایی کەنارێ بدۆزنەوە بۆ ڕزگار بوون بەر لەوەی کەشتیە شکاوەکەیان نغرۆبێ و دەریای داوێن پیسی حەپەلوشیان بکات.

ئێستا جیهان بەگشتی دوای شەهوەت و ئارەزوو بازی کەوتووە، وە شەهوەت گرنگیەکی زۆر و تایبەتی پێدەدرێ لەلایەن کەسانێکی عەقڵ و دەروون نەخۆشەوە، جا لەپێناوی دەستکەوتنی پارەبێ یان دەسەڵات وەرگرتن بێ یان هەرشتێکی تربێ گرنگ ئەوەیە لەچەند ڕێچکەیەکەوە دێن و بەچەکی بەدڕەوشتی لە کۆمەڵگای ئیسلامی دەدەن و ئەو کۆمەڵگایەی پێ لەناو دەبەن و شیرازەی خێزانیش تێکدەدەن و خەڵکیش بەرەو داوێن پیسی و بەدڕەوشتی دەبەن.

هۆکارەکانی داوێن پیسی زۆرن وە ئەو ڕێگایانەی کە دەیگرنە بەر بۆ توشبوون بەداوێن پیسیش زۆرن ئێمە لێرە باسی چەند ڕێگەیەکی سەرەکی دەکەین کە ئەوان لەو ڕێگایانەوە هێرشەکانیان بۆ لەکەدارکردنی ڕەوشتی موسڵمانان دەست پێ کردووە، لەوانە لەڕێگەی (دەزگاکانی ڕاگەیاندن، گرنگی دان

بەتێکەڵاوی و تەوقەکردنی ئافرەت و پیاو، وە لەڕێگەی پۆرنۆگرافییەکانەوە، لەڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانەوە ) ئەوان نیشانی خۆیان دەپێکن.

لەم چەند لاپەڕەیەدا بەشێوەیەکی زانستی تیشك خراوەتە سەر بابەتەکان و هۆکار و زیان و چارەسەری و حوکمی" شەرع" یش لەو بارەوە باس کراوە.

لەگەڵ باسکردنی چەند بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە کە ناوەکان و شوێنەکان پارێزراون و ئاماژەیان پێنەکروە.

هیوادارم ئەم چەند لاپەڕەیە ببێتە بەخۆداچوونەوە و بەئاگا هاتنەوەی یەکجارەکی و گرتنە بەری ڕێگە ڕاست و دروستەکەی ئیسلام و بەردەوام بوون لەسەر ئەو ڕێگایە.

داوا لەپەروەردگارم دەکەم لەهەڵە و کەم و کوڕییەکانی بەندەکەی خۆشبێ و لەڕۆژی دوایشدا میهرەبانی بەرامبەرم بنوێنێ.

آمیـــــــــن.

## پێشکەشە بە ...

* باوکم کە خوێنی لەپێناو خزمەت و پەروەردەی ئێمەدا ووشك کرد و ئارەقەی زۆری ڕشت .

* بە **دایکم** یەکەم نیشتیمان و قوتابخانەی من .

* بە نیوەکەی تری ڕۆحم دایکی ڕێزدار .

* بە هەموو یوسف و دایکە عائیشە داوێن پاکەکان .

* بە وانەی ژینگەی پاك دەروست دەکەن لە کۆمەڵگەدا .

* بە وانەی نەوەیەکی تەندروست و داوێن پاك پێشکەشی کۆمەڵگا دەکەن.

* بە وانەی دوای خوێندنەوەی ئەم چەند لاپەڕەیە بەخۆیان دادەچنەوە و دەست هەڵدەگرن لەداوێن پیسی و بەدڕەوشتی .

* بە هەموو ئەوانەی کە یارمەتیان داوم بۆ کاری خێر .

## سوپاس بۆ:

* مامۆستا صالح عبدالله بۆ خوێندنەوە و پێدانی هەندێ تێبینی .

* مامۆستا سیروان محمد بۆ پێداچوونەوەی سەرچاوە وەرگێڕدراوەکانی زمانی ئینگلیزی .

* مامۆستا علی دووگردکانی بۆ ڕێکخستنی ووشەسازی.

* مامۆستای خۆشەویست مامۆستا زەید دوزتەپەیی، کە یەکەم کەس بوو دەستی گرتم بۆ زۆرکاری خێر و بیرۆکە وە یەکێ لەو بیرۆکانەش نووسین بوو.

* وە سوپاسی زۆر تایبەت بۆ دایکی ڕێزدار کە زۆرترین کاتی بەمن بەخشی تا ئەم کتێبە بنووسم.

* بۆ ئەهەموو ئەوانەی هاوکار و یارمەتیدەرم بوون .

## ڕێڕەوی باس ...

بەشێوەیەکی گشتی ئێستا جیهان لەناو نەفامی دا دەژی بەتایبەت لەڕووی ئەخلاقەوە، لەبەرئەوەی جیهان گرنگی بەهەموو شتێك دەدات جگە لە ئەخلاق و بەها مرۆییەکان، جگە لەمە تەنانەت هەوڵ و تێکۆشان دەکەن بۆ ئەوەی مرۆڤ لە مرۆڤبوون بکەن و ناخی پیس بکەن و بیرکردنەوەی پیس بکەن و لەژێر ناوی ئازادی تاك و هەندێ ناونیشانی تر مرۆڤ بێننە ژێر ئاستی ئاژەڵیش، کە ئەمەش تەنها لە دوو ڕێگەوە دەتوانن وا لەمرۆڤ بکەن ئەویش شەهوەت و شبوهاتە.

بەتایبەت ئەو وولاتانەی کە هەڵگری دینی عەلمانیەتن و دژایەتی ئیسلام دەکەن ئەوان هاتوون ئیش لەسەر ئەوە دەکەن کە کۆمەڵگا و هەموو جیهان بە پۆڕن بکەن، ئەمەش واتا ژیانی هەموو کەس و چین و توێژەکان بخەنە نێو قاڵبێك کە مرۆڤەکان بەگشتی تەنها بیر لە ئارەزوو و بیرکردنەوەی سێکسی بکەنەوە، وە مەبەستیشیانە فیترەتی پاکی مرۆڤ بشێوێنن، جا بەهەر شێواز و هەر نرخێك بێ گرنگ ئەوەیە بێڕەوشتی بڵاوبێتەوە و شەرم و حەیاش نەهێڵن،ئەماش لەبەر ئەوەی بێڕەوشتی لەهەرشتێکدا هەبێ ئەوا سووك و بێقیمەتی دەکات وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:- ( مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا شَانَهُ ، وَلَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا زَانَهُ )[1] واتە: بێ ڕەوشتی لەهەر شتێکا هەبێ ئەوا ئەو شتە سوك و بێ قیمەت دەکات، شەرم و حەیاش لە هەر شتێکدا هەبێ ئەوا ئەوشتە سەنگین و بەڕێزی دەکات. بەڵێ ئەوان

[1] - ابن ماجه حكم الحديث صحيح ( كتاب الزهد – باب الحياء)، مسند احمد حكم الحديث : اسناده صحيح على شرط الشيخين، سنن الترمذي حكم الحديث صحيح

دەیانەوێ کۆمەڵگە بێڕەوشتبێ دەیانەوێ کۆمەڵگە سووك و بێقیمەت بێ وە بەتایبەتیش چینی گەنجان کەدەیانەوێ دڵی گەنجان ڕابکێشنە نێو ئەو نەخۆشی و پەتا کوشندەیە، لەبەر ئەوەی دڵی گەنجان بەردی بناغەی مزگەوتەکانە، کاتێك ئەو دڵە لەمزگەوت دوورخرایەوە ئەوە مزگەوتەکە هەرچەندە بیناکەی بەرزبێ و دیکۆراتی ناوەوەو دەرەوەی جوان بێ بەڵام داڕووخا و کەلاوەیە. بەڵێ ئەوروپا گەورەترین جەنگی بەرپاکردووە لەگەڵ موسڵماناندا جەنگەکەش بریتیە لە جەنگی بەدڕەوشتی و گومان خستنە ناو دڵ و مێشکی موسڵمانان، تا ئێستاش لەو جەنگەدا بەیارمەتی هاوکارانی نەفس نزم و دەروون پیسەکان و ئەوانەی خەریکی شیرە مژەی عەلمانیەتن، لەم جەنگەدا سەرکەوتوو بووە. لەگەڵ ئەوەشدا بەداخەوە موسڵمانێکی زۆر دوای ئەورووپا کەوتووەو لاسایی هەموو شتێکی ئەوان دەکەنەوەو زۆربەی سیفەتەکانی ئەوانیان هەڵگرتووە و وادەزانن مافی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و ئاکار و ڕەوشت تەنها لای ئەوانە، لەکاتێکدا کە ئەوروپا هیچی پێ نییە لە ڕووی ڕەوشت تا پێشکەشی مرۆڤایەتی بکات، جگە لە خۆسەپاندن و کوشتن و تەفرەقە خستنە نێو وڵاتانی جیهان و تایبەت تر وڵاتانی ئیسلامی. هەروەها سەدەی بیست و یەك سەدەی شکاندنی شکۆ و بێ نرخ کردنی ئافرەتە لەلایەن جیهان و تایبەت وڵاتانی هەڵگری دینی عەلمانیەت و مارکسیەت و دیموکراسیەت، ئەویش بە داکەندنی بەرگ و پۆشاکیان وە دەرخستنی لاشەیان لەژێر ناوی ئازادی و مافی ئافرەت و یەکسانی و کۆمەڵێك شتی تریش کە بەداخەوە ئافرەتانیش بە تۆڕی ڕاوکردنەکانی ئەو وڵاتانەوە بوون و وا دەزانن ئیسلام زوڵمیان لێدەکا، هەرچەندە هەندێك جاریش ناحەق نین لەبەرئەوەی هەندێ لە پیاوەکانیان بەهۆی نەشارەزایی و لەخوا نەترسان ئازاری خێزانەکانیان دەدەن و دەیان شکێننەوە، ئەو هۆکارەش زیاتر ئەو باوەڕە

بۆ ئافرەتەکە دروست دەکات و وادەزانێ دینی ئیسلام دینێکە یەکسانی تێدا نییە.

## هۆکارەکانی داوێن پیسی ...

### یەکەم هۆکاری داوێن پیسی :

### دەزگاکانی ڕاگەیاندن ...

ئێستا بەهۆی شەهوەت و شبوهاتەوە (گومان ) هەموو دەرگاکانی بەدڕەوشتی لەسەرپشتن، شەیتانە ئینس و جنەکان بەردەوام خەریکی ڕێگە خۆشکردنن بۆ ئەوەی زۆرترین ڕێژەی خەڵکی بێنە ناو ئەو ڕێگانە و سەرقاڵیان بکەن بەخۆیان و دووریان خەنەوە لە واقعی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و بازرگانی و پیشەسازی و.. تاد، کە ئەمانە کۆڵەگەی دین و بەڕێوەبردنی ژیانی مرۆڤەکانن لەسەر بنەمای خۆشەویستی و خۆشگوزەرانی و خزمەتی وڵات و خەڵکی و پێشکەوتن و دوانەکەوتن و بێ ئاگا نەبوون لە واقع دا ،وە جیاکردنەوەی حەق و ڕاستی و ناڕاستیەکان و چەواشەکردنی خەڵك .

بۆیە شەیتانەکانی مرۆڤ و جن سەرجەم ڕێگاکانی بێ ئابڕوویان ئاسان کردووە بۆ ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵگا بێئاگابن و پەردەی غەفلەت و بێئاگایی بەسەر گوێ و چاوی خەڵکی دا بدەن و لەناو ئارەزوواتدا بیانخنکێنن .

بۆ جێبەجێ کردن و نەهێشتنی حەیا و شەرم لەناو کۆمەڵگەدا پشت دەبەستن بەمیدیا بەگشتی ئەمەش بێگومان بۆ { چەواشە و شوبهەت و شەهەوەت }

لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا و بەردەوام هەوڵ و کۆشش دەکەن بۆنەهێشتنی عززەتی پیاوان و شکاندنی غیرەتی پیاو بەرامبەر بە خێزانەکەی تا وای لێ بکەن پیاوەکە دەسەڵاتی ئەوەی نەمێنێ هیچ فەرمانێکی خوایی بە خێزانەکەی بکات وەك خۆداپۆشین و لەچك لەسەرکردن و دوور لە تێکەڵاوی و پاك داوێنی و ... تاد .

بێگومان میدیا و ڕاگەیاندن بەگشتی کاریگەری زۆری لەسەر هەرتاکێك هەیە، بۆ گۆڕینی ناخی کەسەکان . بابزانین چۆن ؟؟!!

جاران ئەگەر لە تەلەفزیۆنەکان کچ و کوڕێك دەستی یەکتریان بگرتایە، عیززەت و نەفسی پیاوەکە قبوڵی نەدەکرد و یەکسەر ئەو کەناڵەی دەگۆڕی و لەناو خەڵکیشدا باسی دەکرد کە ئەو کەناڵە شتێکی وای پەخش کردووە و خەڵکیشی لێ دوور دەخستەوە.

ئێستا ...

لەبەر ئەوەی بەشێوازێکی تۆکمە وبەرنامە بۆ دارێژراو ناحەزانی ئیسلام ووردە ووردە لەڕێگەی کەناڵەکانەوە سەرەتا بە خوێندنەوەی چەندئایەتێك لە قورئان و دواتر ئەفلام کارتۆنێکی منداڵان و دواتر هەندێ گۆرانی و مۆسیقا و پەخش کردنی هەندێ فیلم، وە بەناوی پێشکەوتن سەرنجی خەڵکیان بۆخۆیان ڕاکێشا وەو خزاینە ناو خێزانەکان.

ئێستا نەك دەست گرتن بۆتە شتێکی ئاسایی کار گەیشتۆتە ئەوەی کە لە فیلمەکان ئافرەت و پیاو بەڕووتی نیشان بدرێ لەکاتی سەرجێ و خۆشۆردن و کۆمەڵێك شتی تر .

گوتی: بەبیرم دێ تەمەنم دوازدە ساڵێك دەبوو بەدیار تەلەفزیۆنەوە دانیشتبووین، كلیپی گۆرانییەك پەخشكرا ...

لەناو كلیپەكەدا كوڕە گۆرانی بێژەكە باوەشی بە كچە ئەكتەرەكەدا كرد...

باوكم تووڕە بوو و گوتی ئەو كەناڵە بێ ئەخلاقەی بگۆڕن ئەوەچییە ئەوە چ دەبینم ؟!!.

گوتی: ئیستا باوكم هیچ فیلمێك بازنادا و هەمووی تەماشا دەكا،جا فیلمەكە سەد یان دووسەد یان هەزار ئەڵقەش بێ ، جا لەناو هەموو فیلمەكانی ئێستا دەست گرتنی پیاو و ئافرەت و باوەش بەیەكداكردن و سەرجێیی كردن و خیانەت و ...تاد ، هەمووی تێدایە، ئەگەر هەر كەسێك كەناڵەكە بگۆڕی باوكم توڕە دەبێ، جگەلەمەش كاتێ دەچینە شوێنێك دەبێ زوو هەڵسین و بێینەوە لەبەر باوكم نەوەكو ئەڵقەیەكی لێ تێپەڕبێ و نەیبینێ ، لەبەر ئەوەی یەك ئەڵقەی نەبینێ شەو ناخەوێ تا فیلمەكە درەنگانی شەو یان لە ڕۆژدا دووبارە دەكاتەوە و بەدیاریەوە دادەنیشێ .

وە یەكێك لەشتە سەیرەكان دەگێڕێتەوە دەڵێ : باوكم سەیری فیلمێكی دەكرد، بەشی دووەمی فیلمەكە ١٠٥ ئەڵقەبوو، دوای ئەوەی فیلمەكە گەیشتە كۆتا ئەڵقە ئافرەتەكە هەڵسا لەخەو...

منیش گووتم چۆن ؟ ، گوتی ئەكتەری سەرەكی فیلمەكە ئافرەتێك بوو لە ئەلقەی پێنجەمی فیلمەكە لەشوێنێك ڕاكشا و خەوی لێكەوت، سەد ئەڵقەكەی تر هەمووی خەوی ئافرەتەكەبوو و لەكۆتاییدا ئافرەتەكە هەڵسا و فیلمەكەش بێ هیچ مانایەك كۆتایی پێهات وە بەپێكەنینەوە گوتی: ئەو فیلمە

باوکمی زۆر تووڕە کرد، لەبەر ئەوەی سەد و پێنج ڕۆژ باوکمی ئاڵوودە کردبوو و هەمووشی خەو بوو .

نمونەیەك لە فیلمەکان: لەیەکێك لە فیلمەکان خێزانی پیاوێك کوڕێکی خۆشدەوێ و دەیکاتە هاوڕێی خۆی و لەگەڵی ڕادەبوێرێ و منداڵیشی لێدەبێت ، دواتر پیاوەکە دەزانێ کە خێزانەکەی لەگەڵ پیاوێکی تردا خەریکی خۆشەویستییە، پیاوەکە بەتووندی و بە تووڕەیی دەچێتەلای کوڕەکە کاتێ کەسێ شارەزایی لەو جۆرە فیلمانە نەبێ دەڵێ : ئێستادەچێ کوڕەکە دەکوژێ و دواتریش خێزانەکەی، بەڵام کاتێ پیاوەکە دەچێتەلای پیاوەکەی تر پێی دەڵێ : واز لەخێزانەکەم بێنە ئەو موڵکی منە نەك هی تۆ ، ئەویش دەڵێ : نەخێر وازناهێنم ئەو منی خۆشدەوێ ، ئیتر دەبێتە دەمە قاڵییان و ژنەکەش بەپەلە دەچێتە لایان و هەوڵی ساردکردنەوەی هەردووکیان دەدا، بەڵام سارد نابنەوە و هەر یەك لەپیاوەکان دەڵێ منی دەوێ نەك تۆ، لەم نێوەندەدا ئافرەتەکە تووڕە دەبێ و دەڵێتە پیاوەکەی خۆی: ئەو منداڵە دەساڵییە کە هەمە هی تۆ نییە، هی ئەو کوڕەیە و چەندین ساڵە ئێمە یەکترمان خۆشدەوێ ...
پیاوی ئافرەتەکەش دڵی دەشکێ و خەمبار دەبێ، کوڕەکە دەستی ئافرەتەکە دەگرێ و دەڵێتە پیاوەکە: ئەو ئافرەتە منی دەوێ و دەبێتە خێزانی من و منداڵەکەش هەر هی خۆمە، تۆ ژنەکەت بدەمن و منیش خوشکی خۆمت پێدەدەم، ئەویش دەڵێ ڕازیم.[1]

---

[1] - تێبینی : ئەوە ئەڵقەی کۆتایی فیلمەکەیە کە هەشت سەدەمین ئەڵقەیە....

دوای ئەم هەموو کاتە و بەفیڕۆدانی ئەم هەموو کاتە ئەمە کۆتایی فیلمێك بێ، دەبێ چ جۆرە ژیانێك بێ !!!

جا ئەوەی زۆر سەیرە ئەوەیە ئەگەر ئەو فیلمە ماوەیەکی تر پەخش بکرێتەوە دووبارە لە سەرەتاوە تا کۆتایی سەیری دەکەنەوە .

کارەسات لەوەدایە منداڵ و گەنج و ئافرەت و پیاو و پیر ، هەوڵی لاسایی کردنەوەی ئەو جۆرە فیلمانە دەدەن و لاسایشیان کردۆتەوە، ناوی ئەکتەرەکانیش لە منداڵەکانیان دەنێن ...

لێرە ... ئافرەتێکی خاوەن ماڵ بینەری ئەو جۆرە فیلمانەبووە، وەکو فیلمەکان هەڵساوە دەستی لەگەڵ کوڕێکی دراوسێیان تێکەڵ کردووە، سەرەتا وەکو هاوڕێ قسەی لەگەڵ کردووە و دواتر پەیوەندییەکەیان پەرەی سەندووە ، تا بۆ تە خۆشەویستی و دواتریش خیانەت...

دوای ئاشکرابوونی پەیوەندییەکەیان :

کوڕەکە هەڵهاتووە بۆ دەرەوە، ئافرەتەکە گیراوە، ئەو دوومنداڵەی کە لەخێزانەکەدا هاتوونەتە دونیا هی پیاوەکەنین بەڵکو هی کوڕەکەن، منداڵەکان لەم نێوانەدا بی دایك و بێ باوك و ماڵ ماون، کەس بەخۆیان ناگرێ.

پیاوەکە تووشی نەخۆشی نەفسی بووە و چەند جارێك هەوڵی خۆکوشتنی داوە...

ئەوە یەکێکە و هەزارانی تریش هەن و بەردەوامیشن.

**ڕێگاکانی دەزگای ڕاگەیاندن چین؟**
**کە زۆرترین خەڵکی بۆ خۆیان ڕادەکێشن و بەرەو بەدڕەوشتیان دەبەن.**
**یەکەم: ئەو کەناڵانەی تایبەتن بە فیلم .**

ئەمەیان دەبێتە دووجۆر:

**یەکەم:** تایبەت بە فیلمە درامیەکان:

فیلمەجۆراوجۆرەکان: ئەم جۆرە فیلمانە ( تورکی و عەرەبی و ئینگلیزی و فەڕەنسی و ....تاد ) دەگرێتەوە.

کەناڵەکان بەشێوەیەکی گشتی بۆ کۆکردنەوەی بینەر زۆرترین فیلمی دۆبلاژکراو پەخش دەکەن، بێ گوێ دانە حەڵاڵی و حەرامی و عورف و عادەت، ئەو فیلمانەی کە پەخشی دەکەن لەلایان گرنگ نییە مانای هەبێ یان نەیبێ، لەگەڵ دین و عورف و عادەت دەگونجێ یان ناگونجێ، ئەوانە تەنها مەبەستیانە ئەو جۆرە فیلمانە پەخش بکەن و بیر لەسەرەنجامەکەشی ناکەنەوە، جا هەندێ لەو کەناڵانەش بە ئەنقەست هەندێ جۆری فیلم و هەندێ جۆری گرتەی ڤیدیۆیی پەخش دەکەن کە سێکسی تێدایە و خێزانیش گەورە و بچووك ئافرەت و پیاو بەدیاریەوە دادەنیشێ سەیری دەکەن،ئەمەش کاریگەری دەروونی خراپ لەسەر تاك بەتاکی ئەو خێزانە دروست دەکات .

فیلمە ئێرانیەکان:

ئەوجۆرە فیلمانەش بەشێوەیەکی زۆر بەربڵاو پەخش دەکرێن، جا لەژێر ناوی مێژووی موسڵمانان بێ یان ژیانی پێغەمبەران بێ یان کێشەی کۆمەڵایەتی یان خۆشەویستی یان هەربابەتێکی تر...

بێگومان ئەو جۆرەشیان کاریگەری زۆر خراپ لەسەر بینەر جێدەهێڵن، چونکە ئەکتەرەکان کوڕ و کچ یان پیاو و ئافرەت جوانترینەکانیان ڕۆڵی تێدا دەگێڕن و سەرنجی تەماشاکار بۆ خۆیان ڕادەکێشن.

جگە لەمە زۆر جار کاتێ باسی ژیانی پێغەمبەرێك دەکات، ئەکتەرێکی سەرنج ڕاکێش دێنن بۆ ڕۆڵ بینین، کە ڕۆڵی پێغەمبەرەکە دەبینێ،بێگومان ئەمەش جگە لەوەی لەڕووی دینەوە ڕێگە پێدراو نیە لەلایەنی کۆمەڵایەتی و عەقڵیش زیانی زۆری هەیە چۆن؟

ئەکتەرێك دێنن ڕۆڵی پێغەمبەرێك دەگێڕێ، پێش هەموو شتێك بینەر فریو دەخوات بەوەی کە هەرکاتێ باسی ئەو پێغەمبەرە بکرێت ڕاستەوخۆ وێنەی ئەو ئەکتەرە دێننە بەرچاویان، ئەمەش مەترسی دارە چونکە ئەو ئەکتەرە شێوەی ڕاستەقینەی پێغەمبەرەکە دەشێوێنێ و شێوەی ئەکتەرەکە جێی پێغەمبەرە ڕاستەقینەکە دەگرێتەوە.

لەلایەکی ترەوە ئەو ئەکتەرە سەرنج ڕاکێشە ئافرەتانێکی زۆر هەستیان بۆی دەبێت و ئاواتی گەیشتنی پێدەخوازن.

وە لەسەرووی هەموو ئەمانەوە زۆر جار ناو فیلمەکان هاوارکردن بۆ غەیری اللّٰەی تێدایە و بیرو باوەڕ ( عقیدە ) ی بینەر تێکدەدات و بەرەو کوفری دەبات.

وە ئەو فیلمانەشی باسی خۆشەویستی دەکات ئەوانیش کاریگەری خراپ جێدەهێڵن، بۆنمونە: زۆرجار کچەو کوڕە لەژێر ناوی خۆشەویستی بۆ ژوان کردن دەردەچن ،کچەکە عابایەکی شەرعی لەبەرە و کوڕەکەش جلێکی ئاسایی،دوای بەسەر بردنی کاتێکی خۆش دەگەڕێنەوە، لێرە ئەو فیلمانە شەرعیەت بە کارێك دەدەن کە دروست نیە وە لەهەمان کاتیشدا شتێکی مەترسیدارە بۆ چونکە شێوازی بیرکردنەوەی کچ و کوڕ دەگۆڕێ بۆ ئەوەی ئەو کارانە دووبارە بکەنەوە ، ئەمەش لەکاتێکدا بەرجەستەکردنی ئەو کارە لە واقع دا زۆر جیاوازە و لێکەوتەی ترسناکی هەیە وەك لەفیلمەکان نیشان دەدرێ .

**دووەم:** تایبەت بە فیلمە ئەکشنەکان: ئەو جۆرە تیڤیانەش تەنها فیلمی ئەکشن پەخش دەکەن، لەناو ئەو فیلمانەش هەموو جۆرە گرتەیەکی ڤیدیۆیی هەیە، ئافرەتی تێدایە لاشەی نیمچە ڕووتە، تێیدایە هەموو لاشەی ڕووتە، بۆ پیاویش بەهەمان شێوە، ئەو جۆرە تیڤیانەش هەیانە هەموو فیلمەکە پەخش دەکات بە گرتەسێکسیەکانەوە ، هەشیانە تەنها گرتە سێکسیەکان لادەبات و بەشەکەی تری پەخش دەکات.

## دووەم: ئەوکەناڵانەی تایبەتن بە هەواڵ ...

ئەو جۆرە تیڤیانە ئەگەر سەر بە دەسەڵات بن یان نزیك لە دەسەڵات جگە لەچەواشەکاریەکی زۆری خەڵکی ئەمانەش کاریگەریان هەیە لەسەر بڵاو بوونەوەی بەد ڕەوشتی. چۆن؟؟

ئەو جۆرە تیڤیانە جوانترین ئافرەتەکان و جوانترین پیاوەکان هەڵدەبژێرن بۆ خوێندنەوەی هەواڵ، ئەمەش بۆ ئەوەی پیاوان و ئافرەتان لەخشتە ببەن، من کەسانێ دەناسم تەنها لەبەر ئەوەی ئافرەتەکە جوانە بەدیار هەواڵەوە دادەنیشێ ئەگینا هیچ گرنگی بە هەواڵەکان نادات، بۆ ئافرەتانیش بەهەمان شێوە .

جگە لەوەش ئەو جۆرە کەناڵانە پارەیەکی زۆر خەرج دەکات بۆ لاوازکردنی ئیسلام و ئیمانی خەڵکی، ئەمەش بەهێنانی کەسانێکی دەروون نەخۆش و دونیاپەرست و پارە پەرست جا لەژێرناوی مەلایەتی بێ یان بێباوەڕی بێ ئەو کەسانە دێنن و چەندین تەوەری جۆراو جۆر دەکەنەوە و لەو ڕێگایەوە تیرە ژەهراوییەکانیان بۆ دڵی موسڵمانانی نەشارەزا لە دینەکەیان دەهاوێژن و تەفرەقەی زۆر گەورە لەسەر بابەتی بچووك بچووك دەخەنە نێویان، بەمەش موسڵمانان پەیامە گەورەکەی ئیسلامیان لەبیردەچێتەوە کە یەکخواپەرستی (تەوحید) و حاکمیەتی خوایە بەهۆی سەرقاڵ کردنیان بەم بابەتە لاوەکیانە.

## سێیەم: ئەوکەناڵانەی تایبەتن بە گۆرانی و هەڵپەڕکێ :

ئەو جۆرە تیڤیانە كاریگەریەكی بەهێزیان هەیە لەسەر خەڵكی لەبەر ئەوەی كاتێ كەسەكان گوێی بۆ دەگرن و سەیری كلیپەكان دەكەن ڕاستەوخۆ كاریگەری لەسەر دڵ و دەروونیان دروست دەكات و دڵیان ڕەق دەكات بەرامبەر قورئان و نوێژ و پەرستشەكان بەشێوەیەكی گشتی .

وە ئەو كلیپانەی كە پەخش دەكرێ پڕیەتی لە بەدڕەوشتی و پڕیەتی لە سەما و هەڵپەڕكێ و ڕەش بەڵك و هەندێ جاریش گرتەی سێكسی و خواردنەوەی مەی (ئارەق) و خۆشەویستی ناشەرعی و خیانەت و ...تاد، كە ئەمانە جگە لەزیان گەیاندن و كات بەفیڕۆدان و بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی لەكۆمەڵگەدا هیچیتر نییە.

وە هەروەها ووشەكانی گۆرانیەكە پڕیەتی لە ووشەی خیانەت و هەندێ جار بەدڕەوشتی ، وە هەندێ گۆرانی گەر ووشەكانی بخەیتە سەر پەڕەیەك واللە شەرم دەكەی بیخوێنیتەوە لەبەر بێمانایی و بێهێزی ووشەكانی .

## چوارەم: ئەو کەناڵانەی تایبەتن بە منداڵان:

ئەو جۆرە کەناڵانەش چەند کاریگەریەکی نەرێنی بەهێزیان هەیە لەسەر منداڵان:

**یەکەم:** ئەو جۆرە ئەفلام کارتۆنانەی پەخش دەکرێت هەمووی پێکهاتووە لە گۆرانی و مۆسیقا و سەما ، ئەو جۆرەیان وا لەمنداڵەکە دەکات هەر لەتەمەنێکی کەمەوە لاسایی و سەما و گۆرانی و چەپڵەلێدان فێربێت لەجیاتی فێربوونی زانستی شەرعی.

**دووەم** : ئەو ئافرەتانەی لەناو فیلم کارتۆنەکانن و ڕۆڵی دایك دەگێڕن بەشێکی زۆریان لاشەیان ڕووتە، بەسەیر کردنی ئەو دیمەنانەش منداڵەکان ڕادێن لەسەر بینینی لاشەی ڕووت و لەگەڵ ڕووتیدا گەشە دەکەن و گەورەدەبن و لەگەڵ ڕووتی پەروەردە دەبن و لەگەڵی ڕادێن،کاتێ ئەو منداڵە پێدەگات ڕووتی دەبێتە شتێکی ئاسایی لەلای لەناو ماڵ و خێزاندا بێ ئەوەی هیچ بەرپرچ دانەوەیەکی هەبێ یان لەناخەوە ئەو منداڵە حەز بە خۆداپۆشین و پۆشتەیی دەوروبەر بکات. واتە فیترەتی دەشێوێنن و لە مرۆڤ بوون دووری دەخەنەوە . وەهەندێکی تر لەو ئەفلامانە ڕۆمانسیەتی تێدایە، ئەمەش وادەکات بیر لەڕۆمانسیەت بکاتەوە.

منداڵ هەیە لەپۆلی یەکی بنەڕەتیەوە پەیوەندی خۆشەویستی درووست کردووە نمونەشمان زۆر زۆرن .

**سێیەم:** ئەو جۆرە ئەفلامانە پەخش دەکەن کە وا لەمنداڵەکە دەکات بیر و باوەڕی بشێوێ بەرامبەر دینەکەی و کۆمەڵێ شوبهەی بۆ دروست دەکەن تا لەداهاتوودا ببێتە کەسێکی سەرسەخت بەرامبەر ئیسلام و کوفرکردن و بێ ئەدەبی بەرامبەر دینی لا ئاسایی دەبێ.

یەکێ لەنمونەکان: هەندێ ئەفلام کارتۆن هەن باسی جادوو دەکات،وەجادوو بەشێوەیەکی جوان نیشانی بینەر دەدات، ئەمەش وادەکات بیرکردنەوە منداڵ پێچەوانەی ئاینەکەی هەنگاو بنێ و جادوو لە مێشك و دەروونی جێگیر بێ و لەگەڵی گەورەبێ و هەوڵی بەدەست هێنانی سیحر و جادووبدات.

**چوارەم** : ئەوجۆرە ئەفلامانە پەخش دەکەن کە بەراز ڕۆڵی دادپەروەری دەگێڕێ یان وەکو ڕزگار کەر ڕۆڵ دەبینێ ، ئەمەش مەترسی زۆرە بۆسەر مێشك و دڵ و دەروونی منداڵەکە لەبەر ئەوەی ئەو منداڵە ڕادێ لەگەڵ خۆشویستنی بەراز و بە پاڵەوان سەیری دەکات ، لەبەرامبەریشدا پەروەردگاری جیهان حەرامی کردووە لێرە جارێکی تر منداڵ بیروباوەڕێکی خراپی بۆ دروست دەبێ و لەداهاتوو دەبێتە کەسێکی سەرسەخت و بێدین پەروەردگار پەنامان بدا .

**پێنجەم** : ئەو جۆرە ئەفلامانە پەخش دەکەن کە ئاڵای داوێن پیسی تێدایە چۆن؟

منداڵەکانم بەدیار ئەفلام کارتۆنێکەوە دانیشتبوون،منیش کتێبم دەخوێندەوە کوڕە چوار ساڵانەکەم گوتی : بابەگیان کڵاوێکی وەکو ئەو منداڵەم بۆ دەکڕی؟ زۆر جوانە حەزم لێیە

منیش سەیری کڵاوەکەم کرد بینیم کڵاوێکی ڕەنگاو ڕەنگە، کەمێ زیاتر لێی وورد بوومەوە بینیم ئەو کڵاوە ئاڵای هاوڕەگەزبازەکانە[1]،منیش ڕووم لەمنداڵەکەم کرد گوتم کوڕم هی جوانتر لەوەت بۆ دەکڕم ئەوە جوان نیە با تەلەفزیۆنەکە بخەینە سەر کەناڵێکی تر بزانین کڵاوی جوانتر نیشان نادا؟

بەوشێوازە دوورم خستەوە لەوکەناڵە و حەزەکەیم بە شتێکی باشتر و شەرعی تر بۆ پڕ کردەوە

بەڵێ ئەوان ئاوان منداڵەکەت فێردەکەن تا ئاڵای هاوڕەگەزبازەکانی خۆشبوێ و لەسەر سەری دابنێ .

ئەرێ بەڕاست ئێمە لەکوێ خەوتووین ؟ ئەی نابێ منداڵەکانمان فێری ئەوە بکەین تا قورئان لەسەر سەریان دابنین و عەقیدەیەکی پاکیش لە دڵیان ؟

---

[1] تێبینی :ئاڵای هاوڕەگەزبازەکان ٦ ڕەنگە و بەناوی Rainbow بەکوردی واتا هەسارە زێڕینەیان پەلکە زێڕینە

## پێنجەم : ئەوکەناڵانەی تایبەتن بە وەرزش :

وەرزش بەشێوەیەکی گشتی بینەر و هەوادارێکی زۆری هەیە، ئەو کەناڵانەی لێرە کە تایبەتن بە وەرزش بینەرێکی زۆری لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە، وە کەناڵە وەرزشیەکانیش بێبەش نینە لە بڵاو کردنەوەی بەدڕەوشتی و لاوازکردنی دینی خەڵکی ... چۆن ؟؟

ئەگەر باسی تۆپی پێی پیاوان بکەین: باوکم ئامادەیە کاتژمێر دووی شەو هەڵسێتەوە و خەو لەخۆی حەرام بکات و نزیکەی دوو کاتژمێر بەدیار یاری تۆپی پێ دابنیشێ، بەڵام لەژیانیدا شەوێکی "ليلة القدر" ی زیندوو نەکردۆتەوە و خەوی لەخۆی تێکنەداوە .

جگە لەوە گەنجانێکی زۆر لەسەر یانە و یاریزانەکان شەڕ دەکەن و ئازاری یەکتر دەدەن، بەڵام ئامادە نینە شەڕ بۆ دینەکەیان بکەن، وە زۆر جاریش قومار لەسەر یاریەکان دەکرێت.

وە هەروەها جگە لە یاری پیاوان زۆر جار یاری ئافرەتانیش دەگوازنەوە ، جا تۆپی پێ بێ یان باسکە یان تۆپی سەلە یان تێنس یان هەر جۆرە یاریەکی تر، وە ئەو ئافرەتانە بێگومان بەلاشەیەکی نیمچە ڕووتەوە بەشداری یارییەکان دەکەن، وە هەندێ جاریش زیاتر لە سێ بەشیان ڕووتە واتە تەنها ( ستیان و مایەیەکیان لەبەرە)، وە ئەو ئافرەتانەی جوانیەکی جیاوازتریان هەیە لەوانی تر زیاتر سەرنجی پیاوان بۆخۆیان ڕادەکێشن و شوێنەواری خراپ لەسەر دڵ و دەروونی پیاوان جێدەهێڵن.

جگە لەوە زۆرجار بەهۆی ئالوودەبوون بەیاریەکانەوە بەتایبەت ئەوانەی یاریزانن توشی گێچەڵی سێکسی دەبنەوە جا ئەو یاریزانانە پیاو بن یان ئافرەت .
یاریزانێکی پیاو لە یەکێ لە بەرنامەکان باسی ژیانی خۆی دەکات دەڵێ : من حەزێکی زۆر زۆرم بۆ تۆپی پێ هەیە هەر لەتەمەنێکی بچوکەوە ئالوودەی تۆپی پێ بووم و دەستم بەیاریکردن کرد
ئەوەبوو لەیانەیەکی باش و دیار وەرگیرام، ئەوکات تەمەنم پانزە ساڵێك دەبوو،گەنجێکی جوان بووم یاریزانێکی باشیش بووم.
دەڵێ ڕۆژێکیان لەلایەن بەرپرسی یانەکەمان کە پۆستی تری حکومیشی هەبوو بانگ کرام،منیش چووم هەندێ قسە و شتی لەگەڵ کردم،ئەوەبوو چەند جارێك قسەی لەگەڵ کردم تا کار گەیشتە ئەوەی هەڕەشەی لێکردم لەسەر ئەوەی گەر خۆم نەدەمەدەست بۆ تێرکردنی حەزەکانی لەیانەکە دەرم دەکات یان لێناگەڕێ یاری بکەم و دەبێ لەسەر کورسی یەدەگ دابنیشم.
ئەو یاریزانە دەڵێ : منیش لەبەر حەزی زۆرم بۆ تۆپی پئەو یاریزانە دەڵێ : منیش لەبەر حەزی زۆرم بۆ تۆپی ڕازیبووم ئەوکارەم لەگەڵدا بکات.
وای لێهات ئەوڕۆژانەی دەچووم بۆ ڕاهێنان زووتر من دەبوایە بچم تا ئەو کارەم لەگەڵدا بکات ،وە هەندێ جار پێش یاریەکان و هەندێ جار دوای یاریەکان ئەو کارەی لەگەڵ دەکردم لەکاتێکدا کاتێ تەمەنم کەمێ هەڵکشا خێزانم پێکهێنا و بوومە خاوەن منداڵیش.

ئەم کارەی نێوانمان دە ساڵێکی خایاند، ئێستا چەند ساڵێکە وازم هێناوە لە وەرزش و ئەوکارە پیسە،ئەو بەرپرسە ئێستا تەلەفۆنم لەسەر هەڵناگرێ بەهەموو هێزم دەمەوێ تۆڵەی لێبکەمەوە بەڵام ناتوانم .

ناتوانم لای باوك و براکانم باسی بکەم،دەست بۆ دادگا دەبەم دڵنیام دادگا پشتی ئەو دەگرێ نەك من کەواتە دادگاش ناتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ بۆیە ئێستا دەروون و نەفسێکی شەکەت و ماندووم هەیە لەڕووم نایە بێمە دەرەوە نازانم چ ڕێگەیەك بگرمە بەر تا بتوانم تۆڵەی خۆمی لێبکەمەوە

گوتی : بەپارە هیچی لەگەڵ من پێنەدەکرا ئەو لەڕێگەی ئەوشتە بۆم هات کە حەزم لێی بوو ئەوشتەش یاری کردن بوو لە یانە باش و دیارەکان و هەڵبژاردەی ووڵات.

گوتی: ئەو ئەو شتانەی پێدەبەخشیم و ئاسانکاری بۆ دەکردم لەبەرامبەردا ئەوەی لەمنی دەویست نێربازی بوو کە لەگەڵی دەکردم زۆربەی کاتەکان.

گوتی: ئێستا بەردەوام خۆم لە ژوورێ حەشار دەدەم و ڕووم نیە بێمە ناو خەڵك و کۆمەڵگا، وە شەرم دەکەم باوکم و منداڵم هەیە ، منداڵاکان ڕۆژێ ئەو شتانە بزانن دەبێ چۆن سەیرم بکەن ؟

هاوژینەکەم چۆن سەیرم دەکات ؟

دایك و باوك ؟

خوشك و برا؟

خزم و کەس ؟ چی وەڵامی پەروەردگار بدەمەوە ؟ لەکاتێکدا بۆیاریکردن پیسترین و قێزەونترین سنوورم شکاند؟

## شەشەم : ڕێکلامەکان :

تیڤیەکان بەشێوەیەکی گشتی ڕێکلامەکان پەخش دەکەن بۆ دەستکەوتنی بڕێك پارە، وە لەناو ڕێکلامەکانیشدا ئافرەتی سەرنج ڕاکێش و جوان دێنن بۆ ئەوەی ڕێکلام بۆ کاڵاکان بکات، کاتێك پیاوان سەیری ڕێکلامەکان دەکەن لەجیاتی ئەوەی کاڵاکان و خواردن و خواردەمەنیەکان سەرنجی پیاوان ڕابکێشن ئافرەتەکە زیاتر سەرنجیان ڕادەکێشێ، لەجیاتی ئەوەی پیاوان حەزیان بچێتە کڕینی کاڵاکان و خواردن و خواردەمەنیەکان حەزیان دەچێتە ئافرەتەکە حەز دەکەن دەستیان پێی بگات و لەگەڵی جووتبن . بۆ خانمانیش بەهەمان شێوە.

دەتوانین بڵێین بەشێوەیەکی گشتی تیڤیەکان بەدوای جوانیەوەن، ئافرەتانێ دێننە سەرشاشەکان کە جوانیەکی سەرنج ڕاکێشیان هەیە و سەرنجی پیاوان بۆخۆیان ڕادەکێشن.

ڕۆژێکیان لەلای دەرهێنەرێك بووم گووتی : ئێمە دەبێ ئەو ئافرەتانە بەژداری پێبکەین کە جوان و سەرنج ڕاکێشن و ئەو ئافرەتانەی کە پیاوان حەز بەجووتبوون بکەن لەگەڵیان بەوشێوەیە کارەکانی ئێمەش سەرکەوتنی گەورە بەدەست دێنێ و بینەرێکی زۆری لێ کۆدەبێتەوە ، وە بۆ پیاوانیش بەهەمان شێوە تا سەرنجی ئافرەتان ڕابکێشن و ببنەبینەری ئەو گرتە ڤیدیۆیانەی کە پەخشیان دەکەین.

ئەوانەی کە باس کران دەکرێ هەموویان بەشیوازێکی تەندروست بەکاربهێنرێ و کۆمەڵگە سوودی لێببینێ،وە دەشکرێ بۆ لەناوبردنی کۆمەڵگە و بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی بەکاربهێنرێ .

## حەوتەم: کەناڵەکانی خێزانی

ئەمەیان مەترسی زۆر زۆرە لەسەر خێزان و بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی لەبەر ئەوەی کەسانێکی دەروون نەخۆش و بێ ئاست و هیچ نەدی و بێ ئەزموون دێننە سەر تیڤیەکانیان و هەرچی نەخۆشی و دەرد و ژەهری بەدڕەوشتی هەیە لەدڵ و مێشکی ئامادەبوان و بینەر و بیسەر دەنێن.

**لێرەدا باسی چوارڕێگە دەکەین ...**

**ڕێگای یەکەم** : هەندێ جار لەڕێگەی بانگخوازانەوە ئەو بەرنامەیە جێبەجێ دەکەن بۆیە دەبێ بانگخوازان زۆر ووریاتر بن و فێڵیان لێنەکرێ و بەکار نەهێنرێن و نەبنە هۆکاری گەمژەکردنی خەڵک

**چۆن؟**

دوای ئەوەی بانگخوازێك بانگ دەکەن هەندێ پرسیاری دینی و کۆمەڵایەتی لێدەکەن بە ئامادەبوونی پێشکەشکارێکی ئافرەتی بێ بەرگ و کۆمەڵێ گەنجی کوڕ و کچ و تێکەڵاو کردنیان لەماوەیەکی کورت کاتەکەی تەواو دەکەن و بەڕێی دەکەن، تا لەڕێگەی ئەو بانگخوازەوە بڵێن ئێمەش موسڵمانین و کەسانی بانگخواز دێنین

کاتێ بانگخوازەکە ڕۆیشت ئەوجا ژەهرەکە دەڕێژن، گۆرانی بێژێکی ئافرەت یان پیاو دێنن ناوێکی گەورەی لێدەنێن پێی دەڵێن { هونەرمەند } ، هیچ لەهونەریش نازانێ گۆرانی پێدەڵێن و ئامادەبوان کچ و کوڕان دەست بەچەپڵە و هەڵپەڕین و هات و هاوار دەکەن بەوشێوازە ئامادەبووان هیچ شەرمێکیان نامێنێ لەگەڵ

یەکتر و قسە و یەکتر ناسین و تەلەفۆن و شت دێتە پێش دواتر کارەساتەکە ڕوودەدات ئەمەش جگە لە بینەر و بیسەر کە کاریگەری زۆر بەهێز لەسەر ئەوانیش دروست دەکات و ئەوانیش هەمان شت دووبارەدەکەنەوە .

برایەك گوتی: لە تیڤیەك بووین بانگخوازێکی بەڕێز داوەت کرابوو پێشکەش کارەکە لەچکێکی دابوو بەسەریدا تا ماوەی دیاریکراوی بانگخوازەکە تەواو بوو و ڕۆیشت.

دوای ئەوە پێشکەشکارەکە لەچکی فڕێدا و بانگی گۆرانی بێژی داوەت کراوی کرد و بووە چەپڵەلێدان و هەڵپەڕین و تێکەڵاوی کاتێ ڕووناکی ناو ستۆدیۆ نەدەما کوڕەکان دەستیان بۆ کچەکەکان دەبرد،کچەکانیش بێدەنگ دەبوون لەبەر ئەوەی خۆیان بە کەسی ئازاد و ڕۆشنبیر دەبینی و وایان دەزانی ڕۆشنبیری لەو بێڕەوشتیەیە.

بەڵێ جگە لەوەی کچەکان بێدەنگ دەبوون بەشێکیان ژمارەی مۆبایلیان دەگۆڕیەوە،هاوڕێیەکم ژمارەی دابە کچێکیان دوای ماوەیەك قسە و باس لەگەڵی توشی زینابوو و کچەکەی کردە ژن واتە پەردەی کچێنی لادا .

ئێستا کێشەکی زۆر گەورە دروست بووە لەنێوان ئەو دوو خێزانە و هاوڕێکەم دەڵێ ئەو کچە بێئەخلاقە و نامەوێ ، ماڵی کچەش هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکەن تا ئەو ساتەی قسەکانم دەکەم کێشەکە گەورەتر بووە و چارەسەر نەبووە و هاوڕێکەشم ئێستا خۆی وون کردووە .

بەڵێ ئەوە ڕاستیەکی تاڵە و بەچەندانی تر توشی هەمان کێشەبوون کە ئێستا هەندێکیان بیرلەخۆکوشتن و هەندێکیان لەژێر زەوی و هەندێکی تریان بەدوای

چارەیەکە تا لەو دەردە ڕزگاری بێ هەندێکی تر بێهوایی خواردوویەتی و چاوەڕوانی کوشتن دەکا لەلایەن نزیکەکانی و چەندین و چەندینی تر ...

## ڕێگای دووەم : هێنانی مرۆڤی بوکەڵە ...

وەکو بەناو { ئافرەتە مۆدێلەکان }
ئافرەتە مۆدێلەکان کێن ؟
بەشێوەیەکی گشتی ئەوانە کۆمەڵە ئافرەتانێکی تەڵاق دراون،نەخشێنراون بە نەشتەرگەری ، هەر ڕۆژە و بوکەڵەی دەستی سەرمایەدار و بەرپرسێکن
ئەو ئافرەتانە جگە لەسمتێکی دەستکرد (صناعی) و لێوی سلیکۆن و ڕوومەتێکی پڕکراوە لە سلیکۆن و سنگێکی دەرپەڕیو و ڕووت و لاشەیەکی ڕووت هیچ مواسەفاتێکیان نیە،نە { ڕۆشنبیر ، نە شاعیر ، نەدەنگێکی خۆش ، نە ئەدەب و مەعریفە، نەدین، نەڕەوشت ،نە پڕۆژە و کارێك،نە ...تاد } هیچان نیە
جا ئەو ئافرەتانە دێنن سمت و سنگ و دەم و چاوە سلیکۆناویەکانیان بە بینەر نیشاندەدەن و لەناو کۆمەڵگا گەورەیان دەکەن و دەیان کەنە باس و خواس و خەڵکێکی زۆر زۆریان پێ سەرقاڵ دەکەن .
جا ئەم ئافرەتە تەڵاق دراوانە دێننە سەرشاشەو پرسیاری سوك و بێ مانایان لێ دەکەن، وەك دەڵێن : تۆ پەشیمان نیت لە پیاوەکەت جیا بوویتەوە؟
ئەویش دەڵێ : نا بەخۆشحاڵیەوە ئێستا زۆر دڵخۆشم کە جیابوومەتەوە و ئێستا هەست بە ئازادی دەکەم.
تیڤیەکان وا بەخەڵکی نیشاندەدەن کە جیابوونەوە و بەڕەڵایی ئاساییە و ئازادی لەوەدایە،تۆ هەرکات ویستت خۆشەویستی بکەی و هاوسەرگیری بکەیت و دواتریش کە تاقەتت نەما جیابیتەوە ، ئێستا جیابوونەوەیان لای

خەڵکی کردۆتە شتێکی هێندەئاسایی کە بەئازادی ناوی دەبەن، ئەو ئازادیەی ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن بریتیە لە بەڕەڵاییەکی ڕەها .
وەهەروەها ژنە بەناو مۆدێلەکان کاتێکیش دێنە سەر شاشەکان نە تەمەنیان هی ئەوەیە باسی خۆیان بکەن کە لەڕابردوو ژیاون نە بۆ داهاتووش بەرنامەیان هەیە، بە هەزاران هەزار بەناو موسڵمانیش بەدیاریانەوە دادەنیشن و ئەو کاتە بەنرخەی تەمەنیان بەدیارئەو دۆڕاو و نەخۆشانە بەفیڕۆ دەدەن، جا سەیرەکە لەوەدایە ئەو  مۆدێلانە بەشەو نخونی ساڵێك لە سفرەوە دەبنە بازرگان و خاوەن کۆمپانیا و براندی خۆیان،گەنجە غەریبە فریودراوەکەش دوای چەندین ساڵ کارکردن بەشەو و ڕۆژ ناتوانێ کەمێ پارە کۆبکاتەوە و کەمێ هەناسەی پاکی پێ بکڕێ تا سینگەپڕ ژەهر کراویەکەی لەبەدڕەوشتی کەمێ پێ پاك بکاتەوە، ناتوانێ خێزان پێک بهێنێ تاکە ڕێگەش بۆ ڕژاندنی ژەهری جەستەی زینا دەبێ و ئەویش دەست پێدەکات.
کارە مەترسیدارەکەش لێرە دا ئەوەیە،چەندین کچی تر دەست لەخوێندن و ئەخلاقیان هەڵدەگرن ، ئەوانیش دێن و کار لەسەر جەستەیان دەکەن تا ببنە مۆدێل و لەماوەیەکی کورتدا دەوڵەمەند ببن، بێ ئاگا لەوەی هەنگاو نان بۆ ئەو جۆرەکارە هەنگاونانە بۆ دۆزەخێك کە دەرچوون لێی زۆر ئەستەمە.

**ڕێگای سێیەم** : داوەتکردنی ئافرەتانێکی نیمچە ڕووت کە قسە لەسەر دین و پەروەدە و ڕەوشت و ئازادی خەڵك دەکەن،لەکاتێکدا ئەو ئافرەتانە نە دین و نەڕەوشت و نە پەروەردەیان هەیە و نە ئازادیشن .

**ڕێگای چوارەم : پەخش کردنی دراما ...**

ئافرەتانێکی سەرنج ڕاکێش و نە شارەزا لەڕەوشت و پەروەردە،لەژێر ناوی دراما و باسی کۆمەڵایەتی دێنن ڕۆڵیان پێدەگێڕن، جا سەیرەکە لێرەدا کامە ئافرەتی سفوور و ڕووتە باشترین ڕۆڵی پێدەدەن تا خەڵکی ڕابێنن لەسەر ئەوەی ڕووتی بێ ئەخلاقی نیە لەوەش سەیرتر بینەر دەزانێ ئەو ئافرەتەی کە ڕۆڵ دەگێڕێ زیناکەر و داوێن پیسە ئەوجا بەدیاریەوە دادەنیشێ لەگەڵ منداڵەکانی سەیری دەکەن لەوەش سەیرتر ئەوەیە  ئەو ئافرەتە داوێن پیسە لەڕێگەی ئەوڕۆڵەی پێی دراوە ئامۆژگاری پیاوان و ئافرەتان و منداڵان دەکەن وەك ئەوەی پیاو و ئافرەتی بەڕەوشت نەمابێ بۆ بڵاو کردنەوەی ئامۆژگاری لەو ڕێگەیەوەش وا دەکەن منداڵ و پیاو و ئافرەت ئەو بەدڕەوشتانەیان خۆشبوێ و ئەو دەروون پیسانە دەکەنە دەمڕاست و گەورەی کۆمەڵگا،لەم ڕێگایەوەش تێکڕای ئەندامانی خێزان پەلکێش دەکەن بەرەو بەدڕەوشتی ...

**بەگشتی :**

دەتوانین بڵێین ئەوجۆرە فیلم و ئەفلامانە نەك لەگەڵ کەلتوری ئێمە بەڵکو لەگەڵ کەلتوری خۆشیان یەك ناگرێتەوە زۆرجار لە وڵاتانی خۆشیان دەرهێنەر و ئەکتەرەکان ڕەخنەی توندیان لێ دەگیرێ لەسەر ئەنجام دان و دەرهێنانی ئەو جۆرەفیلمانە، چ جای ئەوەی لێرە دەرخواردی ئەو میللەتەی بدەن .

پێویستە زیاتر هۆشیار بین .

## دووەم هۆکاری داوێن پیسی:

### سەیرکردنی ئافرەتی نا مەحرەم و تێکەڵاوی خێزان :

لەکۆمەڵگەی ئێمەدا عورف و عادەت زاڵ بووە بەسەر دین، بۆیە تێکەڵاوییەکی زۆر هەیە لە نێوان پیاوان و ئافرەتان بەگشتی، جا ئەو تێکەڵاوییەش لە کۆڕ و مەجلیسەکان بێ یان لە دەرچوون و سەیرانەکان یا لە مارەکردن و گواستنەوەکان بێ یان هەر بۆنەیەکی تربێ، بەگشتی تێکەڵاوی هەیە.
ئەم تێکەڵاوییەش لێکەوتەی جیاوازی لێدەکەوێتەوە و زۆربەی جارەکانیش کێشەی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە.

### شێوازەکانی تێکەڵاوی ...

### یەکەم : تێکەڵاوی بێگانە :

ئەم جۆرە تێکەڵاوییە بەهۆی خزمایەتیەوە دەبێت ، بەهۆی ئەو عادەتەی لەنێو ئێمەدا زاڵە زۆربەی جارەکان ئەم تێکەڵاویە هەیە لەنێو خێزانەکاندا، وە لەگەڵ ئەم تێکەڵبوونەش بەریەککەوتن لەنێوان ئافرەتان و پیاوانی نامەحرەمدا ڕوودەدات جا ئەو بەریەککەوتنەش قسەکردن بێ یان سەیری

یەکترکردن بێ یان دەست پێککەوتن بێ یان هەرشتێکی عادەتی بێ، ئەم بەریەککەوتنانەش زۆر جار کێشەی کۆمەڵایەتی و دوژمن داری لێدەکەوێتەوە.

وەستایەك لە خانووی خزمێکیان ئیشی دەکرد،کاتی نانخواردن وەستاکە و ماڵی خاوەن خانووەکە بەیەکەوە لەسەر سفرەی نانخواردن کۆدەبوونەوە، ئەو شێوازە تێکەڵیە ماوەیەك بەردەوام بوو، ڕۆژێکیان گوێم لێبوو گوتیان: وەستاکە ئیشەکەی بەتەواو نەکراوی جێهێشتووە و هەڵهاتووە، منیش سەیرم بەو شتەهات کە بۆچی دەبێ هەڵهاتبێ؟!! ...

دوای ماوەیەك کەسێکی نزیکم گوتی: ئەو وەستایە کە دەچووە ماڵی ئەو خزمەیان بۆ نان خواردن چاوی لە سەیرکردنی خێزانی پیاوەکە نەپاراستبوو، تا شەیتان ئەو ئافرەتەی لەلا جوان کردووەو خستۆتیە دڵی ئەو وەستایە، بەهۆی ئەوەوە وەستاکە خۆی لەو ئافرەتە نزیك دەکاتەوە و ئافرەتەکەش بێئاگابوە لە نیاز و مەبەستی ئەو وەستایە و هەروەکو خزمێکی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا کردووە.

ڕۆژێکیان وەستاکە کەمێك زووتر پێش کرێکارەکانی و پێش خاوەن ماڵ دەچێتە ماڵەکە و بە کرێکارەکان ڕادەگەیەنێ کە پێویستی بەسەر ئاوە و کەمێك زووتر بەڕێ دەکەوێ .

کاتێك دەچێتە ماڵەکە و لەدەرگا دەدات، ئافرەتەکە دەرگای لێدەکاتەوە و فەرمووی لێدەکا بۆ ژوورەوە، وە ئەو ڕۆژە ئافرەتەکەش زیاتر لەڕۆژەکانی تر جوانی خۆی دەرخستووە، وەستاکەش دەڕوا تا دەگاتە دیوەخان و ئافرەتەکەش لە مەتبەخ خەریکی نان ئامادەکردن دەبێ، وەستاکە کەدەبینێ

منداڵە گەورەكان لە كۆڵانن و بچووكەكانیش لە ژوورێكی تر یاری دەكەن شەیتان زۆری بۆ دێنێ و ئارامی لێهەڵدەستێ و دەچێتە مەتبەخ و بەخێراییەكی زۆر و كۆنترۆڵ نەكراو ئافرەتەكە لەباوەشی خۆی دەنێ و ماچی دەكا و دەیەوێ دەست درێژی بكاتە سەری، بەڵام ئافرەتەكە بەوە ڕازی نابێ و هاواردەكا و دەنگی بەرز دەكاتەوە تا لە كۆڵان گوێ بیستی دەنگی دەبن .

وەستاكە بەڕاكردن دەڕوا و ئیشەكەی و پێداویستییەكانی ئیش و حەیا و شەرەفی جێدێڵێ و هەڵدێ، دوای ماوەیەك خۆحەشاردان وەستاكە و ماڵی خاوەن ئیش لەسەر بڕەپارەیەك پێكدێن و وەستاكە هەرچی هەبوو خانوو سەیارە و پارە هەمووی دانا، سەرباری ئەوەش قەرزێكی زۆری كرد بۆ ئەوەی ئەو ئابڕووچوونەی لەكۆڵ بێتەوە.

ئێستا ئەو وەستایە لەگەڵ خێزان و منداڵەكانی لەخانووی كرێ دادەژین و خێریان پێدەچێ، جگە لەوەش كاتێ منداڵەكانی ئەو وەستایە گەورەبوون دەبێ چۆن لەباوكیان بڕوانن ؟؟!!.

تاكە هۆكاری ئەو هەموو كێشە و دەردەسەری و ئابڕوو چوونە تەنها یەك شت بوو، تێكەڵاوی و سەیركردنی ئافرەتی نامەحرەم و دەرخستنی جوانی ئافرەتەكە بۆ جگە لەمێردەكەی خۆی.

پێویستە موسڵمان چاو پارێز و خۆپارێز بێ بۆ ئەوەی دووربێ لە ئابڕوو چوونی خۆی و خەڵكی تر و دووربێ لەو كارە پیس و قێزەونە ،ئەو خۆپارێزییەش تەنها لەڕێگەی قورئانەوە دەبێ و پەروەردگارمان فەرمان بە نێردراوەكەی دەكات و دەفەرموێ : { قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ

أَزْكَىٰ لَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ () وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ }[1]

واتە : ئەی محمد ﷺ بە پیاوانی باوەڕداران بڵێ: با چاوی خۆیان بپارێزن لە تێڕوانینی حەرام (چونکە زینای چاو بریتییە لە تێڕوانینی حەرام) وە دامێنی خۆیان بپارێزن لە زینا، وە لەوەی کە کەس نەیبینێت ئەمە بۆ دڵ و دەرون و دینیان پاکترە (ئەوەی چاوی بپارێزێت لە تێڕوانینی حەرام خوای گەورە رووناکی بە بینایی دەبەخشێت و دڵی پاراو دەکات، وە تێڕوانینی حەرام تیرێکی ژەهراویە بۆ دڵ) بەڕاستی خوای گەورە زۆر زانیارەکی وردی هەیە بەو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی ئەدەن.

ئەی محمد ﷺ بە ئافرەتانی باوەڕدارانیش بڵێ: با چاوی خۆیان بپۆشن لە تێڕوانینی پیاوانی نامەحرەم وە با دامێنی خۆیان بپارێزن لە زینا، وە لەوەی کە کەس نەیبینێت {دەرنەختنی جوانی ئافرەت}

وە با جوانی خۆیان، یان بازن و گوارەو ملوانکەو خەڵخاڵ و خشڵی خۆیان دەرنەخەن تەنها ئەوە نەبێ کە خۆی دەرکەوتووە، ئەوەی دەرکەوتووە خیلافی

---

[1] - النور. (٣٠-٣١)

لەسەرە (ئیبنو مەسعود) ڕەزای الله ی لەسەربێ دەفەرموێت: مەبەست پێی جلوبەرگە، (ئیبنو عەبباس) ڕەزای اللهی لەسەربێ دەفەرموێت: مەبەست پێی دەموچاو و هەردوو دەستە وە با پێچەکانیان یان لەچکەکانیان شۆڕبێتەوەو بیدەن بەسەر سینگیاندا و نەبینرێت، (عائیشە) ڕەزای اللهی لەسەربێ دەفەرموێت: ڕەحمەتی خوا لە ئافرەتانی کۆچکەر بێت کە ئەم ئایەتە دابەزی کراسەکانیان دڕاندو خۆیان پێ داپۆشی (با پێچەوانەی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی بکەن چونکە ئەوان سەرو مل و سینگیان دەردەخست، خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئافرەتانی باوەڕدار بە خۆداپۆشینیان و خۆ نەچواندنیان بە ئافرەتانی بێباوەڕ، کەواتە سفوری و خۆدانەپۆشین پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی و دواکەوتوویی بووە نەك خۆداپۆشین و باڵاپۆشی)

**{دەرخستنی جوانی ئافرەت بۆ کێ دروستە؟}**

وە با جوانی خۆیان دەرنەخەن تەنها بۆ مێردەکانی خۆیان نەبێ یان بۆ باوکیان نەبێت یان بۆ باوکی مێردەکانیان (غەزوریان) نەبێت یان بۆ کوڕەکانی خۆیان یان کوڕی کوڕیان یان کوڕی مێردیان یان بۆ برایان یان بۆ برازایان یان بۆ خوشکەزایان (کوڕی خوشکیان) ئەمانە مەحرەمن یاخود ئەو ئافرەتانەی کە خزمەتیان ئەکەن لە ماڵەوە، یان بۆ ئافرەتی موسڵمان یاخود ئەو کەنیزەکانەی کە هەیانە یاخود ئەوانەی کە تابیعی ماڵەوەن وەکو خزمەتکارو کرێکارو ئەوانە کە عەقڵیان سوکەو کاریان بە ئافرەت نیەو ئارەزوویان ناکەن یاخود منداڵێك کە هێشتا منداڵەو عەورەتی ئافرەت نابینێ واتە بالغ نەبووەو ئاوڕ بەلای ئەو

شتانەدا ناداتەوەو نایزانێت و عەقڵی پێ ناشکێت وە با پێیان نەدەن بە زەویداو ئەوەی کە شاردوویانەتەوە لە دەنگی خەڵخاڵەکەیان یان دەنگی پێڵاوەکەیان با دەرنەکەوێت و سەرەنجی پیاو ڕانەکێشن، وە بۆن لەخۆدانیش دەگرێتەوە لە کاتی چوونە دەرەوە لەماڵ (کە ئافرەتانی سەردەمی نەفامی وابوونەو پیشەی ئەوان بووە) وە ئێوە هەر هەمووتان ئەی باوەڕداران تەوبە بکەن و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوە بەڵکو سەرکەوتوو و سەرفراز بن (ئەم رەوشت و ئاکارە جوانانە پەیڕەو بکەن و واز لە رەوشتی سەردەمی نەفامی بێنن).

وە هەروەها پێغەمبەری خوداش ﷺ سەیرکردنی ئەفرەتانی قەدەغە کردووە، ئەوەتا بە ئامۆزاکەی علی رەزای اللّٰەی لەسەر بێ دەفەرموێ: **(يَا عَلِيُّ، لَا تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ ؛ فَإِنَّ لَكَ الْأُولَى، وَلَيْسَتْ لَكَ الْآخِرَةُ )**[١]

واتە: ئەی علی سەیرکردنی ئافرەتان لەدوای یەك دووبارە مەکەوە تەنیا یەکەمجارت بۆ هەیە دووەمجارت بۆ نییە.

کەواتە پیاو و ئافرەت دەبێ ڕەچاوی ئەو فەرمانەی خوابکەن و جێبەجێی بکەن، لەبەر ئەوەی سەیرکردنی زۆر و دووبارە وە جوانی و خۆ دەرخستنی ئافرەت بۆ جگە لە پیاوەکەی دەرگای فیتنە و دەرگای تووشبوون بە داوێن پیسی والادەکات و ڕێگە بۆ شەیتانی نەفرین لێکراو خۆش دەکات تاکو لەو ڕێگەیەوە مەبەستەکەی خۆی بپێکێ و کەسەکان بە هیلاك بەرێ و بەدڕەوشتی و فەسادییەکی زۆر بلاوبکاتەوە.

---

[١]- سنن الترمذي حكم حديث حسن

## دووەم: تێکەڵاوی یەك خێزان بەشێوەیەکی هەڕەمەکی ...

ئەم جۆرە تێکەڵاوییە لەناو یەك خێزاندا ڕوودەدات،بۆنمونە: چەند برایەك لەیەك خانوودا دەژین کە هەندێکیان خێزاندارن و هەندێکیشیان سەڵتن (سینگڵن)، ئەم جۆرە تێکەڵاوییە هەندێ جار زۆر مەترسیدارە، لەبەر ئەوەی ژیانی هەموویان لەیەك خانووە و بەردەوام ژیانیان لەیەك شوێن بەسەر دەبەن و ئیش و کار و خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵ یەکە و لەسەر یەك سفرەیە، وە بەرکەوتن لەنێوان کەسەکان زیاتر و زۆرترە بەهۆی نزیکیان لە یەکترەوە، وە بەهۆی بچوکی شوێنی نیشتەجێبوونیشیان زۆرجار داوێن پیسی لەنێوان ئەندامانی ئەو خێزانە ڕوودەدات، بۆ نمونە داوێن پیسی لەنێوان براژن و برایەکی پیاوەکەی.

ڕەنگە کەسانێك وابیر بکەنەوە بڵێن کێ لەگەڵ براژنی خۆی زینا دەکا ؟!!،

کێ ئامادەیە خیانەت لە برا و باوك و دایکی بکات ؟؟!!.

خۆزگە شتی وا نەدەبوو خۆزگە کەس خیانەتی لەبرا و دایك و باوکی نەکردبا، بەڵام داخی گرانم ئەوەشتێکی ڕاستیە و ڕووی داوەو زیاتریش ڕوودەدات.

گوتی : لەکۆڵانی پشت ئێمە ماڵێك هەبوون، دایك و باوکیك و دوو برا لەو خانووەدا دەژیان، یەکێك لەبراکان خاوەن خێزان بوو و منداڵیشی هەبوو،بەڵام ئەوەی تریان خەریکی خوێندن بوو خێزاندار نەبوو و هاوڕێشم بوو لە قوتابخانە.

گوتی : ئەو هاوڕێیەم ئێستا لەدەرەوەی وولاتە، ڕۆژێکیان بە تەلەفۆن بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە و گووتی: برایەکەم کە خێزانی هەبوو بەیانیان زوو لەگەڵ باوکم لەخەو هەڵدەستان و دایکم و خێزانەکەشی هەڵدەستاندن و ئەوانیش نانیان بۆ ئامادە دەکردن و دواتر بۆ ئیش و بژێوی ژیان دەچوونە دەرەوە، منیش دەچوومە ژووری برا گەورەکەم لەقاتی سەرەوەی خانووەکە بۆ خوێندن لەبەر ئەوەی لەخوارێ منداڵەکان دەنگە دەنگیان دەکرد و بێزاریان دەکردم.

گوتی: ڕۆژێکیان خەریکی خوێندن بووم براژنەکەم هاتە ژوورەکەی بۆ ئەوەی جلە پیسەکەی دابکەنێ و جلێکی تری خاوێن بپۆشێ، کاتێك هاتە ژوورەوە گوێی نەدا بەمن و یەکسەر جلەکەی سەرەوەی لەبەر چاوی من داکەند و بەلاشەیەکی نیمچە ڕووت بینیم، کاتێك ئەو دیمەنەم بینی سەرسام بووم !! چ دیمەنێك ؟!! براژنەکەم بە جلی ژێرەوە !!.

کە ئەو دیمەنەم بینی شێت و شەیدای براژنم بووم، تاوای لێهات بەیانیان زوو هەڵدەستام و دەچوومە سەربان پێش ئەوەی براکەم لەخەو هەڵسێ، ئەمەش بۆ ئەوەی کاتێك براکەم هەڵدەستا و دەچووە خوارەوە من لە کەلێنێکی دەرگاوە بەدزییەوە سەیری براژنم بکەم بۆ ئەوەی لاشەی بە نیمچە ڕووتی ببینم لەسەرجێگای نوستنی،چەند ڕۆژێك بەمشێوەیە بەردەوام بووم و بەدزیەوە سەیرم دەکرد، تا براژنەکەم بەتەواوی هەستی کرد من بەیانیان زوو لەبەر بینینی ئەو دەچمە سەربان و بەدزیەوە سەیری دەکەم بۆ ئەوەی لاشەی بە نیمچەڕووتی ببینم.

ئەوەبوو بەیانییەك براكەم ڕۆیی و چووە خوارێ براژنەكەم كەبینی من سەیری دەكەم كەمێك سنگی خۆی بە ئەنقەست بەدەرخست، من زیاتر شەیدای بووم و ئارامم بۆی نەما .

هەمان ڕۆژ پێش نیوەڕۆ هاتە سەربان و سەیرێكی كردم و پێكەنی و گووتی : لەكەینێوە فێربووی بەدزیەوە سەیرم دەكەی ؟ لەگەڵ ئەو قسانەدا دەرگای ژوورەكەی داخست، منیش هیچ قسەیەكم بۆ نەهات و بەبێدەنگیەوە سەیرم دەكرد و كەمێكیش ترسام نەوەكو لای باوك و براكەم باسی من بكات، بەڵام ئەوەی چاوەڕێم نەدەكرد ڕوویدا.

براژنەكەم پێی گوتم : حەز دەكەی بە جلی ژێرەوە بمبینی ؟؟

كە ئەو قسانەی كرد بێدەنگی و سەرسامی باڵی بەسەرمندا كێشا، لەناكاو جلی سەرەوەی داكەند و لێم نزیك بویەوە، كەمێك بەرامبەرم دانیشت و سەیری چاوەكانمی كرد منیش بەهەمان شێوە سەیرم كرد، ئەوكات من تەنها دووكەسم لەژوورەكە دەبینی من و براژنەكەم، بەڵام لەڕاستیدا سێ كەس بووین كە ئەویش شەیتان بوو، بەڵێ دەستی هێنا و دەستم بۆی برد تا ئەوەی نەدەبوا ڕووبدا ڕوویدا...

ماوەیەك ئەو ڕەفتارە پیسە لەنێوانمان بەردەوامبوو، تا ڕۆژێكیان براكەم زوو گەڕایەوە بۆ كارێكی بەپەلە و هاتە سەربان،ئەو كاتەی كە هایە ژوورێ من براژنەكەمم بە نیمچە ڕووتی لەباوەش بوو .

براکەم شۆك بوو منیش شۆك بووم، لەناکاو براژنەکەم پاڵێکی پێوەنام و جنێوی پێدام وەك ئەوەی من دەستدرێژیم کردبێتە سەری و ئەویش بەرگری لەخۆی بکات.

براکەم بۆم هات و لێیدام و سوێندی خوارد کە دەمکوژێ، منیش بەزەحمەت خۆم لەبەردەستی ڕزگار کرد و ڕامکردە خوارێ و لەماڵ هاتمە دەرێ و بەبێ وەستان شارم جێهێشت و ڕوومکردە وولاتێکی ئەوروپی،وە منداڵە بچووکەکەی ئێستای لەمنە و براگەورەکەم پێی گووتووم بێیتەوە دەتکوژم بۆیە من هەرگیز بیر لەگەڕانەوە ناکەمەوە.

ئەو برایە دەڵێ : ئێستا ساڵێك بەسەر ئەو گفتوگۆیەی ئێمە تێپەڕیووە،ئەوە دواجار بوو کە قسەم لەگەڵی کرد.

منیش پرسیارم دەربارەی ماڵ و حاڵی باوك و براکەی کرد، ئەوەی بۆی گێڕامەوە گووتی : براکەی خێزانەکەی تەڵاق داوە و باوکی جەڵدە لێی داو وەفاتی کرد، وە منداڵی ئەو دوو داوێن پیسەش ئێستا لەلای دایکی ئەو کوڕەیە و منداڵەکەش نازانێ دایك و باوکی خۆی کێیە !!.

## له ئیسلام دا...

گەورەتین جۆری زینا ئەو زینایەیە کە لەگەڵ دراوسێی یان لەگەڵ ئافرەتێکی مێرد دار یان خزم و کەسی خۆی یان هاوڕێیەکی یان لەکات و لەشوێنێکی پیرۆزبێ و ... تاد، وە هەرکەسێکیش ئەو کارەی ئەنجامدا ئەوە بێگومان سزاکەی مردنە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:- **( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ " مَنْ وَقَعَ عَلَى ذَاتِ مَحْرَمٍ فَاقْتُلُوهُ. )**[1].

واتە:- هەر کەسێك زینای لەگەڵ مەحرەمێکی خۆیداکرد بیکوژن.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ ئاگادارمان دەکاتەوە کە بەتەنها لەگەڵ ئافرەت لەیەك شوێن کۆ نەبینەوە،

وەك دەفەرموێ:- **(لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ)**[2]

واتە: هیچ پیاو و ئافرەتێك بەتەنها کۆنابنەوە ئیلا شەیتان دەبێتە سێیەمیان.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریمان دەکات کە بەهیچ شێوەیەك پیاو بەتەنها لەگەڵ ئافرەتان کۆنەبنەوە وە بەتایبەتیش لەگەڵ براژندا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆ بوونەوە لەگەڵ براژن بەتەنها بەمردن ناودەبات،

وەك دەفەرموێ: **( أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ : " إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ ". فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ ؟ قَالَ : " الْحَمْوُ الْمَوْتُ)**[3].

---

[1] - ئیبن ماجه

[2] - الترمذي حكم حديث صحيح

[3] - البخارى - سنن الترمذي حكم حديث صحيح

واتە: ئاگاداربن بەتەنها نەچنە لای ئافرەتان، پیاوێك لە ئەنساریەكان گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر لەگەڵ براژنیشت بی بەتەنها، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەگەڵ براژن بەتەنها بوون مردنە.

ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوا ﷺ فێری ئەو پەڕی خۆ پاراستنمان دەكەن لە هەر هێرشێكی شەیتانە جن و ئینسەكان .

## سێ یەم: تەوقەکردنی ئافرەت و پیاوی نا مەحرەم...

**بەڕاستی** فیتنەیەکی گەورەی بەدواوەیە...
بێگومان تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەت دا بەهیچ شێوەیەك ڕێگە پێدراو نییە و حەرامە، ئەگەر مەحرەمی خۆی نەبێت.
چی ڕوودەدات کاتێك پیاو و ئافرەتێك تەوقە لەگەڵ یەکتر دەکەن ؟!.
زانست سەلماندوویەتی کە ملیۆنان خەلایە ( هەستەوەر ) لەسەر پێستی مرۆڤ هەن،کە ئەم هەستەوەرانە ئیشیان گواستنەوەی ئەو شتانەیە بۆ مێشك کە بەر پێستی کەسەکە دەکەون،بۆیە کاتێ پیاو تەوقە لەگەڵ ئافرەتێك دەکات کە مەحرەمی خۆی نەبێ، ئەو کاتە مێشك هەڵدەستێ بە شیکردنەوەی ئەوەی کە بەر پێستی خاوەنەکەی کەوتووە، کاتێ ئەم کردارە( تەوقەکردن ) دووبارە دەبێتەوە ئەوا مێشك هەڵدەستێ بە خەزن کردنی ئەو دەستە و ئەو پێستەی بەری کەوتووە، بەشێوەیەك کە هەست و سۆزی هەردووکیان دەجوڵێ و زۆرکات بیر لەوە دەکاتەوە کە دەستی بەر دەستی کەسێك کەوتووە و تەوقەی لەگەڵ کەسێك کردووە و زۆر ئەستەمە لەبیری بکات، ئەمەش بەهۆی بوونی غەریزەی جنسی لە هەردوو ڕەگەز ، تادەگات بە کاری فەسادی و داوێن پیسی و خراپە.

پیاوێك گوتی: من خاوەن خێزانم و منداڵیشم هەیە، جاران کەدەچوومە ماڵی دایك و باوکی خێزانەکەم (ماڵی خەزورم)، لەپێش دەرگاوە دەستم بە

تەوقەکردن دەکرد لەگەڵ (پیاو و لە ئافرەت) تا دەگەشتمە ژووریَ و دادەنیشتم، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە خۆم بەکەسێکی کراوەو تێگەیشتوو دەزانی.

ماڵی خەزورم کچێکیان لەماڵەوە مابوو مێردی نەکردبوو کە تەمەنی ١٨ ساڵان بوو، نێوانی من و ئەویش زۆر خۆش بوو و بەردەوام گاڵتە و قسەی پەند ئامێزمان لەگەڵیەکدا دەکرد .

کاتێ دادەنیشتم زۆرجار دەهاتە تەنیشتەمن و لەلام دادەنیشت، ماڵی خەزوورم هەموو دەیانزانی من چەندە ئەو کچەم خۆشدەویَ و ئەویش بەهەمان شێوە کە خۆشەویستیەکی بە حساب خوشك و برایانە بوو.

ڕۆژێکیان لەماڵی خەزوورم دانیشتبووم و خەریکی مۆبایل بووم، لەناکاو ئەو کچە هات و لە تەنیشتم دانیشت و بەگاڵتەوە دەستی خستە سەر ڕانم و سەری هێنایە پێش مۆبایلەکەم، منیش مۆبایلەکەم لیَ دیار نەما لەبەر ئەو، بۆیە کە ویستم لای بدەم لەسەر ڕانم و پێش مۆبایلەکەم دەستم بەر سنگی کەوت، ئەویش پێکەنی و هیچ قسەیەکی نەکرد .

ڕۆژێکیان لەناو ئۆتۆمبێل بووم تەلەفۆنێکم بۆ هات، منیش وەڵامم داوە خوشکی خێزانەکەم بوو، دوای ئەوەی لە ئەحواڵی یەکترمان پرسی، گووتی: لەکوێی حەز دەکەم بتبینم، منیش گووتم فڵانە شوێن بەڵام بۆچی دەتەویَ بمبینی خۆ هیچ نەبووە ؟ ، گوتی نەخێر هیچ نەبووە وەرەو باکەس نەزانیَ.

منیش گووتم: باشە لەکوێی؟ ، گوتی: لەقوتابخانەم وەرە پێش قوتابخانە، منیش قوتابخانەکەی ئەوم دەزانی لەبەر ئەوەی چەند جارێك بردبوومە قوتابخانە.

کە گەیشتمە بەردەم قوتابخانەکە ئەو لە پێش قوتابخانە وەستابوو چاوەڕێی منی دەکرد، منیش ئۆتۆمبێلەکەم ڕاگرت و ئەویش سەرکەت و لەپێشەوە لە تەنیشت منەوە دانیشت و گوتی: بڕۆ،منیش دەستم بەڕۆشتن کرد .

دوای کەمێك ڕۆیشتن گوتم: هیچ بووە ؟ بۆچی قوتابخانەت جێهێشت؟، ئەویش گوتی: هیچ نەبووە تەنها زۆر بیرم دەکردی و حەزم کرد کەمێك بەیەکەوە بین و لە قوتابخانەش مۆڵەتم وەرگرت و پێم گووتن نەخۆشم و بێتاقەتم .

منیش گوتم: باشە دەتبەمە ماڵی خۆمان و کەمێك لەگەڵ خوشکەکەشت بە بەڵکو بێتاقەتییەکەت نامێنێ و دواتریش تەلەفۆن بۆ باوکت دەکەم کە تۆ لەماڵی ئێمەی، لەناو ئەو قسانەدا دەستی گرتم و گوتی: مەچووە ماڵی خۆتان بڕۆ شوێنێکی تر، منیش گوتم: بچمە کوێ ؟،گوتی : هەرشوێنێك بێ تەنها چۆڵ بێ و کەس نەمان بینێ تەنها خۆم و خۆت بین .

ئەو پیاوە دەڵێ: کە گووتی تەنها خۆم و خۆت یەکسەر لەمەبەستی گەیشتم ، منیش مۆبایلەکەم دەرهێنا و تەلەفۆنێکم بۆ خێزانەکەم کرد و گووتم : بڕۆ ماڵی باوکم بزانە هیچیان پێویست نییە؟؟. خێزانەکەشم گوتی باشە وادەڕۆم .

دوای ئەوەی چوینە ماڵەوە و چووینە ژوورێ یەکسەر باوەشێکی توندی پێداکردم و گوتی خۆشم دەوێی، منیش ئەوم لەباوەش گرت و ماچم کرد، کاتێ

ویستم جلەکانی لەبەر داکەنم بەرگری کرد و ناڕەزایی دەربڕی بەڵام من سووربووم لەسەر ئەوە و ڕازیم کرد تا جلەکانی لابەرێ و منیش لامدا ...
کاتێ کە خەریکی داوێن پیسی بووم لەگەڵ خوشکی خێزانەکەم، لەناکاو قیژەیەك لە پشتم هات کە ئاوڕم دایەوە خێزانەکەم بوو، خێزانەکەم دوای قیژاندنەکەی کەوت و لەهۆش خۆی چوو .
لێرەدا من پرسیارێکم بۆ دروست بوو ، بەپیاوەکەم گووت : خێزانەکەت چووە ماڵی باوکت بۆچی وا بەخێرایی گەڕایەوە و کاتێ هاتەوە ماڵ چۆن هەستت پێ نەکرد ؟.
گوتی: لەبەر ئەوەی ماڵی باوکم نزیکی ماڵی ئێمەن کاتێ خێزانەکەم چووبوو لەماڵ نەبوون، ئەویش گەڕابۆوە ماڵێ، لەبەر ئەوە ئاگام لەهاتنەوەی ئەو نەبوو لەبەر ئەوەی من لەڕێگەی کۆمەوە خەریکی داوێن پیسی بووم و خوشکی خێزانەکەشم ئازاری زۆری هەبوو بەشێوەیەك بوو ئازارەکەی دەگریا و جارجارەش کەمێك دەیقیژاند بۆیە گوێم لەهیچ نەبوو.
گوتم : باشە دوای ئەوە چی ڕوویدا ؟
گوتی : بەپەلە خوشکی خێزانەکەم بردەوە ماڵی خۆیان و پێم گووت : هیچ شتێك باس نەکەی و کەمێکیش هەڕەشەم لێی کرد ئەویش ترسا و بێدەنگی هەڵبژارد.
دوای ئەوە تا درەنگانی شەو نە چوومەوە ماڵێ، کاتێ چوومەوە منداڵەکانم نوستبوون، خێزانەکەشم بەخەبەربوو و جێگای منیشی لەژوورێکی تر

ڕاخستبوو، کەسەیرێکیم کرد زۆر بێتاقەت بووم، ڕەنگی نەمابوو، دەنگی نەبوو، پەشۆکاو و سەرسامی باڵی بەسەریدا کێشابوو.

خێزانەکەم لەبەر منداڵەکان و خوشکەکەی و ئابڕووی دایك و باوکی ئەوەی بینی بووی ناشتی و بێدەنگی هەڵبژارد، چ بێدەنگییەك !!!!،

دووساڵە گوێم لەدەنگی نەبووە، ئێستا...ئەو جلە ڕەنگاو ڕەنگەکان ناپۆشێ،ئەو بەردەوام جلێکی سپی دەپۆشێ ، من دەزانم ئەو جلە کفنە و لاشەی پێ دادەپۆشێ، بەڵام هێشتا لەسەر زەویە و خاك داوای نەکردووە، کاتێ منداڵەکان بەباوکە بانگم دەکەن شەرم دەکەم و قێز لەخۆم دەکەمەوە کە من پیاو و باوکی ئەو ماڵەم. ئێستا ئێمە خێزانێکی هەڵوەشاوەین بەڵام لەیەك خانوودا.

دواتر من پرسیاری خوشکی خێزانەکەیم لێکرد،ئەویش گوتی: تەنها دوای هەفتەیەك خوشکەکەی شوی کرد و ماڵی باوکی جێهێشت، وە لەو کاتەوەی ئەو ئیشە پیسە ڕووی داوە ئەوانە یەکتریان نەبینیوە، خێزانەکەم ئەو کاتە دەچێتەوە ماڵی باوکی کە خوشکەکەی لەوێ نەبێ ، ئەو هەمووە خۆشی و پێکەنینەی نێوان خۆی و خوشکەکەی لەناوچوو، وە تاکە هۆکاری هەموو ئەو دەردە ناخۆشانە لە تەوقەکردنێکەوە دەستیان پێکردو بەداوێن پیسی کۆتایی هات، وە بیرکردنەوەکانیشم منی گەیاندە ئەوڕۆژەی کە خێزانەکەم بەڕووخاوی ببینم ، دوور بوونم لەدین و ناتێگەیشتوویم لەدین بەوڕۆژەی گەیاندم.

بەڵێ بەڕێزان ئەوە بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەی ناو ئەو کۆمەڵگایەیە، بۆ ئەوەی ئێمە خۆمان بپارێزین لەو دەردە کوشندە و پیسە با شوێن کەوتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بین، باوەکو ئەو ژیان بکەین و شوێن ئیسلام و فەرمانەکانی خوا بکەوین.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتاندا ئاگادارمان دەکاتەوە دەفەرموێ: **( إنِّي لا أُصافِعُ النِّساءَ.)**

واتە: من تەوقە لەگەڵ ئافرەت دا ناکەم.

وە دایە عائیشە ( ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت :-

**(مَا مَسَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ إِلَّا أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا، فَإِذَا أَخَذَ عَلَيْهَا فَأَعْطَتْهُ، قَالَ: " اذْهَبِي فَقَدْ بَايَعْتُكِ)**[1] .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەت دەستی لە دەستی ئافرەت نەداوە و پەیمانیشی لێیان وەرنەگرت تەنها بەقسە نەبێت.

تۆ بڵێی ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ تەوقەی لەگەڵ ئافرەتان بکردایە دڵی بۆئەوان لێی بدایە؟، بێگومان نەخێر لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناخی شۆرابۆوە لە پیسی و ناشرینیەکان شەیتان هەرگیز نەیدەتوانی بچێتەلای و زەفەری پێببا، بەڵام ئەوە ئاگادار کردنەوەیەکی مەترسیدارە بۆ ئێمە تا ئاگاداری خۆمان بین و ئابڕووی خۆمان و خەڵکیش لەکەدار نەکەین، وەهەروەها ئەو دوعایەی بۆ جێهێشتووین بۆ خۆپاراستنمان لەهەرشتێکی نەشیاو و ناشایستە.دوعاکەی: **( اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي، وَمِنْ شَرِّ بَصَرِي،**

---

[1] - مسند الإمام أحمد

**وَمِنْ شَرِّ لِسَانِي، وَمِنْ شَرِّ قَلْبِي، وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي)**[1] واتە: خودایە پەنات پێدەگرم لەشەڕی گوێیەکانم، وە لەشەڕی چاوەکانم،و لەشەڕی زمانم و لەشەڕی دڵم.

وە لە ڕیوایەتێکیتردادەفەرموێ : **( اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى )**[2] واتە: ئەی خودایە داوای هیدایەت و خۆپارێزی و داوێن پاکی و دەوڵەمەندیت لێدەکەم.

---

[1] - صحيح مسلم

[2] - مسلم

## هۆکاری سێ یەمی داوێن پیسی:

## پۆرنۆگرافی...

کورتە باسێکی زانستی لەسەر پۆڕن ( فیلمی ڕووت )...
مانایەکی کورتی پۆرنۆگرافیا ...
واتای وشەی پۆرنۆگرافی: وشەی پۆرن بۆ یەکەم جار لە ساڵی( ١٨٥٧)دا بەکار هێنراوە پۆرنۆگرافی بە لاتینی ″ pornographia ″ کە کورت کراوەکەی porn ە .
پۆڕن بە واتای داوێن پیس ( قەحپە ) دێت و وشەکە تایبەتە بە نزمترین چینی سۆزانییەکان و تەنیا بۆ ئەوان بەکارهاتووە.
لەسەر ئاستی وشە و چەمك "ئاندریا دورکین فێمینیستی ڕادیکاڵ"، لەڕووی ڕەچەڵەکناسی و ڕەگناسییەوە بەمجۆرە پێناسەی پۆرنۆگرافیا دەکات: وشەی پۆرنۆگرافیا لە دوو وشەی یۆنانی پۆڕن و گرافۆس  پێکدێت کە بە واتای ( نوسین لەمەڕ داوێن پیسەکان) پێکهاتووە و وشەی گرافۆس بە مانای نوسین و هەڵکۆڵین یان وێنەکردن دێت.
پۆڕنۆگرافی بە واتای بە ئاشکرا وێنەکردن و پیشاندانی ژنانە وەك قەحبەی بێنرخ. لە یۆنانی کۆندا تەنیا قەحبەکان بوون کە بێنرخ بوون.
مێژووی پۆڕنۆگرافی (سێکس)...
پۆرنۆ گرافی مێژوویەکی دێرینی هەیە، شارستانیەتەکان بە شێوازی جیاواز ڕێگایەکیان دۆزیوەتەوە بۆ تۆمارکردنی پۆرن، دەتوانرێت بکرێت بە چەند

قۆناغێك مێژووی پۆرنۆگرافی ئەوانیش : هەڵکۆڵین و داتاشین لەسەر بەرد و دیواری ئەشکەوتەکان ودروست کردنی پەیکەر و پاشان وێنە کێشان لەسەر دیوار و کاغەز و دواتر چاپەمەنی و پاشان فۆتۆگرافی دواتر بۆ سینەما و فیلیم دەرهێنان و دواتر دامەزراندنی گۆڤاری پلەی بۆی کە بووە هۆی کرانەوەی دەرگایەکی گەورە بە ڕووی بوارەکەدا و پاشان ئامێرەکانی VCR و پاشان کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت کە پۆرنۆگرافیان بردووەتە لوتکەی بازرگانیەکان وە لە ئیستادا زیاتر هەوڵ دەدرێت بۆ کردنەوە و دروست کردنی چەندین جۆری تری تەکنەلۆجیا بۆ زیاتر گەشەدان بە بوارەکە .

مێژووی پۆرنۆگرافی ئاشکرا و ڕوون نییە بەڵام لەلایەن لێکۆڵەرەوانەوە مێژووی پۆرنۆگرافی بە( ٣٠٠٠٠) ساڵ مەزەندە دەکەن، یەکێك لە بەڵگەکانی مێژووی ئەم بوارە پەیکەری " ڤینۆس ویڵندۆرف " بە کۆنترین جەستەی ڕوتی پیشاندراو دادەنرێت کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سالانی نێوان (٢٥٠٠٠) بۆ( ٢٨٠٠٠) ساڵ پێش زاین کە لە ساڵی( ١٩٠٨) دۆزراوەتەوە لە نەمسا .

لە سالانی دواتریشدا چەندین پەیکەری تری هاوشێوە دۆزراونەتەوە ، بەڵام بە تەواوی نەسەلمێنراوە ئایا ئەم پەیکەرە بۆ بواری جنسی بەکار هێنراوە یاخود نا !، ڕۆمانەکان و میصریيەکان و یۆنانیەکان و وڵاتانی ئاسیا و ئەوروپا بێ بەش نەبون لەم بوارەدا ، لە میصر پارچەیەکی دێرینی بە دەست دروست کراوی تێدا دۆزرایەوە لە سەدەی نۆزدەدا کە ناونراوە بە ( گۆڤاری پیاوان ) نەخشێنراوێکی جنسیە لەسەر کاغەزی پاپیرۆس .

پاپیرۆس: جۆرە کاغەزێکە کە میصریە کۆنەکان دروستیان کردووەو بەکاریان هێناوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی( ١٢٩٢ – ١٠٥٧ ) ی پێش زاین .

یۆنانیە کۆنەکانیش زۆرتر وێنەی جنسیان لەسەر سیرامیك کێشاوە و چەندەها پەیکەری ڕووتیان دروست کردووە ، هونەری یۆنانی برێکی زۆر لە چالاکی ڕەگەزێتی تێدا بووە و ئێستاش چەندین پاشماوەی ئەو بوارە ماوە ، بەڵام ناتوانرێت هەموویان بخرێتە ناو بازنەی پۆرنۆگرافی.

وە کاتێك ئامێری چاپەمەنی لە ساڵی ( ١٤٤٠) لە ڕۆژ ئاوا لە لایەن زانای ئەڵمانی (یۆهانس گۆتنبێرگ )ەوە داهێنرا ، ئەوا بە خێرایی پۆرن ماڵیکی بۆ خۆی دۆزیەوە لە بڵاوکراوە چاپکراوەکاندا .

لە ساڵی (١٥٢٤) دا یەکەم کتێبی وروژێنەری پۆرنی بلاو کرایەوە کە لە ١٦ حاڵەتی جنسی پێکهاتبوو دواتر پاپا کلیمێنتی حەوتەم ڕایمۆندی نوسەر و وێنەکێشی کتێبەکەی دەستگیر کرد و خستیە زیندانەوە ، دوای ئازاد کردنی ڕایمۆندی وێنە کێشی ئیتاڵی دوبارە کتێبێکی تری دانا لە ساڵی (١٥٢٧) ئەم جارەیان لەگەڵ وێنەدا چیرۆکی جنسی باس کردبوو دوبارە لەلایەن پاپاوە بڕیاری دەستگیر کردنی بۆ دەرچوو ئەم جاریش کتێبەکەی قەدەغە کرا و هەمووی کۆکرایەوەو لە ناو برا زۆر بە ئەستەم توانراوە چەند بەشێکی کتێبەکە بە دەست بهێنرێتەوە پاش( ٤٠٠ )ساڵ .

لە ساڵی( ١٧٤٨ ) دا جۆن کلیلاند ڕۆمانی ” Memoirs of a Woman of Pleasure “ میمۆیرس ئۆف ئە ومەن ئۆف پلێشەر ی نوسی کە دواتر بە فانی هێڵ ناسرابوو .

بەڵام دەست کەوتنی ئەم کتێبە زۆر ئاسان نەبوو وە پاش بڵاو کردنەوەی هەر یەك لە جۆن کلیلاندی نوسەر لەگەڵ بڵاوکەرەوەی سەرەکی کتێبەکە دەستگیرکران و خرانە زیندانەوە ، بە پێی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەی ” بۆستن گلۆب ” ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبانەی زۆرترین دژایەتی کراو و قەدەغەکراوەکان لە مێژوودا . کتێبەکە تا ساڵی( ١٩٦٦ ) بە نهێنی و شاراوەی مایەوە تا ئەو کاتە دووبارە کتێبەکە کەوتەوە بازاڕ و قەدەغە کردنی نەما.

کاتێك لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا لە بیستەکانی سەدەی نۆزدەدا وێنەی فۆتۆگرافی بەرهەم هێنرا ئەوا وێنەی ڕوت ( پۆرن ) خواستێکی زۆری لەسەر بوو .

وڵاتی فەرەنسا بەهۆی ئەوەی حکومەتەکەی زۆر ڕێگری نەدەکرد لە ئەنجامدانی ئەم کارە ئەوا بەخێرای پاریس بووە بنکەیەکی گەورەی بواری وێنەی پۆرن (ڕووت) ، کاتێك لە ساڵی( ١٨٤٨ )دا لە پاریس تەنها ١٣ ستیۆدیۆی وێنەگرتن هەبوو بەڵام تا ساڵی( ١٨٦٠ ) ژمارەکە زیادی کرد بۆ( ٤٠٠) ستۆدیۆ ، کە زۆربەیان سودیان لە فرۆشتنی وێنەی ڕووت دەبینی ، وێنەکان زیاتر لە وێستگەی شەمەندەفەر و ڕێگای گەشت کردنەکان و لەسەر شەقامەکان دەفرۆشران ئەمەش وای کرد ببێتە کارێکی نێودەوڵەتی و بگوازرێتەوە بۆ ئینگلتەرا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، ئەم کارە بە

شێوەیەك فراوان بوو کە چەندەها کەس بوونە ساماندار بەسەرییەوە و بووە بازرگانێکی فراوان .
پاش ئەوەی فۆتۆگرافی جێگایەکی فراوانی تەرخان کردبوو بە بواری پۆرن ئەوا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا گۆڤاری پۆرنی هاتە ئاراوە بۆ یەکەم جار لە فەرەنسادا سەری هەڵدا .
گۆڤاری جنسیش لەناو کۆمەڵگادا بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاو بویەوە و دواتر گۆڤارەکان جگە لە وێنەی ئافرەتان وێنەی پیاوان و منداڵیان دادەنا و خواستێکی زۆریان لەسەر بوو .
گۆڤاری منداڵان بۆ کاری جنسی لە نێر و مێ وە گۆڤاری هاوڕەگەز بازی و ..هتد، بڵاو دەکرایەوە و بە تەواوی جنس ڕۆشتبووە ناو قوڵای خەڵکەوە بەم شێوەیە گۆڤارەکان تا ئێستاش بەردەوامن لە کارکردن و بڵاوکردنەوەی وێنەی بەدڕەوشتی لە جیهاندا کە ئێستا چەندەها گۆڤاری بە ناوبانگی ئەو بوارە هەیە.
پاش ماوەیەکی کەم لە داهێنانی وێنەی جوڵاو ، ئەوا پۆرن جێگەی خۆی کردەوە تێیدا هاوشێوەی داهێنانەکانی تر . یەکەم فیلمیش لەساڵی( ١٨٩٦) دا بەرهەم هێنرا ئەم بابەتەش بە بەردەوامی هات و لەگەڵ گەشەکردنی ئامێر و تەکنەلۆجیاکان ئەوا بەرهەم هێنانی فیلمی بەدڕەوشتی زیاتر پەرەی دەسەند و چەندین کۆمپانیای تایبەت بەو بوارە دامەزرا و بازرگانیەکە زۆر فراوان بوو لەگەڵ ئەوەی لە سەرەتادا حکومەتی وڵاتەکان لە ڕێگەی یاساوە ڕێگریان لێ دەکردن و دەستگیریان دەکردن بەڵام دواتر ئازاد کران و هیچ ئابلۆقەیەك لەسەر دەرهێنەر و بەرهەم هێنەرانی فیلم و گۆڤار ..هتد نەما .

پۆرنۆگرافیا بە جۆرێك گەشەی کرد بووە یەکێك لە بازرگانیە گەورەکانی جیهان . پاش ئەوەی لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو ئامێرەکانی VCR هاتنە ئاراوەو توانرا کامێرای پێشکەوتو تر بەرهەم بهێنرێت ئەوا پۆرنۆگرافی زیاتر گەشەی کرد ، سیدی و دیڤیدی ..هتد، بوونە هۆی ئاسانتر بڵاوکردنەوەی فیلمی ڕووت .

کاتێك هێڵی ئینتەرنێت بە تەواوی خرایە بەر دەست ئەوا پۆرنۆگرافی کەوتە لوتکە بەهۆی ئەوەی دەتوانرێت زۆر بە ئاسانی فیلمەکان بڵاوبکرێنەوە .

لە ئیستاشدا چەندەها ئامێری زیرەك و پێشکەوتوو هاتوونەتە ئاراوە کە بواری گواستنەوەی فیلم و وێنەی پۆرنیان زۆر ئاسان کردووە ، بەم شیوەیە پۆرنۆگرافی دەتوانرێت بوترێت لە شەستەکانەوە تا ئیستا بە سەردەمی بڵاوبونەوەو بە دەست هێنانی قازانج و گەورەکردنی بازرگانیەکە دادەنرێت .

## ئـێستا ...

لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و کرانەوەی کۆمەڵگاکان بە کلتوری تەکنەلۆژیا، جیهان گۆڕانکاری گەورەی بەخۆیەوەدی و ئاسانکاری زۆر بۆ مرۆڤەکان هاتە بەردەست.

ئەمڕۆ مرۆڤ چەندین ئامرازی بەدەستەوەیە،تا لەژیانی ڕۆژانە و کارە پێویستییەکانی سوودی لێوەربگرێت و بتوانێ بە ئاسانترین شێوە گەورەترین کار ئەنجام بدات یان بەکەمترین کات کارەکانی جێبەجێ بکات کە ئەمەش کاتێکی زۆری بۆ دەگێڕێتەوە.

لەگەڵ ئەو هەموو سوودە زۆرەی کە تەکنەلۆژیا هەیەتی بەڵام لەبەرامبەردا زیانی گەورەشی هەیە بۆ کۆمەڵگاکان بەتایبەتی ئەگەر ڕۆشنبیرییەکی باش نەبێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ تەکنەلۆژیادا.

لێرەدا بابەتێکی زۆر شاراوە و مەترسیدار دەخەینەڕوو ئەویش سەیرکردنی فیلمی پۆڕنە کە ئێستا خەڵکێکی زۆری ئاڵوودەکردووەو بەشێکی زۆری خەڵك پێیەوە سەرقاڵن ، وە ئەوەش شتێکی مەترسیدارە بۆسەر تاکەکان لەبەر ئەوەی سەرقاڵ بوون بەو جۆرە فیلم و گرتە سێکسیانە وا لەکەسەکە دەکات کە هیچ کارێکی بەرهەم دار نەکات و زۆربەی کاتەکانی بەدیار سەیرکردنی ئەوجۆرە فیلمانە بەسەر ببات و بەگۆشەگیری ژیان بباتەسەر و لە کۆمەڵگایەکی تەندروست دایدەبڕێ و دەیباتە دونیایەکی خەیاڵاوی و پڕ لەهەوەس و شەهوەت بازی، کە ئەو جۆرە ڕەفتارانە و بەردەوامبوون لەسەری لە هەندێك نێوەندی زانستیدا بە {ئالوودەبوون} ناودەبرێ و هەندێکی دیکەش بە { کێشە خولقێن} پێناسەی دەکەن.

وە هەروەها جۆرناڵی Behavior Therapy لە راپۆرتێکی زانستیدا دەڵێ خووگرتن بە تەماشاکردنی پۆڕن دەبێتە هۆی "خەمۆکی، دابڕانی کۆمەڵایەتی، لە دەستانی کار و کەمبوونەوەی بەرهەمداریی کەسەکە".

وە ئەم جۆرە ئاڵوودەبوونەش هۆکاری گەورەیە بۆ شکست پێهێنانی گەنجان و لاوان تا نەتوانن بەشێوەیەکی ئاسایی و لێهاتوانە ژیان بکەن و لەیاسای ڕاستەقینەی ژیانیان لایان دەدەن، وە کاتێکی زۆریش لە سەیرکەرانی دەکوژێ

وە دووریان دەخاتەوە لەخوێندن و پێشکەوتنی ژیان و ئاستی بەرپرسیارێتیان کەم دەکاتەوە بەرامبەر بە خێزان و کۆمەڵگەکەی .

وە لەگەڵ بونی زیاتر لە ـ ٧٥ ـ ملیۆن پۆڕن لە جیهاندا و زۆر بەخێرایش گەشەدەکات..

وە هەروەها گەیشتوە بە جیهانی موسوڵمانان کە بووەتە هۆی لەناوبردنی خێزان و کۆمەڵگاکان نەك تەنها کە ئاڵوودەی پۆڕن کێشەیەکی تەندروستیە بەڵکو لێکۆڵینەوە نوێیەکان ئەوەیان دەرخستووە کەدەبێتە هۆی وێرانکردنی مێشك.

ئەو پەتایە مەترسییەکەی زۆر لەوە گەورەترە کە بیری لێدەکرێتەوە: زانکۆی مۆنتریال هەڵسا بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەك لەسەر فیلمی ( پۆڕن ) بۆ زانینی کاردانەوەی ئەو کەسەی کە بۆ یەکەم جار سەیری ( پۆڕن) دەکەن بۆیە پێویستیان بە پیاوێك بوو بۆ ئەوەی توێژینەوەی لەسەر ئەنجام بدەن سەیر لەوە دابوو پرۆژەکە ڕاگیرا چونکە هیچ پیاوێکیان نەدۆزیەوە سەری ( پۆڕنی ) نەکردبێ.

ئەم حاڵەتەش خەڵکێکی زۆری بەگشتی گرتۆتەوە مەترسییەکەی زۆر لەوە گەورەترە کە بیری لێدەکرێتەوە یان پشتگوێ بخرێ .

ئەم بابەتە بۆ بەرچاوو ڕوونیە لە مەترسیەکانی سەیرکردنی پۆڕن بۆ ئەو کەسانەی کە ئاڵودەی نەبوونە بەو دیاردەیە، وە ووشیار کردنەوەی ئەو کەسانەشە کەدەیانەوێ تووش ببن وە چارەسەریشە بۆ تووشبوان بەم دەردە

و پەتا پیسە ، کە ئێستا لەناو موسڵمانان ئەو جۆرە خوە هەیە و بینەری فیلمەپۆڕنەکان زۆر زۆرن بەتایبەت لەنێو چینی هەرزەکار و گەنجەکان .

بەشێوەیەکی گشتی پۆرن تاکی سەیرکەر ئاڵوودەی خۆی دەکات و زەرەر و زیانێکی زۆر بە مێشك و جەستە و دەروونی کەسەکە دەگەیەنێ و کەسایەتیەکەی لاوازدەکات و توانای قسە و بڕیاردانی لێدەسێنێتەوە و گۆشەگیری دەکات ، بۆیە پێویستە بزانین ئاڵوودەبوون چییە و چۆن کەسەکان ئاڵوودەدەبن ، وە زەرەر و زیانەکانیش چین و چۆن خۆمان بپارێزین و دووربکەوینەوە لەم ئاڵوودەبوونە قێزەونە .

## ئاڵوودەبوون چییە؟؟!!....

ئاڵوودەبوون : هەرشتێك مرۆڤ پێیەوە پەیوەست بێ و نەتوانێ دەست بەرداری بێ و زۆر بیری لێبکاتەوە و هەوڵی ئەنجامدانی دەدات و دووبارەی دەکاتەوە ئەوە ئاڵوودەبوونە .

جا ئاڵوودەبوون شێوازی زۆرە هەیە ئاڵوودەی پارەیە یان دەسەڵاتە یان خواردنە یان سێکس یان مۆبایل و ئینتەرنێت ... تاد ، کە بەو جۆرە ئاڵوودەبوونانەش دەوترێ ئاڵوودەبوونی نادەرمانی.

## چۆن ئاڵوودەبوون بە پۆڕن ڕوودەدات:

یەکێك لە بەهێزترین کلیلەکانی دروستبوونی پۆرن بریتیە لە Dopamine دۆپامین:

دۆپامین ماددەیەکی گەیەنەرە لە نێوان خانەکانی مێشك دایە(Neurotransmitter) کە بەرپرسە لە هەستکردن بە خۆ شی و هاندان، کە یەکێك لە ناوەکانی بە ماددەی ئالوودەبوون ناسراوە.

ڕێژەی دەردانی ئەو مادەیە لە چالاکییەکەوە بۆ چالاکییەکی تر دەگۆڕێت کە بۆ هێندێکیان زۆرە بۆ هێندێکی تریان کەمە لەوانەی ڕێژەیەکی زۆر دەردەدرێن بۆیان خواردنی شیرین و جەور، خۆشەویستی، هاوڕێیەتی و سێکس و تازەگەرێتی کەوا بە (Natural reinforces) ناسراون کەوا وەک تەقێنەرەوەیەکن بۆ ڕێژەی ڕژانی دۆپامین.

بە کورتی دەتوانین بڵێین دۆپامین مادەیەکە کەوا بە دووای هێشتنەوەی تۆدا ئەگەڕێت یەکێك لەو کارانەش سێکسە (وەچەخستنەوە ) یان هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندی بە سێکسەوەیە.

کاتێ دۆپامین ئەڕژێت دەچێتە سوورێکەوە کە پێی دەڵێن رێڕەوی خاڵی هاندان (reward circuite) کە لە بەشی ناوەراستی مێشکدایە.لە گروپی شیردەرەکاندا هەیە تا زیاتر ئەو دۆپامینە بخولێتەوە زیاتر هەست بە خۆشی دەکەیت.

کاتێ دۆپامین دەچێتە ئەو رێڕەوە جۆرێك لە پرۆتین بە ناوی ( DeltaFosB ) دەلتا فۆس بی دەنیشێت کە ڕێژەکەی پەیوەستە بە کات و زۆری ڕژانی

دۆپامیەنەکەوە کە بەنەبوونی دۆپامین ئەو پرۆتینە نیشتووە وا دەکات ئەو کەسە زووتر بگەڕێتەوە سەر ئەو کارەی کە زۆرترین دۆپامینی پێدەدات.
کاتێك کەسێك سەیری پۆرن دەکات لەشی ئامادە دەبێت بۆ جووتبوون دۆپامینێکی زۆر دەردەدرێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەسی سەیرکەر کاتێك سەیری فیلمی پۆڕن دەکات وەك ئەوە وایە کە سێکس ئەنجام بدات، لەبەر ئەوەی لاشە هەموو ئەو هۆڕمۆنانە دەردەدات کە بۆ سێکس کردن دەردەدرێن.
وە زۆر سەیرکردنی ئەو گرتە سێکسیانە ڕاددەی دەردانی دۆپامین کەم دەکاتەوە تا ئەوەی کەسەکە هەست بەبێ تاقەتی دەکات، بەڵام لەگەڵ گۆڕینی ڤیدیۆکە بە ڤیدیۆیەکی نوێ ئەوا دۆپامین لەمێشکدا بەرز دەبێتەوە .
دواتر جارێکی تر دۆپامین خاو دەبێتەوە، ئەگەر کەسی سەیرکەر بەردەوام بێ لەسەر سەیرکردنی ئەوا مێشك بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئەو رێژە زۆرەی دۆپامینە ئەو ناوچانەی پێویست نین لاوازیان دەکات بۆ ئەو ناوچانەی کەوا پێویستن بۆ ئەو کردارە، بەمەش ناوچەی خۆڵەمێشی مێشك بچووك دەبێتەوە، ئەوەش وا لەو کەسە دەکات کە بیرکردنەوەو بڕیاردانی لاواز بێت زووتر بگەڕێتەوە سەر ئەو کارە وە کەسایەتیەکەشی لاوازدەکات و متمانە و باوەڕ بەخۆبوونی کەم دەکات.
وە بەشی خۆڵەمێشی مێشك کە بەرپرسە لە هەستەوەرەکان و کۆنترۆڵکردنی ماسولکە بیرەوەری و سۆزو قسەکردن و بڕیاردان و کۆنترۆڵکردنی خۆی.

چەند کەسێکی ئاڵوودەی گرتە سێکسیەکانم دواند دەربارەی چۆنیەتی ئاڵوودەبوون و چۆنیەتی گرتە سێکسیەکان .

بەشێوەیەکی گشتی شێوازی سەیرکردن و ئاڵوودەبوونیان وەکو یەك بوو .

یەکێك لە ئاڵوودە بووەکان قسەی هەموانی کرد و گووتی: سەرەتا لەڕێی فیلمە درامی و ئەکشنەکان گیرۆدەبووم، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو ئافرەتانەی کە لەفیلمەکان بەشداریان پێدەکرێ ئافرەتانێکن کە زۆر بە خێرایی سەرەنجی پیاوان ڕادەکێشن، لەفیلمەکان ئەوجۆرە ئافرەتانە دێنن کە پیاو خۆزگەی سێکس کردنیان لەگەڵ دەکەن .

دواتر لەو فیلمانە بێزاربووم لەبەر ئەوەی ئافرەتە بەشدار بووەکان نیمچە ڕووت بوون، حەزی من زیاتر بوو لەوە، گوتم چۆن؟، گوتی: لەو فیلمانە قژ و کەمێك سنگ و قاچیان دیار بوو، حەزم دەکرد ئافرەتەکان سنگیان زیاتر دیاربوایە و قاچیان زیاتر بەرەو سەر ڕووت بوایە.

گوتی: دوای ئەوەی ئەو جۆرە فیلمانەشم سەیرکرد لەویش بێزار بووم، ئەمجارەیان حەزەکەم فراوانتر بوو، بەجۆرێك سەیری ئەو فیلمانەم دەکرد کە سینگی ئەفرەتەکە بەتەواوی دیاربوایە و لەگەڵ پیاوێك سەرجێی بکردایە، وە دواتر بەدوای ئەو گرتە ڤیدیۆیانە کەوتم کە هەموو لاشەی ئافرەتەکە بێ جل و بەرگ نیشان دەدا و دواتر ئەو ڤیدیۆیانەی کە ئافرەت و پیاو بەڕووتی نیشاندەدا و کاری سێکسی ئەنجام دەدەن.

ماوەیەکی زۆر ئاڵوودەی ئەوجۆرە ڤیدیۆیانە بووم و لەگەڵ سەیرکردنی ئەوگرتانە لەبەر ئەوەی ئەوکات خێزانم نەبوو تووشی ئاوهێنانەوە دەبووم

بەدەست (دەستپەڕ)، دوای ئەوەی تەواو ئالوودەبووم نەفسم پەلکێشی خراپەی دەکردم، ئەگەر ئافرەتێکم ببینیایە حەزم دەکرد سەرجێیی لەگەڵ بکەم بەشێوازێك مێشکم تێك چوو بوو تەنانەت زۆرجار حەزم دەچووە نزیکترین کەسەکانی خۆشم کە مەحرەمی خۆمن.

دوای سەیر کردنێکی زۆر و بەردەوامی ئەو گرتە ڤیدیۆیانە، بێزاربووم ئەمجارەیان حەزم چووە ئەوەی کە ئەو جۆرە گرتە ڤیدیۆیانە ببینم کە ئافرەت و ئافرەت لەگەڵ یەکتر سێکس دەکەن، لەویش بێزاربووم، ئەمجارەیان سەیری ئەو گرتە ڤیدۆیانەم دەکرد کە پیاو لەڕێگەی پێشەوەو لەڕێگەی کۆمەوە دەچێتە لای ئافرەت، دواتر سەیری ئەو ڤیدیۆیانەم دەکرد کە بە چەند پیاوێك دەچنە لای ئافرەتێك، پیاوێك لەڕێگەی پێشەوە و ئەوی تریان لەڕێگەی کۆمەوە و یەکێکی تریان لەدەمی و ئەوی تریان بەدەستی ئافرەتەکە، دواتریش هەریەك لە پیاوەکان مەنی خۆی واتە: ئاوەکەی لەڕێگەی کونی پێشەوە و ئەوی تر لەکۆم و ئەوی تر لەدەمی ئافرەتەکەی دەکرد، وە هەندێ جار هەموو پیاوەکان ئاوەکانیان بە ڕووخساری ئافرەتەکەدا دەکرد.

دوای ئەوە سەیری ئەو گرتە ڤیدیۆیانەم دەکرد کە لەنێوان پیاو و پیاو بوو واتە (نێربازی )،وە دوای ئەوەش سەیری ئەوانەم دەکرد کە لەگەڵ ئاژەڵان سێکسیان دەکرد لە پیاوان و ئافرەتان، وە بەچەندین شێوازی تر ...

هەر گرتە ڤیدیۆیەك کە سەیرم دەکرد حەزم دەکرد لەگەڵ کەسی بەرامبەر ئەنجامی بدەم، جا پیاو بوایە یان ئافرەت یان ئاژەڵ ، سوپاس بۆ خوا کە تووشی هیچ جۆرە دەستدرێژییەك و هیچ جۆرە زینایەك نەهاتم بەڵام ئێستا

لەگەڵ ئەوەی خێزاندارم و منداڵیشم هەیە نەمتوانیوە وازلەو خووە بهێنم و تا ئێستاش بە نهێنی سەیری گرتە ڤیدیۆی سیکسی دەکەم و نەمتوانیوە واز لەخوی نهێنی ( دەست پەڕ) یش بهێنم.

وەباسی لەوەش کرد کە ئەگەر خێزانەکەی بەبێ پەچە و بەجلی تەسك و نیمچە ڕووتیشەوە بێتە ناوخەڵك هیچ شتێك نییە لەناخەوە پاڵی پێوە بنێ و بڵێ: فەرمان بە خێزانەکەت بکە با جلێکی شەرعی بپۆشێ ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوەندە زۆر سەیری ئەوگرتانەی کردووە ڕاهاتووە لەگەڵ ڕووتی و لەلای بۆتە شتێکی ئاسایی .

ئەوەش ئەو قسەیەم بیر دێنێتەوە کە سەرۆکی پێشوی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ( جۆرج دەبلیۆ بۆش ) لە وتارێکدا لە کۆنگرەی [ الاتحاد الیهودی والمسیعي] گوتی: **{ سنحلق لحي الرجال... وننزع حجاب النساء ... وندخل أفلام الجنس إلى غرف نومهم } .**

واتە:- ڕیشی پیاوانیان دەتاشین ... وە ناکۆکی و کێشە دەخەینە حیجابی ئافرەتانەوە... وە فیلمە بەدرەوشت و جنسیەکان دەبەینە ژووری خەوتنیانەوە . بەبێگومان وایان کرد، کاتێك کۆمەڵگەی ئیسلامی دەبینین و ئافرەتانیان پەیوەست نین بە جل و بەرگی شەرعییەوە.

ئێستا لەناو هەموو ژوورەکان فیلم و گرتەی سێکسی سەیردەکرێ و بۆتەشتێکی ئاسایی لەناو خێزان و خەڵك و لەکۆڕ و مەجلیسەکانیش باس لەفیلمەکان دەکرێ و ئەوەی سەیریشی نەکات وای لێدەکەن سەیری بکات .

بەڵێ ئەمە ئەوشتەیە کە ئەوروپا لەو میللەتەی دەوێ، کۆمەڵگا بە پۆرن کردن، ئاڵوودەبوون و مێشك تێکچوون و نەهێشتنی پیاوەتی و عیززەت لەناو دڵ و لاشەی پیاوەکان و نەمانی دەسەلاتی پیاوان بەسەر ئافرەتان بۆ ئاڕاستەکردنی خۆیان و ئافرەتانیان بۆ ڕێگایەکی ڕاست و دروست و خواویستی
.

## بۆ چی ئاڵوودەبوونی پۆرن بە بەهێزترین ئالودەبوون دادەنرێ؟!

جاران لەڕێگەی سیدی و وێنە، ئێستاش لەڕێگەی ئەنتەرنێتەوە گرتە سێکسیەکان سەیر دەکرێن و زۆر بە ئاسانی و بێ هیچ سانسۆرێك هەموو گرتە سێکسییەکان

دێنە بەردەستی هەرکەس و تەمەنێك و ڕەگەزێك کە بیەوێ سەیری بکات ...

ئێستا سەیرکردنی فیلمی پۆڕن ( سێکسی ) بۆتە دیاردە و خەڵکێکی زۆر ئاڵوودەی بوونە و ناتوانن وازی لێبهێنن و بەردوام ئاڵوودەبوان سەردانی سایتە سێکسیەکان دەکەن، ئەمەش لەبەر ئەوەی کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی فیلمەکانی پۆرن بەردەوام گرتەی نوێ بەشێوازێکی پرۆفیشناڵ وێنە دەگرن و مۆنتاژی دەکەن و دەیخەنە ناو سایتەکان و بەپێی حەزی بینەر گرتەکان تۆماردەکەن ، تا بەهۆیەوە سەردانیکەرانی بێزارنەبن و بەردەوامبن لەسەیر کردنی سایتەکانیان .

وەهەروەها پۆرن لە زۆربەی وڵاتان یاساییە، جگەلەمەش کەسەکان و شێوازی جۆری سێکس کردنەکان تازەگەرێتییەکی زۆری تێدا ئەنجام دەدرێ، وە بەماوەیەکی کەم دەتوانی بە هەزاران ڤیدیۆی جیاواز ببینی و بێ ئەوەی

ماندووبی بۆ بەدەستهێنانی، وەهەروەها بوونی هەزاران سایتی جیاوازی تایبەت بە سێکس و دەستکەوتنی هەمووشێوازەکانی ئەنجامدانی سێکس، بێگومان ئەو هۆکارانەش وا دەکەن کە کەسی ئاڵوودەبوو ڕۆژانە و بەبەردەوامی سەیری پۆڕن بکات و هەست بەبێزاری نەکات ئەگەر زۆرترین کاتیشی لێ بەفیڕۆ بدات.

## زیانی سەیرکردنی فیلمی ڕووت بۆ مێشکی مرۆڤ چیە؟

لە ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەی ( jama) ی پزیشکی دەروونی ڕاپۆرتێکی لەبارەی توێژینەوەیەك لەسەر زیانەکانی سەیرکردنی فیلمە پۆڕنەکان و گرتە سێکسییەکان بۆ بەشە خۆڵەمێشییەکەی مێشك بڵاوی کردۆتەوە :

تێبینی: ( بەشی خۆڵەمێشی مێشك ئەو بەشەیە کە زۆرترین خانەکانی مێشکی تێدایە و سەرجەم دەمارە ڕاگەیاندنەکەن لەوێوە دەردەچێت ).

ئەو توێژینەوەیە لەسەر( ٦٤٠ )کەس ئەنجام دراوە، کە تەمەنیان لەنێوان ( ٢١ بۆ ٤٥) ساڵ دەبێت و داوایان لێکردوون کە سەرجەم زانیارییەکانیان لەسەر سەیرکردنی گرتە و فیلمە سێکسییەکانەوە لە هەفتەیەکدا بنوسن و دواتریش توێژینەوەیەکی وورد و تێر و تەسەلیان لەسەر مێشکیان ئەنجام داوە.

پزیشکەکان بە ئامێری شەپۆلی موگناتیسی ( mri ) وێنەی مێشکی ئەو کەسانەیان گرتووە کە تەماشای فیلمە سێکسییەکانیان کردووە .

زانا و پزیشکەکان بۆیان دەرکەوتووە کە لەکاتی سەیرکردنی ئەو فیلمە سێکسیانەدا چالاکیەکانی بەشی لای ڕاستی مێشك ( caudate ) بەتەواوی

کەمیکردووە و هەستەکانی هاندان و هەست بەشت کردن زۆر زیادی کردووە، بەڵام کاتێك کە کەسەکان سەیری گرتە و فیلمی ئاساییان کردووە هیچ گۆڕانکارییەکی خراپ ڕووی نەداوە.

بۆیە پزیشکەکان جەختیان لەوە کردۆتەوە کە نابێت تەماشای ئەو جۆرە فیلم و گرتە ڤیدیۆییانە بکرێت، لەبەر ئەوەی زیانی زۆر بە مێشك و بە تایبەتی جەستە بەگشتی دەگەیەنێت، پزیشکە تایبەتەکان ئاماژەشیان بەوەداوە کە ئەو کەسانەی تەماشای فیلمە سێکسییەکان دەکەن خانە چاڵاکەکانی مێشکیان کەم دەکات و ئەگەری تووشبوونیان بەنەخۆشییە دەروونیەکان زۆر زیاترە لە کەسانێکی ئاسایی.

## کاریگەرییە مەترسیدارەکانی سەیرکردنی فیلمی ڕووت لەلایەن پیاوانەوە بۆ سەرخێزان ...

زۆر بەکارهێنانی ئینتەرنێت کاریگەری خراپی هەیە لەسەر پێکهاتەی خێزانی، لەبەر ئەوەی یەکێك لە بەشە هەرە گرنگەکانی ژیانی ژن و مێرد بریتییە لە ژیانی سێکسی، بەڵام بە سەیرکردنی پۆڕن ئەو هەستەو ئەو پەیوەندییە تێك دەچێت وە بەکارهێنانی پۆڕن بە تایبەتی کاریگەری بەهێزتری هەیە، لەبەر ئەوەی پۆڕن کەسەکان ئاڵوودە دەکات و سەرنجی کەسەکە بەلای خۆیدا ڕادەکێشێ و وای لێدەکات هەست بەبۆشایی سێکسی بکات هەرچەندە کەسەکە خێزانداریش بێ، لەبەر ئەوەی شێوازی جۆری گرتەکان و شێوازی جووتبوونەکانی جیاوازە لەگەڵ ژیانی هاوسەری و جوتبوونی ئاسایی،لەبەر ئەوەی پۆرن (وروژێنەرێکی گەورەترە لە وروژێنەری ئاسایی)، بۆنمونە لەفیلمە سێکسیەکاندا : پیاوێك دەچێتە لای ئافرەتێك،پیاوەکە بە ڕێگەی جیاواز لەگەڵ ئافرەتەکە جووت دەبێت، ئەویش لەڕێگەی ( دەم و کۆم و شوێنی منداڵ بوونی ئافرەت ) وە دواتریش پیاوەکە تۆوی خۆی دەخاتە ( دەمی یان کۆمی یان شوێنی منداڵ بوونی ئافرەتەکە).

وە ئافرەتەکانی بەژداربوو ، ئافرەتی ئاسایی نین،لەبەر ئەوەی چەندین جۆری جوانکاری بۆ لاشەیان بەکاردێنن،بۆ نمونە گەورەکردنی سمتی یان شوێنی منداڵ بوونی یان جوانکاری لێوی یان ڕوومەتی وە لەگەڵ چەندین جۆری تری جوانکاری، وە گرتە و چۆنییەتی سێکس کردنەکەش ئاسایی نین، لەبەر ئەوەی

ئەوگرتانە هەیانە چەند سەعاتێك دەخایەنێ تا بتوانن بەهۆیەوە گرتەیەكی جوان پێشكەش بكەن، یان ئەو كاتەی پیاوەكان لەڕێگەی كۆمەوە دەچنە لای ئافرەتەكان ئافرەتەكان دەرمانی بەهێزی ئازارشكێن بەكار دێنن .

كاریگەرییە مەترسیدارەكە لێرە دەست پێدەكات كە كەسی تەماشاكەری ئەو جۆرە گرتانە دەیەوێ هەموو ئەو شێوازانە لە جووتبوونی ئاساییدا لاسایی بكاتەوە، بێگومان ئەوشتانەش سەرناگرێ، لەبەر ئەوەی دینی ئیسلام ڕێگری كردووە لەڕێگەی كۆمەوە جووتبوون ئەنجام بدرێ، بۆیە لێرەدا كەسەكە نەخۆشییەكی دەروونی بۆ دروست دەبێت و هەست بە بۆشایی كاری جووتبوون دەكات،چونكە ناتوانێ حەزەكانی جێبەجێ بكات لەسەر خێزانەكەی.

جا لێرەوە كێشەكان دەست پێدەكەن،لەبەر ئەوەی كەسی سەیركەر و ئالوودەبوو هەیە داوای لەخێزانەكەی كردووە تا لەڕێگەی كۆمەوە لەو شوێنە قێزەونە لەگەڵی جووت بێ،وە خێزانەكەشی ڕەتی كردۆتەوە و گوێرایەڵی نەكردووە و كێشە لەنێوانیان درووست بووە تا هەندێكیان گەیشتۆتە ڕادەی جیابوونەوە.

ڕۆژێكیان لەگەڵ دووبرا كارم دەكرد، یەكێك لەو برایانە تەلەفۆنێكی بۆهات و وەڵامی دایەوە و تۆزێ لە ئێمە دووركەوتەوە تا پەیوەندییەكەی تەواو بوو، دواتر گەڕاوە لامان و زۆر بێتاقەت بوو، منیش پرسیاری بێتاقەتییەكەم لێ كرد، گووتم : پێش تەلەفۆنەكە ڕووێكی خۆشت هەبوو چ شتێك بێتاقەتی كردی ؟؟

گوتی: ئەوە ئامۆزاکەم بوو، خوشکێکی هاوژینی برادەرێکمە، ئەو ئامۆزایەم پێی گووتم بڵێ ماڵی باوکی برادەرەکەت بابێن و دەست لەخوشکەکەم بەردەن و با ئەو کوڕە لە خوشکەکەی من جیابێتەوە.

منیش گوتم : لەبەرچی ؟

گوتی: ئەو برادەرە هیچ کێشەیەکی نەبووە لەگەڵ خێزانەکەی و ماڵ و حاڵ و منداڵیشیان هەیە، ئەوەی بۆتە کێشە حەزی پیاوەکەیە و ڕازی نەبوونی ئافرەتەکەیە. گوتم : چۆن ؟ بەباشی لەمەبەستەکەت ناگەم .

گوتی: ئەو پیاوە چەندجارێك داوای لە خێزانەکەی کردووە، لەڕێگەی کۆمەوە سەرجێیی لەگەڵ بکات بەڵام ئافرەتە ڕازینەبووە و نەیهێشتووە پیاوەکەی لەو ڕێگەیەوە لەگەڵی جووت بێ ، پیاوەکەش وازی نەهێناوەو چەندین جاری تر داوای لێکردۆتەوە بەڵام خێزانەکەی هەر ڕازینەبووە، دوای ئەوە کێشەی زۆر کەوتۆتە نێوانیان و ئافرەتەکە چەندجارێك چۆتەوە ماڵی باوکی و دواتر گەڕاوەتەوە لای پیاوەکەی بەئومێدی ئەوەی پیاوەکە دەست لەو داواکارییەی هەڵگرێ و خۆشی و شادی بگەڕێتەوە ناوماڵ و منداڵی و ئەو بابەتەشی لەلای هیچ کەس نەدرکاندووە، بەڵام هەر سوودی نەبووە و پیاوەکە سوور بووە لەسەر داواکەی، بۆیە دواجار ئافرەتەکە دەچێتەوە ماڵی باوکی و باسەکە بۆ برا و باوکی دەگێڕێتەوە، ئەوانیش بڕیاری جیابوونەوە دەدەن و لێناگەڕێن کچەکەیان بچێتەوە لای پیاوەکەی.

من کاتێك گوێ بیستی ئەو قسانەبووم تەواو تاسابووم، لەگەڵ خۆم دەدوام و دەمگووت چۆن دەبێ پیاو ئەوەندە نامەردبێ و خۆی بێنێتە ئاستێك

کە ئاژەڵەکانیش نایەنە ئەو ئاستە!!، چۆن دەبێ پیاوێك شتێك بکات کە پەروەردگار نەهی لێکردووە؟!، چۆن دەبێ و چۆن دەبێ ؟! کۆمەڵێك پرسیاری بێ وەڵام لە مێشکمدا هاتووچۆیان دەکرد. بەڵێ دوای تەنها یەك هەفتە ئافرەتەکە لەپیاوەکەی جیابۆوە، دووکچ و کوڕێك بوونە قوربانی حەزێکی پیسی پیاوێك و لەنازی دایە و بابەیان بێبەش بوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **(لا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَى رَجُلٍ أَتَى رَجُلًا، أَوِ امْرَأَةً فِي الدُّبُرِ.)**[1] واتە:- خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا سەیری پیاوێك ناکا کە نێربازی بکات و یا لەدواوە بچێتە لای ئافرەتان. ( یان ئافرەتی خۆی).

بەڕێزەکەم ئەگەر لەقیامەتدا خوای گەورە سەریت نەکات و ڕووت لێوەرگێڕێ ، دەبێ چ سزایەك لەپێشت بێ ؟، ئایا ئەگەر خوای گەورە ڕووی لێت وەرگێڕێ هیچ چاوەڕوانیەکی چوونە بەهەشت دەکەی ؟ بەشێوەیەکی گشتی ئەو پیاوانەی کەوا سەیری پۆڕن دەکەن حەزی بۆ جووتبوون لەگەڵ خێزانەکەی نامێنێت وە بە پێچەوانەوەشەوە، وە کەسی سەیرکەر تووشی چەندان کێشەی تری جەستەیی و دەروونی دەبێ وەك ڕەقنەبوونی ئەندامی زاووزێی نێرینە، یان زوو گەیشتنە حاڵەتی تۆو هاتنەوە یان نەجووڵانی هەستی سێکسی بە خێزانی خۆی بە هۆی سەیرکردنی پۆڕنی نائاسایی و وا دەکات کەسەکە تەرکیزی لاواز بێت نەتوانێت ئەرکەکانی ناو خێزان بەجێ بگەیەنێت هەم لە ڕووی ماددی وە هەم لە ڕووی دەروونی و سۆزی بۆ خێزانی وە بۆ منداڵەکانی.

---

[1] - سنن الترمذی حکم الحدیث حسن

**سەیرکردنی ئەو فیلمانە زیانی زۆری هەیە بۆ سەرخێزان لەوانە:**

*نەمانی متمانە لە نێوان هاوسەرکان و وازهێنان لە تاکە کەسی (خێزانی) لە سێکس کردن.

*نەمانی هەست (حەز) بۆ دروستکردنی خێزان و گەورەکردنی منداڵ.

*سەیرکردنی پۆڕن دەرگا بۆ کێشەکان دەکاتەوە و دەبێتە چەکێکی کوشندە بۆ لەناوبرنی کۆمەڵگە و خێزان و تاکەکانی .

*ئەوانەی ئالوودەی پۆڕنن کەمتر چێژ لە سێکس لەگەڵ هاوژینەکانیان دەبینن و زۆرتر ئارەزووی توندوتیژی سێکسی دەکەن و ئەگەری زۆرتریشە بیر لە ناپاکی هاوژینی بکەنەوە.

*ڕۆژنامەی دەیلی مەیلی بەریتانی لە ڕاپۆرتێکدا لە ١٩-١-٢٠١٤ بڵاوی کردبووەوە کە ٪٥٦ ی کەیسەکانی جیابوونەوە لە بەریتانیا بەهۆی ئەوە بووە کە یەکێکیان ئالوودە بووە بە پۆڕن .

*بەرکارهێنانی پۆڕن خۆشی و سەقامگیری هاوسەرگیرێتی کەم دەکاتەوە

*لە ٪٥٦ تەلاق دراوەکان خولیایەکی بەهێزیان هەبووە بۆ سەیرکردنی پۆڕن.

*سەیرکردنی پۆڕن ئەگەری کردنی ناپاکی خێزانی بەر ڕێژەی ٪٣٠٠ بەرزدەکاتەوە.

*لە ٪٥٠ ئەوانەی کەوا پۆڕنی ئەنتەرنێتی سەیردەکەن حەزی سێکس کردنیان لەگەڵ خۆشەویستەکانیان لە دەست داوە.

*لە نێوان ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٤ : زۆربەکارهێنانی ئەنتەرنێت بە گشتی وە بە تایبەتی پۆڕن هۆکار بووە بۆ کەم بوونەوەی هاوسەرگیرێتی

*لە توێژینەوەیەك  لە ٢٠١٤ بۆیان دەرکەوتووە کەوا ئەو بالغانەی سەیری فلیمی پۆڕن دەکەن زیاتر وادەردەکەون کە لە ژیانی هاوسەرگیریێتیاندا خۆشحاڵ نەبن، وە زیاتر حەز دەکەن هاوسەرگیریێتی زیاتر بکەن وە زیاتر تووشی تەلاق دەبن.

*لە ٪٥٠ ئەو کەسانەی کەوا پۆڕن بەکار دەهێنن گوتویانە حەزی سێکس کردن لەگەڵ هاوسەرەکانی خۆیان نەماوە.

*خەمۆکییەکی بە هێز دەرکەوتووە کە دووقاتە لە ناو ئەو کەسانەی پۆڕن بەکاردەهێنن بەرامبەر بەو کەسانەی کەوا بەکاری ناهێنن.

کۆمەڵگەناس ( جیل مانین ) دەڵێ توێژینەوەکان دەریانخستووە بەکارهێنانی پۆڕن پەیوەندی هەیە لەگەڵ ئەم شەش گۆرانکاریانەدا لە چاو کەسانی دیکەدا:

١-قەلەقی خێزانی زیاد دەبێت، وە مەترسی یەکە بۆ جیابوونەوە و تەڵاق.

٢-کەم بوونەوەی تێکەڵاوی خێزانی وە تێربوونی سەرجێ.

٣-کەم بوونەوەی وەفای خێزانی.

٤- بەرزبوونوەی حەز بۆ جۆری تری پۆڕن و چالاکی سێکس کە پەیوەندی هەیە لەگەڵ  چالاکی توند و نا قانوونی و نا سەلامەت.

٥-بەکەم زانینی بیرۆکەی تاکە کەس بۆ سێکس و هاوسەرگیریێتی و گەورە کردنی منداڵ.

٦- زیاد بوونی ئەو خەڵکانەی کە تێوە گلاون لەگەڵ رەفتاری سێکسی ئالوودە بوون یان نەتوانین لە واز لێهێنانی.

## ئافرەت و سەیرکردنی فیلم و گرتە سێکسییەکان :

بەداخەوە لێرە ئازادییەکی ڕەها و بێ سانسۆر و بێ چاودێرییەکی ڕێك و پێك بۆ کەسەکان دابینکراوە، ئەمەش وا دەکات بکەونە ژێر کاریگەری ئەو شەپۆلە گەورە بێ ڕەوشتییەی کە ئەوروپاو ئەمریکا هاوردەی وولاتانی ئیسلامی دەکەن، ئەو کاریگەریە و ئەو ئازادییە ڕەهایەش وادەکات کە زۆربەی جارەکان بەربەرەڵایی و هەست نەکردن بە بەرپرسیارێتی دروست بێ، وە ئەو شەپۆلە بەدڕەوشتییە و بەناو ئازادییە ڕەهایە دەبێتەهۆی شکاندنی شکۆ و پیرۆزییەکانی ئەو میللەتە .

جا ئەو شەپۆلە بەدڕەوشتیە و ئەو ئازادییەڕەهایەش وەکو ڤایرۆسێکی کوشندە منداڵ و گەنج و پیاو و ئافرەت تووشی دەیان دەرد و نەخۆشی و ناخۆشی دەکات.

ئەوەی دەمەوێ باسی بکەم ئەوەیە کە لێرە ئافرەتانیش وەکو پیاوان ئاڵوودەی شتە ئاڵوودەکەرەکان دەبن، گرتە سێکسییەکانیش دەردێکی کوشندەی ترە کە ئێستا ئافرەتانیشی ئاڵوودەی خۆی کردووە و ئافرەتانیش سەردانی سایتە سێکسیەکان دەکەن و سەیری گرتە سێکسییەکان دەکەن بۆیە کاری بەدڕەوشتی و جلی ڕووت و هەڕاج کردنی لاشەی ئافرەتان لەناو خەڵکی بەناو موسڵمان تا ڕادەیەك ئێستا بۆتە شتێکی ئاسایی و خەڵکی پێوەی پابەندن.

ئێستا لەبەر کاریگەرییەکانی ئەو جۆرە فیلمانە لەسەر خەڵکی تێکەڵاوی و تەوقەکردن و خۆشەویستی و هاوڕێیەتی و سێکس لە نێوان کچ و کوڕ و کچ و

پیاوێکی هاوسەردار یان ژنێکی هاوسەردار لەگەڵ کوڕێکی بێ هاوسەر یان ژن و پیاوێکی هاوسەردار تاڕادەیەك بۆتە شتێکی ئاسایی .

کەسێك دەناسم کە ژیانی هاوسەرێتی پێك نەهێناوە لەگەڵ ئافرەتێکی هاوسەردار پەیوەندی هەیە، کاتێك پیاوی ئافرەتەکە لەماڵ دەردەچێ بۆ کارو پیشەی ڕۆژانە و بەدەستهێنانی بڕێك پارە بۆ بژێوی خێزان و منداڵەکانی، خێزانەکەی تەلەفۆن بۆ ئەو کوڕە دەکات و دەیباتە ماڵەوە بۆ ئەنجامدانی سێکس لەدەرەوەی متمانەی خێزان، ئەو کوڕە تەنها بیست هەنگاوی بەسە تا دەگاتە لای ئافرەتەکە، واتە دراوسێی یەکترن و تەنها دوو یان سێ ماڵیان لەنێوانە.

ئەو کەسە بۆی باس کردم و گوتی: ئەو ئافرەتە ئاڵوودەی گرتە سێکسییەکانە، هەموو جارێك کە دەچمەلای لە مۆبایلەکەیدا جۆرە گرتەیەکی نوێی ئامادەکردووە و پێمی نیشان دەدات و داوام لێدەکات هەموو شتەکانی ناو گرتە ڤیدیۆیەکەی لەگەڵ ئەنجامبدەم.

دەڵێ : منیش سەیری دەکەم و هەموو شێوازەکانی سێکسی لەگەڵ بەکاردێنم، لەدواوە و لەدەمی و لەپێشەوە لەگەڵی جووت دەبم .

منیش پرسیارم لەو کوڕەکرد و گووتم: ئەوەی لەگەڵ تۆ دەیکا هەمان شتیش لەگەڵ پیاوەکەی دەکا؟.

گوتی: نەخێر ئەوکارە تەنها لەگەڵ من دەکات.

ئەوەی کە زۆر سەرسامی کردم ئەوەبوو کە ئەو کوڕە باسی کردو گووتی : زۆر شەو هەیە دەڵێمە ئەو ئافرەتە نابێ لەگەڵ پیاوەکەت جووت بی ، دەڵێ : ئەو

ئافرەتە ئەو شەوە لێناگەڕێ پیاوەکەی نزیکی بکەوێتەوە ئەگەر چەند جارێکیش داوای سەرجێی لێبکات لەبەر من داوای پیاوەکەی ڕەد دەکاتەوە.
وەگوتیشی ڕەنگە ئەو مندالەی ئێستای لەمن بێ کە زۆری نەماوە بێتە سەر دونیا.
کەسێکی تر بۆی باس کردم گووتی: ئێمە سێ هاوڕێین و ئالوودەی گرتە سێکسیەکانین، وە هەریەکەمان پەیوەندیمان لەگەڵ ئافرەتێك هەبوو و" سێکس" ـمان لەگەڵ دەکردن کە هەرسێکیان مێردیان هەبوو، ڕۆژێکیان وا ڕێك کەوتین و ڕۆژێکمان دانا کە ئافرەتەکان ببەینە دەرەوە و لەشوێنێك بەیەکەوە کۆببینەوە، ئەوەبوو هەریەکەمان ئافرەتەکانمان هێنا و ژوورێکمان دابینکرد لە شوێنێك کە دار و باغاتی لێبوو.
گووتی: کەچووینە ژوورەکە لەگەڵ هەردوو هاوڕێکەم و ئافرەتەکان، لەوێ ئافرەتەکانمان بەیەکتر ناساند و هەریەکەمان لەتەنیشت خۆشەویستەکەمان دانیشتین، دوای ئەوە یەکێك لە هاوڕێکانم خۆی پێنەگیرا و دەستی بۆ خۆشەویستەکەی خۆی برد و ناو دەمی ماچ کرد، دەڵێ: دواتر من و هاوڕێکەی تریشم ئەوکارەمان ئەنجام دا، تا گەیشتە ئەوڕادەیەی کە هەموومان لەوژوورە جلەکانمان داکەند و دەستمان بەسێکس کردن کرد لەبەر چاوی یەکتر.
دەڵێ: لەبەیانی تا نیوەڕۆ هەریەکەمان چوارجار یان پێنج جار جووت بووین و ئاوە ( تۆوە) کەشمان دەخستە ناو شوێنی منداڵ بوونی ئافرەتەکان، وە دوای ئەوە ئافرەتەکانمان بردنە ماڵی خۆیان کە هەریەکێکیان بەفێڵێك هاتبووە

دەرەوە و دوای ئەوە وازمان لە هەرسێ ئافرەت هێنا و پەیوەندیمان لەگەڵ پچڕاندن.

## لە ئیسلامدا ...

کاتێ پیاوێك یان ئافرەتێك دەستی لەگەڵ پیاوێکدا تێکەڵ دەکات و خیانەت لە متمانە و ئابڕوو و ناموسی پیاوەکەی دەکات و سنووری خوا و حەیا و شەرم و شکۆی خێزان دەشکێنێ، لەبەرامبەر دا دەبێ یاسا و سنوورێك هەبێ بۆ ئەوەی پێش لە مرۆڤەکان بگرێ تا لە زینا و داوێن پیسی نزیك نەکەونەوەو داوێنیان بە پاکی بهێڵنەوە و نەوەی پاك و پەروەردەکراو لەدایك و باوکێکی دیارەوە بێنە سەر دونیا .

جا کاتێك ئافرەتێك یان پیاوێك ئەو سنوورەی تێپەڕاند ئەو کاتە باشترین کار ئەوەیە بە ڕێگەیەکی دروست مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕووداوەدا بکرێت، وە بێگومان باشترین و گونجاوترین ڕێگە و کار ئەوەیە کە بگەڕێینەوە لای قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ، لەبەرئەوەی قورئان باشترین و بێ کەم و کورترین یاسا و دەستوورە تا مرۆڤ ئیش بە یاساکانی بکا و فەرمانەکانی خواش بە بەرزی ڕابگیرێ .

ئەگەر ئافرەتێکی خاوەن مێرد زینای لەگەڵ پیاوێکدا کرد کە ئەویش خاوەن خێزان بێ، بێگومان سزای هەردووکیان مردنە. ئەگەر ئافرەتێکی خاوەن مێرد زینای لەگەڵ کوڕێکدا کرد کە خێزانی نەهێنابێ شەرع چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات ؟!

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُمَا قَالَ: إِنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْشُدُكَ اللَّهَ إِلَّا قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اللَّهِ. فَقَالَ الْخَصْمُ الْآخَرُ وَهُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ : نَعَمْ. فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ وَائْذَنْ لِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ" قُلْ قَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ، فَسَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ فَأَخْبَرُونِي أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ: الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ. اغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا ". قَالَ : فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ، فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُجِمَتْ.}[1] واتە: لە ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالدی جوهنی ڕەزای خوایان لەسەربێ دەگێڕنەوە و دەڵێن: پیاوێکی دەشتەکی هاتەخزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەڕەکەی من بەکرێ گرتە بووە لای ئەم پیاوە و زینای لەگەڵ خێزانەکەیدا کردووە، منیش بیستوومە کە دەبێت کوڕەکەم ڕەجم بکرێت ، جا سەد سەرمەڕم کرووە بە فیدیەی لەگەڵ کەنیزەیەکدا، دوایی پرسیارم کرد لە ئەهلی عیلم ئەوان پێیان ڕاگەیاندم کە دەبێت کوڕەکەم سەد داری لێبدرێت وساڵێك دوور بخرێتەوە و ئەو ژنەش ڕەجم بکرێت ؟ ( واتە من کامیان بکەم ؟) پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ. اغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى

---

[1] - صحيح البخاري

امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا ". قَالَ : فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ، فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُجِمَتْ.

واتە: سوێند بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە بەپێی قورئانی خوا حوکمتان دەکەم، کەنیزەك و مەڕەکانت دەدرێتەوە و لێت وەرناگیرێت، وە کوڕەکەت سەد داری لێ دەدرێت و ساڵێك دوور دەخرێتەوە، وە ئەی ئونەیس بەیانی برۆ بۆ لای خێزانی ئەو پیاوە ئەگەر دانی نا بەزیناکەیدا، ڕەجمی بکە، جا کەچوو بۆ لای ژنەکە و دانی پێدانا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکردوو ڕەجم کرا .

بۆیە دەبێ بزانین زۆر سەیرکردنی فیلمی خۆشەویستی و پۆرن وا لەپیاوان و ئافرەتان دەکات کە پێش زەواج و دوای زەواجیش پەیوەندی سێکسی ئەنجام بدەن، وە ئەوانەی ئەو کارەش ئەنجام دەدەن بەشێوازێکی ناتەندروست و بەکارهێنانی توندوتیژی سێکس ئەنجام دەدەن و نەوەی زۆڵ دێننە بوون، بەمەش کۆمەڵگایەکی ڕووخاو و سەرلێشێواو و شەهوەت باز دروست دەبێت .

## کاریگەری سەیرکردنی پۆرن لەسەر منداڵان وگەنجان:

بەهۆی ئاسان سەردانکردنی سایتە سێکسییەکان (پۆرن)، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی سەردانیان دەکەن، ئەمەش هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ گەورەیی پۆرنۆگرافی ، ڕاگەیاندن ، بەرەوپێشچونی تەکنەلۆژیا، کە بونەتە هۆکاری ئەوەی کەبتوانرێت زۆر بەئاسانی پۆڕن بەدەست بخرێت ئەمەش بووتە هۆکاری ئەوەی کە کاریگەریەکەی زیاتربێت و زیاتر شەپۆلی پەتای پۆڕن بە هەمووجیهاندا بڵاو دەبێتەوە و کار دەکاتە سەر هەموو چینەکانی کۆمەڵگا ، ئەبێتە هۆی وێرانکردنی هەرکەسێك کە بیبینێت لەم نێوەندەشدا هەرزەکاران بوونەتە قوربانی بێ ئەوەی هەستی پێبکەن.

بەپێی تازەترین لێکۆڵینەوە کە لە زانکۆی کامبریجی بەریتانیا ئەنجامدراوە، دەرکەوتووە،کە ئاڵودەبوون بە سەیرکردنی گرتە و فیلمە سێکسیەکانەوە، کاریگەری زۆر کوشندەی دەبێت بۆ بێهزکردنی توانستی بیرکردنەوە و هیلاککردنی مێشك و دواتر ئەگەری لەکارکەوتنی.

لێکۆڵینەوەکە لەسەر چەند کەسێك کراوە، کە ئالودەی ماددەی کۆکاین بوون دەرکەوتووە، بەشێك لە مێشکیان لە کارکەوتووە و هەمان لێکۆڵینەوە لەسەر چەند کەسێکیش کراوە، کە ئاڵودەی سەیرکردنی پۆرن بوون بە هەمان شێوە بە تایبەتی بەشی پێشەوەی مێشکیان بەشێوەیەکی ئاسایی کارناکات.

د. نۆرمان دۆیج یەکێك لە لێکۆڵەرەکانی لێکۆڵینەوەکە دەڵێ: ئاڵودەبوونی خوی نهێنی و سەیرکردنی فیلمە سێکسییەکان مەترسیان لە بەکارهێنانی ماددەی

بێهۆشکەر زیاترە، بەتایبەتی بۆ ئەو منداڵانەی تەمەنیان لە خوار ١٤ ساڵەوەیە و دەبێتە هۆکاری دروستکردنی کاردانەوەی نەرێنی لەسەر ڕەفتاری داهاتوویان و بەرەو لادانی سێکسیان دەبات.[١]

ئەوەی کە زۆر مەترسیدارە ئەوەیە کە هەرکەسێ بینەری ئەو جۆرە گرتە سێکسیانە بێت، لەهەر تەمەنێك بێت هەوڵی لاسایی کردنەوەی ئەو گرتانە دەدات، ئەمەش شتەکە مەترسیدارتر دەکات لەبەر ئەوەی قۆناغی هەرزەکاری قۆناغێکی هەستیارە کە مرۆڤ پێیدا تێپەڕ دەبێت، لەو قۆناغەدا پەروەردەکار دەبێ زیاتر و توندتر چاودێری منداڵەکانیان بکەن بێ ئەوەی منداڵەکانیان هەستی پێبکەن، دەبێ پەروەردەکار بزانێ منداڵەکانی لەگەڵ کێ دادەنیشن و هاوڕێی کێن و چۆن هەڵس و کەوت دەکەن.

لێرە شتە مەترسیدارەکە ئەوەیەکە هیچ سانسۆر و چاودێرییەك نییە نەلەلایەن حکومەت و نە لەلایەن کۆمپانیاکانی هێڵی ئینتەرنێت،وە پشتگوێ خستنی منداڵ لەلایەن دایك و باوکەوەو  چاودێری نەکردنیان و پشتگوێ خستنی پەروەردەکردنیان، ئەمەش وادەکات لەداهاتوودا لێکەوتەی نەرێنیی زۆری لێبکەوێتەوە،لەوانە: گرفتی دەروونیی، کێشەی خێزانیی و سێکسی نادروست و نەوەیەکی کەم بەرهەم، ڕوخانی گەنج و هەرزەکار کە دواتریش داڕوخانی کۆمەڵگەی بەدوادادێت .

یەکێکیتر لەو لایەنە مەترسیدارانەی سەردانیکەرانی پۆڕن ئەوەیە کەوا گەنجان پۆڕن وەك جێگرەوەیەکی هاوسەرگیری سەیر بکەن، وە بەهۆی

---

[١] - سەرچاوە/ ماڵپەڕی ئەلجەمال بەدەست کارییەوە

ئەوەوە گەنجەکە هەست و خولیای بۆ هاوسەرگیریتی نەچێت بە تایبەتی لەو کۆمەڵگایانەی کەوا هاوسەرگیری زۆر قورس کراوە لەسەر گەنج، کە ئەمەش وا دەکات یەکێك لە کۆڵەگەکانی کۆمەڵگا کە خێزانە دروست نەبێت و نەوەی پاك و چاك و بەڕەوشتیش نێتە بوون .

لەئێستادا منداڵانیش بەهۆی بوونی مۆبایل و ئینتەرنێت و بەهۆی ئەو ئاسانکاریيانەی کەهەیە لە بەدەستهێنان و دەستکەوتنی فیلمی سێکسی ئەوانیش ئاڵوودەی ئەو گرتە سێکسیانە بوون و ڕۆژانە و بەنهێنی سەیری گرتەکان دەکەن، بەپێی توێژینەوەیەك کە لە( Washington post ) واشنتۆن پۆست کراوە زیاتر لە ١١ ملیۆن هەرزەکار سەیری پۆڕنی ئینتەرنێت دەکەن بەشێوەیەکی ڕێك.

وە تۆمارکردنی گرتەی سێکسی منداڵ بووەتە بازرگانییەکی گەورە و زۆر بە خێرایی گەشە دەکات،تەنها لە ئەمەریکا زیاد لە ٦٢٤ هەزار بازرگان و کڕیاری پۆڕنی منداڵ هەن، ٪٦٤ ی هەرزەکار و گەنج هەفتانە سەردانی سایتە سێکسییەکان دەکەن.

بێگومان لێرەش منداڵان و هەرزەکاران بینەری ئەو جۆرە گرتانەن، هەرچەندە هیچ ئامارێکم نەدۆزیەوە لەوڵاتی خۆمان لەسەر ئەوە بەڵام ڕووداوەکان مەترسی ئەو نەخۆشییەکوشندەیە دەخەنە ڕوو .

## مەترسی ترین ڕووداوەکانیش بریتین لە...

### ١-نێربازی GAY .

سەرەتا پێناسەی GAY نێربازی دەکەین .

**GAY**: لە هەندێک ڕێکخستنی رۆشنبیریدا بەکار دەهێنرێت بۆ نوێنەرایەتی کردنی ئەو پیاوانەی کە بە هەستێکی ڕۆمانسی، رۆتیک و/یان هەستەوە راکێشراون بۆ پیاوان[١]

یان بە پێناسەیەکی ڕوونتر دەتوانین بڵێین :

**نێربازی :** کە بەئینگلیزی پێی دەگوترێ ( Pederasty or Male Homosexuality ) جۆرێك لە سێکسی هاوڕەگەزبازی نائاساییە ، کە کەسانی تری هاوڕەگەزەکان ئەوانەی ( سالب ) ن سەرنجی نێرەکان ( موجەب ) بکەرەکان ڕادەکێشن و لەیەکتر نزیك دەبنەوە ، وە لەو ڕێگەیەوە جووتبوون لەڕێگەی کۆمەوە لەنێوانیان ئەنجام دەدرێت، کە ئەمەش بێگومان پێچەوانەی پاکی سروشتی مرۆڤەکانە.

وە هاوڕەگەزبازی تاوانێکە و لەزۆر وڵاتاندا یاسا سزای ئەم پراکتیزەیە دەدات ، بەڵام لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپیەکان کارێکی ئاساییە و هەندێ وڵات بەیاسای کردووە و پیاو و پیاو دەتوانن مارەبڕین لەنێوانیان ئەنجام بدەن.

---

[١] https://www.vanderbilt.edu

ئەو کارە جگە لەوەی کە کارێکی قێزەون و پیسە، بەڵام کەسانێکی زۆریش وەك پێشتر باسمان کرد بە هۆی ئەو گرتە ڤیدیۆیانەوە ئاڵوودەی بوونە کە بەشێکیان هەوڵی لاسایی کردنەوەی ئەو جۆرە گرتانە دەدەن گەر لەکاتی گونجاودا ، وە هەندێکیشیان دەستیان پێکردووە .

لەم هەرێمە و لەیەکێك لەشارەکانی کوردستان و لەیەکێك لە پارکەکان کۆمەڵێك گەنج کە ژمارەیان چوار کەس دەبوو کە تەمەنیان لەنێوان ١٥ تا ١٨ساڵی دەبوو، کاتژمێر ١١ شەو دەستیان بەخواردنەوەی بیرە کرد، کاتژمێر بوو بە یەکی شەو دووانیان خەوتن و دوانەکەی تر خۆیان ڕووت کردەوە و کاتێکی زۆر خەریکی یەکتربوون و نێربازییان دەکرد.

ئەوەی ئەو دیمەنەی بەچاوی خۆی بینی دەڵێ: جەژن بوو من و چەند هاوڕێیەکم بەسەردان چووینە ئەوشارە،وە هۆکاری بینینی ئەو دیمەنەش ئەوەیە کە زۆر گەڕاین بەدای هۆتێل و مۆتێلەکان بەڵام هەموویان گیرابوون، ئێمەش بەناچاری چووینە ئەو پارکە و ئەو دیمەنەمان بینی .

جگەلەوە ...

زۆرجار نێربازی لەلایەن ئەو کەسەی کە لەگەڵی دەکرێ دەبێتە خوو و ناتوانێ تەرکی بکات، جا ئەو کەسە ئەگەر خێزانداریش بێ و تەمەنیشی زۆر بێ .

برایەك گوتی: ڕۆژێکیان بەتەنها لە چایخانەیەك دانیشتبووم و خەریکی چا خواردنەوە بووم، پیاوێکی بەتەمەن هاتە تەنیشتم دانیشت، داوای چای کرد و چای بۆهات و لەکاتی چا خواردنەوەدا دەستی بەقسە کردن کرد لەگەڵم،

هەندێ قسەی ئاساییمان کرد، لەکاتی قسەکردن دا جارجار دەستی دەگرتم و کەمێکیش ڕای دەگوشی .
دوای کەمێك دانیشتن لەناکاو دەستی ماچ کردم، منیش زۆر سەیرم پێهات ئەو پیاوە بەتەمەنە بۆ دەستی من ماچ دەکات ؟!!،
بەسەرسامیەوە لێیم ڕوانی !!، گوتی: هەرچیت دەوێ بۆت دەکەم بەس وەرە و ئەو کارە ( نێربازی) م لەگەڵ ئەنجامبدا، واللە دەزانم ئەوکارە حەرامە بەڵام پێم تەرك ناکرێ، ئەگەر جارجار کەسێك ئەو کارەم لەگەڵ نەکات شێت دەبم ...
منیش سەرم سەڕما بوو ئەو پیاوە بەتەمەنە !!،
کەمێك پێش ئێستا شەرمم لێ دەکرد قسەی لەگەڵ بکەم، ئێستاش چی دەبینم و چی دەبیستم !!
بەڕاستی شۆك بووم لەبەر ئەوەی نەك پیاو بیرم لەکردنی ئەوکارە لەگەڵ ئافرەتیش نەکردبۆوە بە حەرامی .
بە پیرە پیاوەکەم گووت: تۆ خێزان و منداڵت هەیە ؟ گوتی : بەڵێ هەمە و کچم هەیە شووی کردووە و کوڕیشم هەیە خێزاندارە.
گووتم : ئەدی خێزانەکەت دەزانن تۆ ئەو کارە دەکەی ؟ گوتی : نەخێر نازانن.
گووتم : بۆچی وازلەو کارە ناهێنی ؟، گوتی : چەند جارێك هەوڵم داوە بەڵام تا ئێستا نەمتوانیوە وازی لێبهێنم، ئێستاش داوات لێدەکەمەوە بێ بچینە شوێنێکی گونجاو تا ئەو کارەم لەگەڵ بکەی، ئەگەر ئەوەم لەگەڵ بکەی منیش لەبەرامبەردا پارە و هەرچیت دەوێ پێتی دەدەم، وە ئەگەر بە بەردەوامیش لەگەڵم بکەی هەرچیت بوێ بۆتی جێبەجێ دەکەم.

دەڵێ منیش گوتم : نا ... من لەو جۆرەکەسانە نیم ئەوکارە پیس و قێزەونە بکەم و پەروەردگاریش لەخۆم بڕەنجێنم، بەڵام مامە ئەوە بزانە کە خوای گەورە ڕقی لە پیری داوێن پیس دەبێتەوە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ :- **( الشَّيْخُ الزَّانِي)**

واتە:- پیری داوێن پیس خوای گەورە ڕقی لێیەتی.

دەڵێ هەندێ ئامۆژگاری ترم کرد و جێمهێشت، بەڵام قسەکان و داواکاریەکەی لەگەڵ من هات و ناتوانم لەبیریان بکەم .

## لەڕووی زانستی زیانەکانی نێربازی GAY چیە ؟

سێکس لەڕێگای کۆمەوە دەبێتە هۆی تووشبوونی بەکتریا جۆراوجۆرەکان ، هەروەها دەتوانین بڵێین مەترسی تووشبوون بە نەخۆشیە گواستراوەکانی سێکسی (STIs) زیاتر بکات ،چونکە پێست لەکاتی سێکس کردنی کۆم زیاتر ئاو دەردەدات وەك لە سێکس کردن لە پێشەوە ( زێ ) بۆیە دەرفەتی زیاتر بۆ بڵاو بڵاوبوونەوەی (STIs) هەیە.

نمونەی ئەمانە بریتین لە (chlamydia, gonorrhea, hepatitis, HIV, and herpes ) زۆربەی زۆری ئەم ڤایرۆسانە دەکرێ نەخۆشی درێژ خایەن بن، چونکە زۆرێك لە (STIs) چارەسەریان نیە بە پێی ناوەندی کۆنترۆڵ و نەهێشتنی نەخۆشی (CDC) ، (According to the centers for disease control and preventi (CDC)

سێکسی کۆم بەرزترین مەترسی هەڵسوکەوتی سێکسییە بۆ گواستنەوەی "HIV بە بەراورد لەگەڵ شێوەکانی تری سێکس،وەك سێکس لەڕێگای پێشەوە ( زێ ) یان لەڕێگای دەمەوە.

ئەو کەسەی سێکسی لەڕێی کۆمەوە لەگەڵ دەکرێ مەترسی تووشبوونی بە ( HIV) ١٣ جار زیاترە لە کەسی بکەر ( واتا ئەو کەسەی کارەکەی لەگەڵ دەکات ) [١].

## حوکمی نێربازی لەئیسلامدا چیە ؟

نێربازی یەکێکە لەکارە هەرەقێزەونەکانی سەرزەوی و لە گوناهە زۆر گەورەکانە و نەفرین(لعنة)ی خوای لەسەرە، هیچ تاوانێك نەبووە سزایەکەی گەورەتر بێت لە دونیا وەکو لەم تاوانە ئەمەش ئەگەر بگەڕێینەوە لای قورئان پەروەردگار باسی قەمێکی سەرەڕۆ و لووت بەرز و تاوانکار دەکات کە کارو پیشەیان نێربازی و داوێن پیسی بووە ، وە لەسزای ئەوەشدا خوای گەورە شارەکەیانی بەرزکردەوە تا مەلائیکەتەکان لەئاسمان گوێیان لە وەڕینی سەگەکانیان بوو پاشان شارەکەی هەڵگێڕایەوە بەسەریاندا و سەراوژێر و دواتر بەردبارانی کردن.

١ (MEDICAL NEWS TODAY )

پەروەردگار دەفەرموێ : { وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ(٨٠)إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِنْ دُونِ النِّسَاءِ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ مُسْرِفُونَ( ٨١) وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَنْ قَالُوا أَخْرِجُوهُمْ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ( ٨٢ ) فَأَنْجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ( ٨٣ ) وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ( ٨٤)}

واتە :[وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ][١]

وە (لوط)یش – علیه السلام- کە (کوڕی هارانی کوڕی ئازەر) بوو، برازای ئیبراهیم بوو – علیه السلام - لەگەڵ ئیبراهیمی مامیدا لە زەوی عێراق کۆچیان کرد بۆ (بیت المقدس) خوای گەورە کردی بە پێغەمبەر وە ناردی بۆ دێی (سەدوم) نزیك (بیت المقدس) و دەوروبەری، بە قەومەکەی خۆی فەرموو: ئایا ئێوە بەدڕەوشتی و نێربازی ئەکەن کە لە پێش ئێوەدا هیچ کەسێك نەبووە لەناو ئوممەتان و نەتەوەکانی تردا ئەم ڕەوشتە ناشرینە بکات.

[إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِنْ دُونِ النِّسَاءِ] ئێوە ئەڕۆن شەهوەت و ئارەزووی خۆتان بە پیاوان تێر ئەکەن کە پێچەوانەی عەقڵ و فیتڕەتی پاکە وە واز لە ئافرەتەکان دێنن کە خوای گەورە بۆ ئێوەی دروست کردوون [بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ مُسْرِفُونَ ] بەڵکو ئێوە قەومێکن زیادڕەوی و دەستدرێژی ئەکەن لە تاواندا.

---

[١] - سورەتی الاعراف ئایەتی ٨٠ - ٨٤

[وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَنْ قَالُوا أَخْرِجُوهُمْ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ] وەڵامی قەومەکەی ئەوانەی ئەو بەدڕەوشتی و خراپەکاریەیان ئەکرد هیچ شتێك نەبوو تەنها ئەوە نەبێ کە گوتیان: لوط و شوێنکەوتووانی لە شارو دێی خۆتان دەرکەن لەبەر ئەوەی ئەمانە کەسانێکن خۆیان بەپاك ڕائەگرن لەو داوێن پیسیە بۆیە نابێ لەگەڵ ئێمەدا نیشتەجێ بن.

[فَأَنْجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ] خوای گەورە ئەفەرمووێ: خۆی و کەسوکاریمان ڕزگار کرد چونکە کەسی تر ئیمانی پێ نەهێنا بوو جگە لە خانەوادەکەی خۆی، وە تەنها خێزانەکەی نەبێ چونکە باوەڕدار نەبوو سزا ئەویشی گرتەوە، وە کاتێ (لوط) میوانی بهاتایە ئەڕۆیی خەڵکەکەی ئاگادار ئەکردەوە لە میوانەکانی (لوط) بۆ ئەوەی بێنە سەریان، ئەو ئافرەتەیش لەناو ئەو کەسانە مایەوە کە لەناو سزای خوای گەورەدا بوون وە سزای خوای گەورە گرتنیەوەو لەناوی بردن.

[وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ] خوای گەورە بارانێکی بۆیان نارد کە بەردی تیابوو بەرد بارانی کردن دەی بزانەو تەماشا بکە سەرەنجامی تاوانباران چۆن بووە.

وەك هەمیشە جاران و ئێستاش کەسانێك هەن و بانگەشەی ئەوەدەکەن کە بڕوا بەخواناکەن و پەیامبەرانیش بەدرۆ دەخەنەوە، جگە لەوەش ئێستا ئەو کەسانە بەشێکیان هاوڕەگەزبان یان منداڵەکانیان هاوڕەگەزبان و بەو کردەوە قێزەونە ڕازین و هیچ دژایەتییەکی ناکەن ئەوەش لەژێر ناوی ئازادی و حەزی کەس و کەسایەتییەکان، دەربارەی ئەوانەی وەکو ئەوانە کە بڕوایان بە

خوا پاشان بە پێغەمبەرەکانیان نەهێناوە و ڕازیبوونە بەو جۆرەکردەوانە و ئەمجامدەری ئەو جۆرە کردەوانە پەروەردگار دەفەرموێ:- { كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ ( ١٦٠ ) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ( ١٦١ ) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ( ١٦٢ ) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ( ١٦٣ ) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ( ١٦٤ ) أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ( ١٦٥ ) وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ( ١٦٦ ) قَالُوا لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ ( ١٦٧ ) قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ الْقَالِينَ ( ١٦٨ ) رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ( ١٦٩ ) فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ( ١٧٠ ) إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ ( ١٧١ ) ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ ( ١٧٢ ) وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ ( ١٧٣ ) }

واتە : { كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ ( ١٦٠ ) } قەومی لوطیش بڕوایان بە پێغەمبەران نەکرد.

{ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ( ١٦١ ) }کاتێک (لوط) ی برایان پێی وتن: باشە ئەوە ئێوە لە خوا ناترسن.

{ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ( ١٦٢ )}بە ڕاستی دڵنیابن کە من فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان...

{ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ( ١٦٣ ) } کەوابوو لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری من بکەن

{ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ( ١٦٤ ) } من داوای هیچ جۆرە پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری، من تەنها پاداشتی خۆم لە پەروەردگاری جیهانەکان دەخوازم.

{ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ( ١٦٥ ) }ئایا لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا ئێوە بە شوێن نێرینەدا دەگەڕێن و دەتانەوێت ئارەزووی جووت بوون لەگەڵ ئەواندا جێبەجێ بکەن؟.

{ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُمۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ( ١٦٦ )} وازیش دەهێنن لە هاوسەران و هاوجووتانی خۆتان کە پەروەردگارتان بۆی دروست کردوون،بەڵکو ئێوە هەر قەومێکی نالەبار و بەدڕەوشت و نارەسەنن

{ قَالُوا لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ ( ١٦٧ ) } تاوانباران وتیان: ئەی لوط، ئەگەر کۆڵ نەدەیت لە دەربەدەر کراوان دەبیت.

{ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ الْقَالِينَ ( ١٦٨ ) } لوط وتی: بەڕاستی من بێزارم لە کارو کردەوەتان و نەفرەتی لێدەکەم و بێدەنگ نابم.

{ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ( ١٦٩ ) } ئەوسا کە نائومێد بوو لێیان، نزای کردو وتی: پەروەردگارا خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگار بکە لەو کاروکردەوانەی ئەمانە دەیکەن.

{ فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ( ١٧٠ )} جا ئێمەش نزامان گیرا کرد و خۆی و ماڵ و خێزانیمان هەمووی ڕزگار کرد...

{ إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ ( ١٧١ ) } جگە لە پیرەژنێک (کە هاوسەری بوو) لە تیا چووەکان بوو (چونکە باوەڕی بە پەیامەکەی نەبوو)

{ ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ ( ١٧٢ )} لەوەودوا ئەوانی ترمان ڕیشەکەن کرد

{ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًاۖفَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ }[١] بەسەختیش بەرد بارانمان کردن، ئای کە خراپ و سەخت و دژوارە بارانی بێدارکراوەکان.

وە لە سورەتی هود پەروەردگار ئاماژەیەکی تر بەو قەومە دەدات و دەفەرمویٚ:
{ وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ }[٢]
کاتێکیس وەفدی فریشتەکانی ئێمە هاتنە لای لوط، نارەحەت بوو پێیان، زۆر دڵتەنگ بوو (چونکە لە شێوەی چەند لاوێکی پێکەوتوودا هاتبوون، لەدڵی خۆیدا) وتی: ئەمە ڕۆژێکی سەختە (منی تێکەوتووم).

{ وَجَاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِۚ قَالَ يَا قَوْمِ هَٰؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْۖفَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِي ضَيْفِيۖأَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ }[٣]
هۆزەکەشی بەبیستنی هاتنی ئەم میوانانە، بەپەلەو بێ شەرمانە کشان بۆ لای، پێشتریش کردارە خراپەکانیان دەکرد، (کاتێك لوط ئەم دیمەنە ناشیرینەی بینی) وتی: ئەی خزمەکانم ئائەوانە کچەکانمن و ئەوان پاك و خاوێنن بۆ ئێوە (وەرن لەناو هۆزدا کێتان بە دڵە بەشێوەیەکی شەرعی و ڕەوا لێتان مارە بکەم)

[١] - ( ١٧٣ ) الشعراء
[٢] - ( ٧٧ ) هود
[٣] - ( ٧٨ ) هود

جا لە خوا بترسن و شەرمەزارم مەکەن لەناو میوانەکانمدا، ئایا پیاوێکی ژیرو مەردتان تێدا نیە (کە لە کاری ناڕەوای ئاوا جڵەوگیری بکات)؟!

{ قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ}[١]

ئەوانیش بێ شەرمانە وتیان: سوێند بەخوا بەڕاستی تۆ دەزانیت ئێمە هیچ حەقێکمان نیە بەکچەکانی تۆوە، بێگومان تۆش دەزانیت ئێمە چیمان دەوێت!

{ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ }[٢]

لوط وتی: خۆزگە بەڕاستی هێزێکم دەبوو لە خۆتان (بۆ بەرامبەری ناپاکەکانتان) یان پەنایەکی بەهێزم دەست دەکەوێت و دەرۆیشتم بۆی (تا تۆڵەتان لێ بکەمەوە و تەمێتان بکەم).

{ قَالُوا يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوا إِلَيْكَ ۖ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا امْرَأَتَكَ ۖ إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ ۚ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ ۚ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ }[٣]

میوانەکان وتیان: ئەی لوط بەڕاستی ئێمە فریشتەی نێرراوی پەروەردگاری تۆین، ئەو تاوانبارانە هەرگیز ناگەنە لات (تابتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر ئێمە) و جا تۆ خاوو خێزانت لەبەشێکی شەودا دەربکەو کەس لە ئێوە لانەکاتەوە و ئاوڕ نەداتەوە، جگە هاوسەرەکەت (کە لاسارەو بەگوێت ناکات)

[١] - (٧٩) هود
[٢] - (٨٠) هود
[٣] - (٨١) هود

چونکە بەڕاستی ئەو سزایەی کە تاوانبارانی گرتۆتەوە ئەویش دەگرێتەوە، بەڕاستی کاتی سزاکەشیان لە بەرەبەیاندایە، ئایا بەرەبەیانی ئەمشەو نزیك نیە ؟!

{ فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ}[1]

واتە:- جا کاتێ فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوونیان هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرەو ژوور کرد و بە قوڕی سوورەوەکراوی وەك بەرد چین لەسەر چین بەردبارانمان کردن .

{ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ۖ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ }[2]

واتە:- هەموو ئەو بەردانە دیاری کراو بوون، لە لایەن پەروەردگارتەوە (کە بدات بەسەر تەوقە سەری کێدا) ئەم کارەسات و ئەم بەرد بارانەش وەنەبێت زۆر دوور بێت لە ستەمکارانەوە (لە هەموو سەردەمێکدا، کاتێك ڕۆدەچن لە تاوانکاریدا).

لە ڕوح المعانی للالوسی ١٧٢/٨ دا هاتووە دەڵێ : بەردبارانکردنیان بەجۆرێك بوو کە هەموویانی گرتەوە بازرگانێك چووبوو بۆ حەرەم ، ئەو بەردەی ناوی ئەوی لەسەر بوو چل ڕۆژ وەستا تا کابرا گەڕایەوە لەسەفەرەکەی و بەردەکەی بەرکەوت و کوشتی.

[1] - ( ٨٢ ) هود
[2] - ( ٨٣ ) هود

وە لە فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتووە دەربارەی ئەو تاوانە فەرموویەتی: ( لَعَنَ اللَّهُ مَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ ، لَعَنَ اللَّهُ مَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ ، ثَلاثًا )[1]

واتە: نەفرەتی خوا لەسەر ئەوەی کاری گەلی لوط پێغەمبەر علیه سلام ئەنجام دەدات، نەفرەتی خوا لەسەر ئەوەی کاری گەلی لوط پێغەمبەرعلیه سلام ئەنجام دەدات سێجار ئەوەی دووبارە کردەوە.

سزا و حەددی نێرباز و ئەوەش نێربازی لەگەڵ دەکرێ کوشتنە،پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ)[2]

واتە: ئەوەی بینیتانەوە کردەوەی گەلی لوط دەکات، بیکوژن بکەر و ئەوەشی کارەکەی لەسەر کراوە.

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوکەسانە ناگرێتەوە کە بەزۆر نێربازییان لەگەڵ کرابێ وەك منداڵ، بەڵکو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بەئارەزووی خۆیان ئەو کارە دەکەن و سروشتی پیاوەتیان گۆڕیوەو شوێنی ئافرەتانیان گرتۆتەوە .

لەسەر چۆنیەتی کوشتنەکەش زانایان ناکۆك بوون لەبارەیەوە، هەندێکیان فەرموویانە دەبێ بسوتێندرێ ئەویش بەبەڵگەی ئەوەی کە کاتێك خالیدی کوڕی وەلید لەناوڕێگایەکدا کابرایەکی بینی نێربازی لەگەڵ دەکرێت، ئەویش

---

[1] - رواه أحمد

[2] - رواه الترمذي و أبوداود وصححه الألباني فه صحيح الترمذي.

نامەی نارد بۆ ئەبو بەکری سدیق و ئەویش ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد تا چی لێبکرێ، جا وتەی ئیمامی عەلی لەهەموان توند تر بوو فەرمووی: تەنها یەك نەتەوە ئەم کارەی کردووە و دەشزانن خوای گەورە چی بەسەر هێنان، من وای دەبینم دەبێ بەئاگر بیسوتێنرێت،جا ئەبوبەکریش نامەی نارد بۆ خالید و سوتاندیان.

عبداللهی کوڕی عەباس ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێ : دەبرێتە سەر بەرزترین جێگا و بینای ئەو شار و لادێیە و لەوێوە بە پشتا فڕێ دەدرێتە خوارەوە، پاشان بەردباران دەکرێت.

جا هەریەکە و ڕایەکی هەیە لەسەر ئەوە جا بەکوشتن بێ یان بەردبارانکردن یان سوتاندن یان مل پەڕاندن یان دیوار ڕوخان بەسەریدا، وە لە قیامەتیش ئەگەر تۆبەی نەکردبێ بە سزای ئاگری دۆزەخ تۆڵەی لێ دەسەندرێتەوە.

## ٢- ( lesbian ) ژن وژن یا کچ وکچ .

**LESBIAN چیە؟** : بە زۆری ئاماژە بۆ ژنێك دەكات كە ئاراستەیەكی ڕۆمانسی و سێكسی هەیە بەرامبەر بە ژنان.[١]

یەكەم باسی lesbianisem لە مێژوودا لە كۆدی حەمورابی دا هاتووە كە یاسای بابلی لە دەوروبەری ساڵی (١٧٠٠ )پ. ز كە ڕێگەی بە ژن داوە هاوسەرگیری لەگەڵ یەكتر بكەن

وشەی " lesbian " لە ناوی دوورگەی لێبۆسی یۆنانییەوە هاتووە ، كە Sappho سافۆی لێ لە دایك بووە . Sappho ژنێكی یۆنانی كۆن بوو كە هۆنراوەی نووسی بوو كە بابەتی هاوڕەگەزخوازی لەخۆ دەدا چەمكی "sapphic," " سافە " كە بۆ ئەم شاعیرە ناونراوە ، هەروەها ئاماژە بە هاوڕەگەزبازی مێینەش دەكات .[٢]

هەروەها ئەم جۆرە سێكس كردنە تەنها لەنێوان ئافرەت و ئافرەت ڕوودەدات، ئەم جۆرەیان ئێستا تاڕاددەیەك كەمە بەڵام بەهۆی كردنەوەی ئەو هەموو دەرگایەی بەدڕەوشتی و بیرنەكردنەوەی خێزانەكان لەم شتە پیسە ( واتە كاتێ كچێك و كچێك بەیەكەوە بن كەس بیر لەوە ناكاتەوە كەكارێكی لەم جۆرە لەنێوانیان ڕووبدات ) بەهۆی ئەو جۆرە بیركردنانەوە دڵنیام ئەنجامدانی ئەو كارە بەردەوام ڕوو لەزیاد بوون دەكات، وە ئافرەتانیش زیاتر ئاڵوودەی دەبن و سەرەنجامیش وایان لێدێت كە حەزیان بۆ پیاوان نەمێنێ و بیر و هۆشیان تەنها بۆ ڕەگەزی خۆیان بچێ بۆ ئەنجامدانی كاری جووتبوون.

[١] https://www.vanderbilt.ed

[٢] / https://www.webmd.com

کوڕێك بۆی گێڕامەوە و گوتی: من پەیوەندی خۆشەویستیم لەگەڵ کچێك دروست کرد، سەرەتا زۆرم خۆشدەویست تا ئەو ڕاددەیەی کە خۆم یەکلا کردەوە بۆ ئەوەی بیکەمە هاوژین و دایکی منداڵەکانم.

دەڵێ: ڕۆژێکیان تەلەفۆنی بۆکردم و چوینە دەرەوە، لەڕێگادا داوای ئەوەی لێم کرد بچینە شوێنێکی چۆڵ بۆ ئەوەی بەتەنها بین، منیش بردمە مەزرەعەی ماڵی هاوڕێیەکم کە کلیلی دەرگاکەم دەزانی لەکوێیە و شارەزابووم.

لەوێ زۆرشت ڕوویاندا کە من بیری ئەو شتانەم نەکردبۆوە لەگەڵی ئەنجامی بدەم تا دوای هاوسەرگیری، بەڵام ئیدی هۆکاری سەرەکی ئەو بوو کە تووشی داوێن پیسی کردم.

دوای ئەو ڕۆژە خۆشەویستی ئەوکچە لەدڵم نەما و لەبەر چاوم کەوت، ئەو پەیوەندییە خۆشەویستییە بوە پەیوەندییەکی سێکسی لەلای من .

وە ئەو کچە لەمن زۆر پەرۆشتر بوو بۆ سێکس کردن، بۆیە چەند جارێك ئەو کارە لەنێوانمان دووبارە بویەوە، بەهۆی زۆردووبارەبوونەوەی ئەو کارە من ئیدی بێزار بووم و بڕیارم دا وازی لێبهێنم.

شەوێکیان تەلەفۆنی کرد و هەندێك قسەی سێکسی و ئاسایمان کرد لەناو قسەکان گوێم لەدەنگی ئافرەتێك بوو، زۆرم لاسەیر بوو!!، لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژە ئەو کچە قسەکانی زۆربەی سێکسی بوون کە دەیکرد، قسەکانمان تەواو کرد و پرسیاری ئەو دەنگەم نەکرد کە گوێم لێبوو، وە بۆ بەیانیش بڕیاری دەرچوونمان دا بۆ ئەوەی دووبارە بچینەوە هەمان مەزرەعە و بەتەنها ڕابوێرین.

ئێمە وا ڕێك كەوتبووین كەهەموو جارێك دوای تەواو بوونی قسەكانمان ئەو كچە مۆبایلەكەی لەسەر مێزی تەنیشت سیسەمەكەی دادەنا تا دەخەوت ودواتریش من مۆبایلەكەم دادەخست، بەڵام ئەو شەوە دوای ئەوەی وەكو هەموو شەوێك مۆبایلەكەی دانا من دامنەخست و گوێم شل كرد چەند چركەیەك هیچ دەنگێك نەهات، كەویستم دایبخەم ئەو كچەی لەلای بوو دەنگی هات و دەستیان بە قسان كرد. دوای چەند قسەیەك هەستم كرد !!!!!!، ئەوە چی دەبیستم ؟؟؟؟،ئایا ئەوان سێكس دەكەن ؟؟،دوای كەمێك گەشتمە ئەو باوەڕەی كە ئەو دوو كچە بەیەكەوە سێكس دەكەن. دوای ئەوەی مۆبایلەكەم داخست بە سەرسامییەوە خەوتم، بۆ بەیانی كە بەیەكەوە ڕۆشتینە شوێنی مەبەست پێش ئەوەی جلەكانی دابكەنێ پێم گووت : ئەو كچە كێ بوو ئەمشەو لەگەڵی ڕات دەبوارد؟، كە ئەو قسەیەم كرد زۆر شڵەژا، سەرەتا قسەكانی منی ڕەت كردەوە، بەڵام من زیاتر قسەم كرد تا بە قسەم هێنا و ڕاستییەكانی پێ گوتم. منیش پێیم گوت: ڕاستییەكان چی بوو ؟؟

گوتی: ئەو كچەی من پەیوەندیم لەگەڵی بەستابوو ، لەگەڵ ئەو كچەی هاوڕێی، پەیوەندی خۆشەویستییان هەبوو.

گوتم: چۆن ؟!!

گوتی: ئەو دوو كچە هەردووكیان لە قسم داخلی بوون كاتێك كە بەیەكەوە دەیانخوێند، وە ئەو شوێنەی لێی بوون ئەنتەرنێتی هەبوو، ئەوانە لەگەڵ چەند كچێكی هاوڕێی لەیەك ژوور دەخەوتن، وە ئەو دووكچەش لەنزیك یەكەوە دەخەوتن و بەیەكەوەش سەیری مۆبایلیان دەكرد، تادرەنگانی شەو، وە ئەو

شتەی سەیریشیان دەکرد بریتی بوو لە ڤیدیۆی بەدڕەوشتی، لەبەر زۆر سەیرکردنیان هەردووکیان ئاڵوودەی ئەو گرتانە بوون، تا گەشتە ئەو ڕاددەیەی کە لاسایی ئەوان بکەنەوە لەشێوازی ماچ کردن و دەستدانە سنگی یەکتر و مژینی سنگی یەکتر، ئەمەش دوای ئەوەی کە کچەکانی تر دەخەوتن، دوای ماوەیەك بەو شێوەیە بەردەوام بوون گەیشتە ئەو ڕاددەیەی کە بەتەواوی خۆیان ڕووت دەکردەوە و دەستیان بە هەموو شوێنێکی یەکتر دادەهێنا و ئارەزووی یەکتریان دادەمرکاندەوە، وە چەند جارێکیش نەچووبوون بۆ دەوام بە هۆکاری نەخۆشی و دوای ئەوەی هاوڕێکانیان دەڕۆشتن ئەوان سێکسیان ئەنجام دەدایەوە. جا ئەوەی زۆر سەیرتر بوو گووتی: کچەکەی هاوڕێی شووی کردبوو و منداڵیشی هەبوو، ئەوجا هاتبووە لای ئەو کچەی هاوڕێی و کاری سێکسییان ئەنجام دەدا، ئەوان ئاڵوودەببون و هاوڕەگەز بازبوون .

ئەو کوڕە لەکۆتایی قسەکانیدا گووتی: لەو کاتەوە من ئێستا وازم لەو کچە هێناوەو لەجیاتی ئەو هاوسەرێکی باشم دۆزیوەتەوە و خەریکی خۆڕێکخستن و ماڵ دانانم، وە شێوازی ژیانم گۆڕیوەو نامەوێ جارێکی تر لەگەڵ هیچ کچێك پەیوەندی ببەستم ئیتر خەریکی ژیانی خۆم و خێزانم دەبم.

بەڵێ بەڕێزان ئەو دووکچە چۆن وایان لێهات و بوونە هاوڕەگەزباز ؟، بێگوومان یەك شت ئەویش سەیرکردنی پۆرن و شێوازەکانی و گرتە ڤیدۆیەکان بوو، نەك پەروەردەی ئیسلامی.

## لەڕووی زانستیەوە زیانەکانی لیسبین ( سێکسی ئافرەت و ئافرەت ) چیە؟

هەموو ئەو هەرزەکارانەی کە لە بواری سێکسییەوە چالاکن، مەترسی تووشبوونیان بە نەخۆشی گواستراوەی سێکسی (STI) هەیە.

ئەو کچانەی کە لەگەڵ کچان دا سێکس دەکەن دەتوانن (STIs) بەدەست بهێنن زۆر لە STIs دەتوانرێت لە هاوبەشێك بۆ هاوبەشێکی تر لە ڕێگەی سێکسی زارەکییەوە تێپەڕبکرێت.

ئەم lSTIs نە دەگرێتەوە:

-ڤایرۆسی بەرگری لەش (HIV)

-ڤایرۆسی پاپیلامی مرۆڤ (HPV)

-گێنتراڵ هێرپس نەخۆشیەکە لە ئەندامی زاوزێی ئافرەت Genital herpes

-سیفیلس Syphilis

-گۆنۆرهیا Gonorrhea

-کلەمیدیا Chlamydia

دەکرێت هەندێك نەخۆشی لە ( STIsو HPV) لەپێستەوە بۆ پێست وە لەڕێگای ماچ بگوازێتەوە یان بە دەست لێدان لە کۆئەندامی زاوزێی ئافرەت HPV بگوازێتەوە بۆ کەسی بەرامبەر.[١]

**لە ئیسلامدا ...**

ئیسلام قەدەغەی کردووە کە پیاو و ئافرەت لەیەك پێخەفدا کۆببنەوە و جل و بەرگیان لەبەر نەبێ ئەوەتا

پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێ :- **{ لَا يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلَا الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ، وَلَا يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَلَا تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ}**[٢]

واتە: با پیاو تەماشای شەرمگای یەکتری نەکەن و هیچ نێرینەیەکیش لەگەڵ یەکێکی تردا لەیەك پۆشاك دا یان لەیەك پێخەفدا بەڕووتی کۆنەبنەوە هەروەها، ئافرەتیش لەگەڵ ئافرەتێکی تردا لەناو یەك پۆشاك و یەك پێخەف بەڕووتی کۆنەبنەوە.

ئەوانەی ( lesbian ) ژن و ژن یا کچ و کچ بەیەکەوە سێکس دەکەن، ئەگەر حوکمی ئیسلام هەبێ ئەو جۆرەکەسانە لەلایەن دادوەرەوە بەند دەکرێن و تەمێ دەکرێن و دوای ئەوە ئازاد دەکرێن، وە لەئەگەری دووبارەکردنەوەدا ئەوا

---

[١] https://www.acog.org/womens-health

[٢] - مسلم

دادوەر ئەمجارەیان بەندیان دەکات و لەژووری تاکەکەسیدا ماوەیەکی درێژ تر دەیانهێڵێتەوە تا ئەو کاتەی تەوبەیەکی ڕاستەقینە دەکەن و بەڵێنی نەگەڕانەوە دەدەن بۆ ئەم کارە پیس و ناشایستەیە.
لەبەر ئەو جۆرە ڕەفتارانەیە کە ئیسلام قەدەغەی کردووە لەوەی کە ئافرەت پۆشاکی داکەنێ جگە لەماڵی خۆی و مێردی.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **( مَا مِن امْرَأَةٍ تَضَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا ؛ إِلَّا هَتَكَتِ السِّتْرَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ رَبِّهَا )**[1]
واتە: هەر ئافرەتێ پۆشاکی خۆی جگە لەماڵی مێردی خۆی دابنێ، وە لەوێ لەبەر خۆی بکاتەوە، ئەوا پەردەی شەرمی لە نێوان خۆی و خوای گەورە پچڕاندووە.
ئیسلام پاکە و پاکی نەبێ قبوڵی ناکات و شوێنێکی نییە بۆ پیسی ، وە تەندروست ترین پرۆگرامە کە بەکەڵکی مرۆڤ بێ و لەگەڵ فیترەتی مرۆڤ یەکانگیربێ و هیچ گۆشەیەکی جێنەهێشتووە جێگەی پرسیار و گومان بێ بەڵکو هەمووی ڕۆشنە و هیچ تاریکی و نەنگیەکی تێدا نادۆزرێتەوە.

[1] - سنن الترمذي

## ٣- خووی نهێنی ( دەستپەڕ) :

بێگومان ئەوکەسانەی کە ئاڵودەی ئەو جۆرە گرتەسێکسیانە دەبن بەڕێژەیەکی زۆر بەرز تووشی ئاو هێنانەوە بەدەست دەبن، لەبەر ئەوەی لەکاتی سەیرکردندا ئارەزووی کەسەکە دەچێتە ئەوپەڕی ،بۆیە بۆ دامرکاندنەوەی ئەو ئارەزووە پێویستی بەهۆکارێکە، وەتاکە هۆکاری خێراش بریتییە لەخوی نهێنی.

خوی نهێنی زۆرجار سەردەکێشێ بۆ زینا و کەسەکە بەرەو هەڵدێر و بێئاگای دەبات و لەپاکێتی دایدەڕنێ.

جاران ئاو هێنانەوە بەدەست تەنها لای پیاوان باو بوو بەڵام ئێستا ئافرەتانیشی گرتۆتەوە و خوویان بەم کارە گرتووە.

جا بیرۆکەیەکی هەڵە لەنێو گەنجەکان هەیە دەڵێن : ئێستا ئێمە ئەوکارە ئەنجام دەدەین و دوای هاوسەرگیری دەستی لێ هەڵدەگرین و وازدێنین، ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیە لەبەر ئەوەی خووی نهێنی کەسەکان ئاڵوودە دەکات و وای لێ دەکات کە دوای هاوسەرگیریش بیری لێبکاتەوەو ئەنجامی بدات.

ئەوەتا کەسێك لەڕێگەی ماسنجەرەوە باسی خۆی دەکات و دەڵێ : من لەتەمەنی ١٧ ساڵییەوە ئاڵودەی پۆرنم و لەگەڵ ئەو ئاڵودەبوونەش ئاڵودەی ئاو هێنانەوە بەدەست بووم.

تەمەنم گەیشتە ٢٢ ساڵ و هاوسەرگیریم کرد، ئێستا تەمەنم ٢٨ ساڵە و هێشتا سەیری پۆرن دەکەم و تا ئێستاش هەر خەریکی ئاو هێنانەوەم

بەدەست، وە خاوەنی منداڵیشم و هاوسەرەکەشم کەمتەر خەمی نەنواندووە بەرامبەرم بەڵام هێندە زۆر ئاڵوودەبوومە ناتوانم دەستی لێ هەڵبگرم، لەهەمان کاتیشدا کەسێکی موسڵمانم و دەشزانم ئەو کارە حەرامە بەڵام ناتوانم وازی لێبهێنم.

برایەك بەسەرهاتی برادەرێکی لەلاگێڕامەوە و گووتی : هاوڕێیەکم هەیە ئاڵوودەی پۆرن و دەستپەڕ بووە ، بەجۆرێك ئاڵوودە بووە کە لەڕێگا یان بەوێنە یان بە ڤیدیۆ هەرکچێکی جوان ببینێ خۆی پێناگیرێ و بەپەلە خۆی دەگەیەنێتە شوێنێکی چۆڵ و خوی نهێنی ئەنجام دەدات.

ئەوەی کە زۆر سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوەبوو گووتی : ئەو هاوڕێیەم چەند جار لە مرافقی مزگەوتەکان خووی نهێنی ئەنجام داوە .

کەسێکی تر ئەوەندە ئاڵوودەی پۆرن و خووی نهێنی ببوو، ڕۆژێکیان لەژوورێکدا لەماڵی خاڵی دەستدرێژی کردبووە سەر کچەخاڵەکەی و کێشەیەکی گەورەی کۆمەڵایەتی لێکەوتبۆوە.

ئێستا بابزانین دەستپەڕ (خوی نهێنی– الاستمناء– العاده السریه - Mastarbution) ، وەزیانەکانی و چارەوسەری و حوکمەشەرعییەکەی چییە ؟

دەستپەڕ ( خوی نهێنی ) : بریتییە لەئاو لەخۆ هێنانەوە و خۆ ڕەحەت کردن بەدەست .

وە هەندێ کەس لەگەڵ کردنی ئەم کارەدا بیر لەکەسێك دەکاتەوە کە حەز بەسێکس کردن بکات لەگەڵی جا لەهەر ڕەگەزێ بێ، وە ئەم کارەش دوای باڵغ بوون دروست دەبێت.

لەڕووی زانستییەوە زیانەکانی چین ؟

ئەوانەی کە زۆر ئەو کارە ئەنجام دەدەن و ڕۆژانە خوویان پێوە گرتووە تووشی چەندین زیانی جەستەیی دەبن، لەوانە ...

* بۆ کوڕان ...

-زوو ئاو هاتنەوە لەکاتی سەرجێیدا، بەمەش ناتوانێت مافی خۆی و هاوسەرەکەی بە تەواوی بدات.

-لە دەستدانی زاکیرە و شت بیر چوونەوە .

-نەمانی چێژی سێکسی لەکاتی جووتبووندا، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەنجامدانی ئەوکارە هەستی پێستی چووك لەناودەبات و چێژ ناهێڵێت.

-تووش بوون بە لاوازی کردەی سێکسی پێش هاوسەرگیری.

-ئەوانەی کە زۆر ئەم کارە ئەنجامدەدەن لە کاتی ژن هێناندا دوچاری ئەوە دەبنەوە کە ئاویان نەیەتەوە بە جووت بوون چونکە ئەو بە شێوازێکی تر ڕاهاتووە.

-هەندێك لەو کەسانە زەکەریان هەڵناسێت بۆ جووت بوون لەگەڵ ژنەکەیدا.

-ئەم کارە هۆکارێکە بۆ توشبوون بە نەخۆشی فەقەرات.

-خوی نهێنی(دەستپەر) پەیوەستە بە دوورە پەرێزی و نا ئومێدی.

-ئەنجامدانی خوی نهێنی(دەستپەر) بەڵگەیەکە لەسەر بوونی گرفتی دەروونی یان کۆمەڵایەتی یان خەمۆکی.

-لە ساڵی ٢٠١٠ زانایەکی بەریتانی بەراوردێکی ئەنجام دا لە نێوان جووت بوون لەگەڵ ئافرەت و لە نێوان خووی نهێنی(دەستپەڕ)، بۆی دەرکەوت:

أ- تەندروستی دەروونی و جەستەیی لەکاتی ئەنجامدانی جووت بوون لەگەڵ ئافرەت ئێجگار زیاترە.

ب- پەیوەندی نێوان خوی نهێنی(دەستپەڕ) و جووت بوون کراوەیە و پێچەوانەیە لەگەڵ تەندروستی جەستە و دەروونی تاکەکان![١]

*ئەنجامدانی خوی نهێنی لەتەمەنی بیست بۆ سی ساڵی فاکتەرێکی مەترسیدارە بۆ توشبوون بە شێرپەنجەی پرۆستات لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا.

[١]-سەرچاوە:The relative health benefits of different sexual activities .

* خووی نهێنی ئارەزووی جوتبوون تێرناکات بەڵکو تەنها شەهوەتەکە دادەمرکێنێتەوە.

*لە توێژینەوەیەکی زانستی کە ساڵی ٢٠٠٦ بڵاوکرایەوە توێژەران بۆیان دەرکەوت کە دەرهاویشتە بوونی هۆرمۆنی پرۆلاکتین لە کاتی ئەنجامدانی خوی نهینی(دەستپەر) زۆر کەمترە لەوەی کە هەیە لە کاتی جووت بوونی پیاو و هاوسەرەکەی، ڕێژەی دەرهاویشتەی لەکاتی جووت بوون ٪٤٠٠ وەك لە خوی نهینی(دەستپەر)(واتا ٤ هێندە)!! کە پیویستە لە کاتی هەست کردن بە تێربوونی ئارەزوو لە ڕێگەی کاریگەری کردنە سەر کۆئەندامی دەمار.[١]

- لەوانەیە دەستپەڕی زۆر تووند ببێتە هۆی سووتانەوەو برینداربوونی پێست و گۆڕینی ڕەنگەکەی.

-ئەو کەسانەی ئەو کارە ئەنجام دەدەن دەناڵێنن بە دەست لاوازی ڕەق بوونی ئەندامی نێرینەیان.

## *بۆ کچان ...

-ئەنجامدانی ئەوکارە بۆ کچان دەبێتە هۆی نەزۆکی .

- بەردەوام بوون لەسەر ئەنجامدانی دەبێتەهۆی گەورەبوونی زێ، ئەمەش هۆکارە بۆ کەمبوونەوەی چێژی جووتبوون لەلای ئافرەتان.

---

[١]- سەرچاوە: The post-orgasmic prolactin increase following intercourse is greater than following masturbation and suggests greater satiety.

-وە دەبێتەهۆی تووند بوونی پەردەی کچێنی کە لەشەوی بوکێنی بە زەحمەت لادەچێ و سەرەنجام ئازارێکی زۆری دەبێت بۆ کچەکە.
-لە توێژینەوەیەك کە ساڵی ٢٠٠٢ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەنجامدراوە توێژەران بۆیان دەرکەوتووە کە پەیوەندی ڕاستەوانە هەیە لە نێوان تووش بوونی ئافرەتان بە نائومێدی و لە نێوان ئەنجامدانیان بۆ خوی نهێنی (دەستپەڕ)، ئەو ئافرەتانەی کە تووشی نائومێدی بوون چێژێکی زیاتر دەبینن لە خوی نهێنی (دەستپەر).[١]

## لە ڕوانگەی شەرعەوە...

مەسەلەی خوی نهینی لە نێوان زانایان بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ نییە کە بوترێ حەرامە، ئەوەی کە هەیە تەنها ئیجتیهادی زانایانە لەسەر بابەتەکە، ئیمامی (شەوکانی ) لە باسی ئەو بابەتە دەفەرمووێت هیچ حەدیسێکی صەحیصحی لەسەر نییە وە ئیمامی الشیخ البانی و ابن کەسیر دەفەرموون ئەو حەدیسانە صەحیح نین کە لەسەر ئەو بابەتە هاتوون، وە ئیمامی شافعی خوای لێ ڕازی بێت ئەو ئایەتەی کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەو بابەتە کە حەرامە کە دەفەرمووێ:
**{وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٥) إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (٦) فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ (٧) }**[٢]

[١] - سەرچاوە: Sexual functioning and self-reported depressive symptoms among college women
[٢] - المُؤْمِنُونَ

واتە: وە ئەو کەسانەی کە دامێنی خۆیان ئەپارێزن لە حەرام تەنها مەگەر بۆ خێزانەکانی خۆیان نەبێ کە ڕێگەیان پێدراوە یاخود پێشتر کەنیزەك و جاریە هەبووە ئەویش ڕێگە پێدراو بووە لەم دوو شتەدا لۆمە ناکرێن وە تاوانبار نابن. بەڵام ئەگەر کەسێك جگە لە خێزان و کەنیزەکەکان دامێنی خۆی نەپارێزێ ئەوانە سنووریان بەزاندووەو دەستدرێژیکارو تاوانبارن (ئیمامی شافعی ئەم ئایەتە دەکاتە بەڵگە لەسەر حەرامێتی خوی نهێنی).

کەواتە پەروەردگار فەرمان بە پیاوان دەکات کە ئەو ئاوەی ( تۆوی) پیاوان تەنها دەبێ لەلای خێزانەکانیان دابنێن و بە شێوازێکی تەندروست حەزەکانیان دابمرکێننەوە.

وە هەروەها ئەگەر دامرکاندنەوەی شەهوەت بە دەست یان دەرهێنانی مەنی بە دەست لەلایەن کوڕ و کچانەوە دروست و ڕێگە پێدراو بوایە و پێغەمبەری خوا بەباشی بزانیبایە ئەوە بێگومان ئەو جۆرەی بە چارەسەر دادەنا بۆ گەنج و لاوەکان تا ئەنجامی بدەن، بەڵام بەهیچ شێوازێك بەباشی نەزانیوە،نەك بەباشی نەزانیوە هەتا لەکاتە نالەبارەکانیش ئەو ڕێگەیەی نیشان نەداون بۆنمونە : لەکاتی جیهاد کردن کە موجاهیدان لەماڵ و حاڵیان دووربوونە بۆ چەند مانگ، یان کاتێك کەسێك توانای ژن هێنانی نەبووبێت و ئەو ڕێگەیەی نیشان دابێت نەخێر بەڵکو ئەو ڕێگایە بە خەڵکەکەی نیشان دەدات کە ڕێگەیەکی تەندروستە و ئیمانیشیان پێی زیاد بکات نەك ڕێگەیەك کە جەستەیان بێهێز و بێتاقەت بکات، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی ڕاست و

دروست بە خەڵکەکەی نیشان دەدات و دەفەرمووێ : **(یا معشر الشباب، من استطاع منکم الباءة فلیتزوج، فإنه أغض للبصر، وأحصن للفرج، ومن لم یستطع فعلیه بالصوم، فإنه له وجاء)**[1]

واتە: ئەی چینی گەنجان هەر کەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە ئەوا با ژن بێنێت، چونکە ژن هێنان چاو دەگرێتەوە لە نەزەر کردن و قەڵایەکیشە بۆ عەورەت و دەیپارێزێت، وە هەر کەس توانای ژن هێنانی نی یە ئەوا با ڕۆژو بگرێت چونکە ڕۆژو دەبێتە پارێزەر بۆی. لەبەر چی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕێگەیەی بە گەنجان و لاوان نیشان دەدات؟؟!!.

لەبەر ئەوەی ئەگەر هەر کەسێك لەپێناوی خوادا ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت ئەوا خوای گەورە بەهۆی ئەم ڕۆژووەوە دەم و چاوی حەفتا ساڵ لە ئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە، بەڵام نیشاندانی هەر ڕێگەیەکی تر ئەوکاتە زیانێکی زۆر بەکەسەکە دەگەیەنێ هەم لەڕووی جەستەیی و هەم لەڕووی دەروونی.

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ :- **( مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ؛ إِلَّا بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا )**[2]

واتە :- هەر کەسێك لەپێناوی خوادا ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت ئەوا خوای گەورە بەهۆی ئەم ڕۆژووەوە دەم و چاوی حەفتا ساڵ لە ئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە.

---

[1] - صحیح البخاری ( کتاب النکاح )

[2] - مسلم

کەواتە ئەو گەنجانەی کە توانای ژن هێنانیان نییە دەبێ ئەو ڕێگەیە بگرنەبەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ نیشانی داوە بۆ ئەوەی خێر و پاداشتێکی گەورە بەدەست بهێنن وە دەبێ ئارام بگرن تا خوای گەورە دەرگای خێریان لێدەکاتەوە .

زانایانیش ئەنجامدانی خوی نهێنیان بە حەرام داناوە، تەنها ئەگەر کەسەکە لە زینا بترسێت ئەوە (سهل ) ئاسانترە ئەویش بۆ ئەوەی نەکەویتە ناو زیناوە، بەو مەرجەی کەسەکە لە کۆمەڵگایەکی زۆر خراپ و فاسد

بێت و توانای ژن هێنان و بەڕۆژووبونی نەبێت و وە لە خۆشی بترسێت ئەو کاتە ڕێگەپێدراوە ئەوکارە بکات- واللە اعلم .

## چارەسەر...

-باشترین چارەسەر ئەوەیە کە کەسەکە لەجێگەی بیرکردنەوەی لەو خووە بیر لەشتی باشتر و بەسوودتر بکاتەوە و دوور بکەوێتەوە لەو شتانەی کە هۆکارن بۆ تووشبوون بەم کردەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێ :- **(إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ)**[1]

واتە :- ئیماندار بەهۆی خوی جوانەوە دەتوانێ بگات بە پلەی پیاوێ بەڕۆژ بەڕۆژوو بە شەو شەو نوێژ ئەنجام بدات.

کەواتە خوە پیسەکەت بگۆڕە بە خووی باش بەم ڕێگایانەی خوارەوە.

-دووركەوتنەوە لە ڤیدیۆ و وێنەیەکی ووروژێنەر .

---

[1] - سنن أبي داود

-زۆر یادی" خودا" کردن و ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵ و بەڕۆژووبوون و گەڕان بەدوای زانست.

تێکەڵ بوونی زیاتر لەگەڵ خەڵکی باش و دوورکەوتنەوە لە تەنهایی .

- زوو ژن هێنان و شووکردن . پەیامبەرمان ﷺ دەفەرمووێ: (يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنْ اسْتَطَاعَ منكُم الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ )[١]

واتا : (ئەی کۆمەڵی گەنجان هەرکەس لە ئێوە توانای هاوسەرگیری هەیە با هاوسەرگیری بکات چونکە چاو دەپۆشێت و قەڵغانە بۆ داوێن...

ئەوەی کە ناتوانێت با بە ڕۆژوو بێت؛ چونکە ڕێگرە بۆی).

ئەمەش بۆ ئەوەی شەهوەتی لە حەلاڵدا بەتاڵ بکاتەوە.

-دەبێ بزانی ئەنجامدانی ئەو کارە حەرامە و تاوانە.

-ئەگەر ژنیان پێنەهێنرا ئەوا دەبێت ڕۆژووی سوننەت زۆر بگرن، بۆ ئەوەی شەهوەتیان بشکێنێت.

-خۆ پارێزی لەو شوێنانەی کە پیاو و ئافرەتی نامەحرەم تێکەڵاون و نەزەری تیا ئەنجامدەدرێت.

-هەڵبژاردنی هاوڕێی چاك و لەخواترس و دوورکەوتنەوە لە هاوڕێی خراپ.

-داوای یارمەتی لەخوا بکە بۆ دوورکەوتنەوە لەو کارە .

-خوێندنی زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و پێش نوستن .

[١] - رواه البخاري

-دەپرسم ئەیا ئەگەر لەکاتی ئەنجامدانی خوی نهێنی برایەکت یان باوکت یان دایکت یان هەر کەسێکی تر لەسەر ئەو حاڵەتە بتبینێ چ هەستێکت دەبێ؟؟؟!!

بێگومان شەرم و شەرمەزاری و دڵتەنگی و هەندێ جاریش ئابڕووچوون.

ئەدی هەست بەچی دەکەی کە هەرجارێك ئەوکارە ئەنجام دەدەی خوا سەیرت دەکات و تۆش شەرمی لێناکەیت ؟؟

ئەدی ئەگەر لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە مردی چی ؟؟؟!!.

کەواتە تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکە بۆ ئەوەی خوا لێت خۆش ببێت، بێ ئومێد مەبە لە بەزایی و لێخۆشبوونی پەروەردگار چونکە پەروەردگار دەفەرمووێ: **[قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ]** (ئیبنو عەبباس) دەفەرمێت: کەسانێك لە هاوبەشبڕیاردەران خەڵکیان کوشتبوو بە زۆری، وە زینایان کردبوو بە زۆری، هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان ئەی محمد ﷺ ئەوەی تۆ دەیڵێیت و بانگەوازی بۆ دەکەیت شتێکی چاکە بەڵام پێمان بڵێ: ئایا ئەو تاوانانەی کە پێشتر کردوومانە دەسڕێتەوەو خوا لێمان خۆش دەبێت؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: ئەی محمد ﷺ بەو بەندانەم بڵێ کە ئیسراف و زیادڕەویان کردووە لە تاوان و سەرپێچیدا:

بێئومێد نەبن لە ڕەحمەتی خوا **[إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا]** بەدڵنیایی خوای گەورە لە هەموو تاوانێك خۆش ئەبێ تەنها هاوبەش دانان نەبێت بۆی ئیتر لە هەموو تاوانێکی تر خۆش ئەبێت، (ئەمە ئومێدبەخشترین ئایەتە لە کتابی خوای گەورە، وە صەحابە زۆر دڵیان پێی خۆش بووە)، وە (ئەم ئایەتە

بانگکردنی سەرجەم کافران و تاوانبارانە بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، وە ئەوەی تەوبە بکات چەندێك تاوانی زۆر بێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، وەکو ئەو کەسەی کە سەد کەسی کوشت و تەوبەی کردو خوای گەورە لێی خۆش بوو)، (ابن عباس) دەفەرمێت: (هەرکەسێك لە پاش ئەم ئایەتە خەڵکی بێئومێد بکات لە تەوبە ئەوا باوەڕی بە قورئانی پیرۆز نیە) [إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ][1] وە بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەڕەحم و بەزەییە.

[1] - [سورة الزمر: (٥٣)]

## ٤-مرۆڤ و ئاژەڵ :

لەناو ئەوگرتانەدا پیاو و ئافرەتی تێدایە کە سێکس لەگەڵ ئاژەڵان دەکەن، جا کەسی سەیرکەر بەتایبەت ئەگەر خێزانی نەبێت هەوڵی ئەنجام دانی دەدات و حەزی دەچێتە ئاژەڵ بۆ جووتبوون .

کەسێك ساڵی ٢٠١٤ گوتی: کاتێ سەیری ئەو گرتە سێکسیانەم دەکرد شەهوەتم دەیجووڵاندم، منیش بۆ ئەوەی شەهوەتەکەم بەتاڵ کەمەوە دەچوومە لای ( بزن ، مەڕ ، گوێ درێژ ) ، هەرکاتێ بچووبامایە لای یەکێکیان هەر چوار قاچیم دەبەست بۆ ئەوەی نەتوانێ بجوڵێ و لێنەگەڕێ ئەو کارەی لەگەڵدا بکەم، وە دوای ئەوەی سێکسم لەگەڵ ئەو ئاژەڵە دەکرد قاچەکانیم دەکردەوە و هەڵم دەستاندەوە و دەمبردەوە ناو ئاژەڵەکانی تر .

## لەڕووی زانستیەوەزیانەکانی سێکس کردن لەگەڵ ئاژەڵ چیە؟

بەپێی توێژینەوەیەکی نوێ ئەو پیاوانەی لە ژیانیاندا سێکسیان لەگەڵ ئاژەڵدا کردووە دوو هێندەی کەسانی تر مەترسی زیاتریان لەسەرە بۆ تووشبوون بە شێرپەنجە لەڕێی کۆئەندامی زاوزێیان.

توێژینەوەکە لەسەر ٤٩٢ کەس کراوە لەسەر پیاوان لە گوندێکی وڵاتی بەڕازیل کە لە ٪ ٣٥ ی بەژدار بووان تەمەنیان لەنێوان ١٨ – ٨٠ ساڵە نەخۆشی شێرپەنجەی ئەندامی زاوزێیان هەبووە،ئەو پیاوانە لە ماوەی ژیانیاندا سێکسیان لەگەڵ ئاژەڵ ( SWA ) دا کردووە .

وە ئەو پیاوانەی کە لەگەڵ ئاژەڵەکان سێکسیان کردووە، هەروەها راپۆرتیان داوە لەسەر زیاتر بوونی نەخۆشییە گواستراوەکانی سێکسی.

لە ۱۱۸ نەخۆشی شێرپەنجەی پێنجەڵ، ٪ ٤٥ ڕاپۆرتیان داوە کە سێکسیان لەگەڵ ئاژەڵدا کردووە، بە بەراورد بە ٪ ۳۲ پیاوانی تەندروست، کە سەردانی ئەو بنکەیە پزیشکیانەیان کردووە بۆ حاڵەتی باش و پشکنین یان پێشگیری لە شێرپەنجە، ٪ ٥٩ ئەو پیاوانەی کە لەگەڵ ئاژەڵدا سێکسیان کردووە، بۆ ماوەی یەک تا پێنج ساڵ ئەو هەڵسوکەوتەیان کردووە، لە کاتێکدا لە ٪ ۲۱ی ئەو هەڵسوکەوتە بەردەوام بوون.

ئەو ئاژەڵانەی کە لەلایەن پیاوەکان بە پێی کات بەکار دەهێنران ، بریتی بوون لە سێکس کردن لەگەڵ( مار ، مانگا ، بەراز و مریشك ، وە ئاژەڵەکانی تریش) .

بە گوێرەی کۆلێژی یاسای زانکۆی ویلایەتی میشیگان، سی ویلایەتی ئەمریکا بە پێی یاسای دڵڕەقی ئاژەڵان، یاساییان داناوە کە پەیوەندی سێکسی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ قەدەغە دەکەن.

زەکی دەربارەی ئەو توێژینەوەیە گوتی، ئێمە پێمان وایە کە ڕاهێنانی چڕ و درێژخایەنی SWA دەتوانێت لە شانەی پێنی مرۆڤدا تراومایەکی بچووك بەرهەم بهێنێت «ئەندامی زاوزێی پەردەی ئاژەڵەکان دەتوانێت تایبەتمەندیی جیاوازی لە ئەندامی زاوزێی مرۆڤ هەبێت، ئەگەری زۆرە ڕازەکانی ئاژەڵەکان جیاواز بێت لە شلەی مرۆڤ، ئەو ڕونیکردەوە کە ڕەنگە شانەی ئاژەڵ کەمتر نەرم بێت لەئێمەو ئەو نهێنیانەی نامرۆڤ ( ئاژەڵان ) بۆ ئێمە ژەهراوی دەبن "

تۆبیاس کۆهلەر، پزیشکی میزناسی زانکۆی ئیلینۆی باشور کە لە توێژینەوەکەدا بەشدار نەبوو، گوتی: توێژینەوەکە زۆر بە توندی بووە زانیاریمان زیاد دەکات لەسەر خۆپاراستن لە شێرپەنجە و داتای مەترسیمان دەداتێ.

کۆهلەر گوتی : لەکاتی سێکس کردن لەگەڵ ئاژەڵدا SWA ئەوکاتە مەترسیەکە زیاتر دەبێت کە «زێی ئافرەت تایبەتمەندیی شێدارکردنی هەیە، کە ڕێگە لە برینداربوونی پێون دەگرێت، لەگەڵ ئاژەڵەکان، تۆ مەترسی زیاترت هەیە بۆ ترامای بچووك، وەک برین و ڕووشان وە پاشان هەر نەخۆشییەک لەوێ بێت، وەک بەکتریا و ڤایرۆس زیاتر دەبێتە هۆی کێشە و تووشبوون بە نەخۆشیە جۆراوجۆرەکان.

کوهلەر گوتی ئەوە " بە تەواوی پەسەندە " کە میکرۆئۆرگانیزمەکان لە کاتی سێکس لەگەڵ ئاژەڵدا پێشکەشیان دەکەن ، دەتوانن ببێتە هۆی شێرپەنجەی ئەندامی زاوزێ ، بە هۆکاری ئەوەی کە ڤایرۆسی پاپیلۆما ( HPV ) ی مرۆڤ دەبێتە هۆی شێرپەنجەی کۆم و زەکەر ئەو ئەوەی خستەڕوو کە شێوازی ژیانی ئەو پیاوانەی کە لەگەڵ ئاژەڵدا سێکس دەکەن، دەتوانن هۆکار بن بۆ دروست بوونی نەخۆشیەکە.

زەکی گوتی: کە ئەو سەرسام نەبوو بەوەی کە لە ٪ ٣٥ ی بەشداربووان لەگەڵ ئاژەڵدا سێکسیان کردووە، ئێمە دەزانین کە لە ناوچە گوندنشینەکانی وڵاتەکەمان و ڕەنگە لە ئاستی جیهاندا، گەنجان ئەزموونی سێکسییان لەگەڵ ئاژەڵی ماڵیدا هەبێت .

زەکی گوتی: ئەو پیاوانەی لە وڵاتانی پێشکەوتوودا لەگەڵ ئاژەڵدا سێکس دەکەن، بە زۆری هەژار و نەخوێندەوارن، کە کەم تا زۆر دەست گەیشتن بە پاکوخاوێنی و چاودێری تەندروستی و ئینتەرنێتیان نییە .

توێژینەوەیەك کە لە ئەرشیفی هەڵسوکەوتی سێکسیدا لە ساڵی ٢٠٠٣ بڵاوکراوەتەوە، پشکنینی بۆ دیمۆگرافیای ١١٤ کەس لە ئاژەڵە خۆپێناسەکانی ئەمریکا، ئوسترالیا، نیوزیلەندا و ئەوروپا کردووە، ڕاپرسییەکی سەرهێڵیش ئاشکرای کردووە کە لە٪٣٦ لەشارە گەورەکان دا ژیاون و لە ٪ ٨٣ یان دەرچووی کۆلێژن یان چەند کۆلێژێکی تەواوکردووە . لە ٪ ٤٥ بەشداربوان بەئینفۆرماتیك یان تەکنەلۆژی کاریان کردووە و هەندێکیان داهاتی بەرزیان دەستکەوتووە

زەکی گوتی : SWA هەڵسوکەوتێکی سێکسی نییە کە تەنها بۆ دانیشتوانی لادێی هەژار سنووردار بێت" لە ڕاستیدا ئەوە ئەمڕۆ نیگەرانییەکی تەندروستی زۆر گەورە دەکات تەنها چەند کلیکێك بدە بە سایتەکانی گەڕان لە ئینتەرنێتدا و تۆ لە چەندین سایتی 'باخچەی ئاژەڵان' یان کۆمەڵگە مەجازیەکان دەچیتە سەر باشترینی، کە زۆربەیان وێنەی پۆرنۆگرافین و هەندێك جاریش بە وێنەی خراپەوە"

توێژینەوە نوێیەکە لە ڕۆژی ٢٤ ی مانگی ١٠ لە گۆڤاری پزیشکی سێکسیدا بە ئۆنلاین بڵاو کرایەوە[١]

[١] https://www.livescience.com/ کەمێ دەستکاری و ڕێکخستن

## لەئیسلام دا ...

ئەنجامدانی ئەو کارە قێزەونە مرۆڤ لە فیترەتە پاکەکەی دادەڕنێ و دەیهێنێتە خوار ئاستی ئاژەڵ، وەناخ و کەسایەتیەکی ئابڕووبەر و پیسیش بەکەسەکە دەدات، وە ئەو کەسە ئاست نزمانەی ئەو کارەدەکەن پێویستە لە لەناو ببرێن لەکاتی ئەنجامدانی کارەکە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ :

**( مَنْ أَتَى بَهِيمَةً فَاقْتُلُوهُ وَاقْتُلُوهَا مَعَهُ )** [1]

واتە:- کەسێ بچێتە لای چوارپێیەك بۆ خراپەکردن لەگەڵی دا ئەوا خۆی و چوارپێیەوەکە لەگەڵیدا بکوژن.

[1] - سنن أبي داود

## ٥- دروست بوونی کەسی هاوڕەگەزباز BISEXUAL:

**BISEXUAL یان BI:** کەسێکە کە راکێشانی سێکسی بۆ هەردوو ڕەگەز هەیە، رۆمانتیك، فیزیکی، یان رۆحی ، مەرج نییە لە یەك کاتدا، بە هەمان شێوە، یان بۆ هەمان پلە.

کەسی هاوڕەگەزباز حەز بەسێکس کردن دەکات لە هەموو جۆر و چینە کەسێك جا خۆی بیکا یان لەگەڵی بکرێت.

جا ئەو کەسە خێزاندار بێ یان سینگڵ بێ ، یان لەهەر قۆناغێکی تەمەنی بێ گوێی پێنادا ، گرنگترین شت لای تەنها حەزە سێکسیەکەیەتی و دەیەوێ حەزەکانی تێربکا جابە هەر نرخێ بێ.

ئەوەی من ئاگادارم ماوەیەکی باشە ئەم جۆرە کەسانە پەیدابوون و سێکس لەگەڵ هەردوو ڕەگەز دەکەن، بێ گوێدانە هیچ جۆرە مەترسیەك و لێکەوتەی دوای ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارانە.

## مەترسیەکانی سەرهاوڕەگەزبازان چین ؟

لە سایتی CDCبەم شێوەیە باسی هاوڕەگەز بازەکان دەکات: بەشێوەیەکی گشتی گای، دووڕەگەز، و پیاوانی تر کە لەگەڵ پیاوان (MSM) جووتن نوێنەرایەتی ی کۆمەڵگەیەکی زۆر جۆراوجۆر دەکەن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پیاوانە بە شێوەیەکی نارێک بە هۆی سیفیلس و HIV و نەخۆشیە گواستراوە سێکسییەکانی ترەوە ( STDs ) کاریگەریان هەیە .

شیکاری نوێی cdc ئاگاداری هاوڕەگەزباز، دووڕەگەز و پیاوانی تر دەکات کە سێکس لەگەڵ پیاوان (MSM) دەکەن کە مەترسی زیاتریان لەسەرە و نەخۆشیەسێکسیەکانیان لە زیادبووندان بۆ نەخۆشی کۆئەندامی زاوزێ (واتە کلامیدیا یان گۆنۆرە لە قورگ یان کۆم) .

توشبوونی زۆرێك لە نەخۆشیەکانی STD لە هاوڕەگەزباز، دوو ڕەگەز، و پیاوانی تر کە سێکس لەگەڵ پیاوان (MSM)-دا دەکەن،لەوانە سیفیلسی سەرەتایی و لاوەکی (P&S) و گۆنۆرەی دژەمیکرۆبی-بەرگری-گەورەترە لەو راپۆرتانەی کە لە ژنان و پیاواندا بڵاوبوونەتەوە کە تەنها لەگەڵ ژندا (MSW) سێکس دەکەن

جگە لە کاریگەرییە نەرێنییەکانی نەخۆشی چارەسەر نەکراوەکانی STD ، نەخۆشیەکەی لێ قورستر دەبێت ، چونکە ڕەنگە ئاماژە بە مەترسی زۆر بکات بۆ تووشبوونبە ڤایرۆسی HIV کە دواتر هەیە.

زیادبوونی ساڵانە لە حاڵەتەکانی STD راپۆرتکراو لەوانەیە ڕەنگدانەوەی زیاد بوونی ڕێژەی ڕەفتارەکان بێت کە هەردوو نەخۆشی STD و HIV دەگوازێتەوە، وە هەبوونی STD مەترسی دەستکەوتن یان گواستنەوەی HIV. زیاد دەکات

## سیفەتی کەسی هاوڕەگەزباز...

* لەهەموو کات و لە هەموو شوێنێك بیر لەکردنی خراپە و تاوان دەکەنەوە جا لەکاتی بینینی نێرینەبێ (( گەورە و بچووك )) یان لەکاتی بینینی مێینە بێ .

* سیفەتی بەرازیان هەڵگرتووە کە تاکە ئاژەڵە نێربازی دەکات جگە لەو هیچ ئاژەڵێکی تر ئەو کارە ئەنجام نادات، کەتواتە دەتوانین بڵێین ئەو کەسانە لەڕووی شەرم و هەوەسەوە سنووری ئاژەڵیشیان بەزاندووە .

* پەروەردگار قەومی "لوط"ی ناو بردووە بە " فاسِقین" لەڕێ دەرچووان " مُسرفون " ڕۆچووان " مُفسِدین" خراپەکار و تێکدەران "ظالِمین" ستەمکاران

* کەسانێکی دەروون لاواز و نەخۆشن، وە ووشك بونەتەوە لەشەرم و حەیا و دڵۆپێکیان تێدا نەماوە.

* بەردەوام بیر لەچێژ وەرگرتن و ڕابواردن لەو شوێنە پیس و قێزەونە دەکەنەوە، کە ئەمەیان دەبێتە هۆی دروستبوونی دەستدرێژی بۆ سەر منداڵ و کەسانی بێهێز، وەئەگەر کار لەگەڵ کراو بی بەدوای کەسانێك دادەگەڕێ تا ئەوکارە پیس و قێزەونەی لەگەڵدا ئەنجام بدەن، هۆکارەکەشی ئەوەیە ئەو کەسانە لە فیترتی پاکی مرۆڤایەتی لایانداوە کە پەروەردگار لەسەری دروستی

کردوون، وە کەسێك لە فیترەتەپاکەکەی لابدا بێگومان ئەوکاتە هەموو سنوورەکان دەبەزێنێ .

* کەسانی هاوڕەگەزباز بە ئاسانی ناتوانن دەست بەرداری ئەو کارە پیس و قێزەونە بن .

* زیاتر هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسانی وەکو خۆیان دەکەن تا ئاسانتر ئەو کارە پیسە ئەنجام بدەن و هیچ ڕێگریەك نەیەتە پێشیان .

* هاوڕەگەزباز گوێ بە ئابڕوو چوونی خێزانەکەی نادات.

* هەندێکیان پارە بەو کەسانە دەدەن تا لەگەڵیان بکرێ وە هەندێکیشیان پارە دەدەن تا ئەنجامی بدەن .

* تەنها لەخەمی تێرکردنی ئارەزووەکانیانن و هیچی تر .

* شوێن بۆخۆیان دابین دەکەن بۆ کۆبوونەوە و یەکتر ناسین ،وە هەروەها هەوڵی ڕاکێشانی کەسانی تریش دەدەن و دواتر تووشکردنیان و فێرکردنیان بەم کارە پیس و قێزەونە . خوای گەورە پەنامان بدات .

## ٦- گۆڕینی ڕەگەز Transgender :

T ڕەگەزگۆڕین چیە؟

ڕەگەز گۆڕین : ئەوەیە کە پیاوێك ڕەگەزی خۆی دەگۆڕێ بۆ شێوەی ئافرەت هەر لە جل و بەرگ و مکیاژ و پرچ و بەرز و نزمی سینگ و شوێنەکانی تر، وە بۆ ئافرەتیش بە پێچەوانەوە شێوەی وەکو پیاو لێدەکات.[١]

بابەتی ڕەگەزگۆڕین لەناو ئێمەدا نەبۆتە دیاردە ، بەڵام کەم کەمێ دەبینین و دەبیستین کوڕێك ماکیاژ دەکات یان کچێک سەری وەکو پیاو و جل و بەرگی وەکو پیاوان لەبەر کردووە .

ڕەگەزگۆڕەکان زۆرجار کوڕن بەڵام لە ڕووی دەروونیەوە لە جەستەی خۆیان ڕازینین و ئاواتی کچ بوون دەخوازن بۆیە ئەوانە هەوڵ دەدەن ڕەگەزیان بگۆڕن، جا کە ڕەگەزیان گۆڕی خۆیان لە پیاوان نزیك دەکەنەوە و هەڵسوکەوت و قسە وەکو ئافرەت دەکەن و پەیوەندی سێکسی لەگەڵ پیاوان دروست دەکەن.

وە هەندێکی تر لە ئافرەتان ئەو حەزەیان هەیەو ڕەگەزی خۆیان دەگۆڕن .

---

[١] https://www.vanderbilt.edu

زۆرجار لە ڕۆژنامە یان تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دەبینی پیاوێك بەڕیشەوە و بە قژێکی کورتەوە وێنەی بڵاوکراوەتەوە و دووگیانە، لەڕاستیدا ئەوە ئافرەتە و ڕەگەزی خۆی گۆڕیوە.

یان ئافرەت دەبینی سنگی گەورەیە ( مەمکی هەیە ) و لە خوارەوەش زەکەری هەیە، بێگومان ئەوەشیان پیاوەو ڕەگەزی خۆی گۆڕیوە و داوێن پیسی لەگەڵ پیاو و ئافرەتدا دەکات .

لەڕووی زانستیەوە زیانەکانی وەکو نێربازی و لیسبێنەکانە ، وە لەڕوانگەی ئیسلامیشەوە بەهەمان شێوە.

## ٧- پەنا بردن بۆ سێکسی زارەکی :

وەك باسکرا جۆری سێکسەکان جیاوازە، بۆ نمونە ( نێربازەکان، لیس بێنەکان، هاوڕەگەز بازەکان ...تاد) هەمویان لەڕێی کۆم یان زێی ئافرەت  یان زەکەی پیاو یان سێکسی زارەکی ( لەڕێی مژین و دەم ) سێکس دەکەن.

وەلەناو موسڵمانانیش ئێستا ئەوکارانە بڵاوبۆتەوە ئەوانەی کە لەڕێی زیناوە ئەوکارە ئەنجام دەدەن، جا هەندێ جار کوڕ و کچێکن کوڕەکە نایەوێ لەڕێی زێی کچەکەوە سێکس بکات تا پەردەی کچێنی لەدەست نەدات، هانا بۆ سێکسی کۆم یان هانا بۆ سێکسی زارەکی ( مژین ) دەبات.

یان هەندێ جار هاوسەران بەمەبەستی زیاتر چێژی سێکسی، سێکسی زارەکی ئەنجام دەدەن ، جا لێرە پرسیار دروست دەبێ کە ئاخۆ ئەو جۆرە سێکس کردنە لەڕووی دین و زانستیەوە ڕێ پێدراوە؟ یان خۆیان بپارێزن و لێی دووربکەونەوە.

بێگومان ئەوجۆرە سێکس کردنە زیانی زۆر بە تەندروستی لەش دەگەیەنن و دەبنە هۆی دروست بوونی چەندین نەخۆشی،لەوانە (، syphilis, gonorrhea, Clamydia Gonorrhea، herpes,HIV,HPV) و چەند نەخۆشیەکی تر کە ئێستا باسیان دەکەین.

ئێمە لێرەدا سەرەتا باسێکی سێکسی زارەکی و دواتر نەخۆشی و زیانەکانی بەشێوەیەکی گشتی باس دەکەین.

## ئایا سێکس بە زارەکی ( oral sex ) چییە؟

سێکسی زارەکی:- بریتییە لە بەکارهێنانی دەم، لێوەکان، یان زمان بۆ ورژاندنی زەکەر ()، زێ (cunnilingus)، یان بە کۆم (anilingus) هاوبەشی سێکسی.

## ئایا سێکسی زارەکی چەندە باوە؟

بە شێوەیەکی گشتی لە لایەن پێگەیشتووانی چالاک لە بواری سێکسییەوە ڕاهێنانیان پێ کراوە. زیاتر لە ٨٥ ٪ ی ئەو هەرزەکارانەی کە لە بواری سێکسییەوە لە تەمەنی ١٨ - ٤٤ ساڵدا نوچەیان داوە و بە لایەنی کەمەوە جارێک لەگەڵ هاوبەشێکی ڕەگەزی بەرامبەردا سێکسیان کردووە . ڕاپرسییەکی جیا لەماوەی ساڵی ٢٠١١ بۆ ٢٠١٥ ئەنجامدراوە بۆی دەرکەوت کە ٪٤١ ی هەرزەکارانی تەمەن ١٥-١٩ ساڵ راپۆرتیانداوە کە سێکسی زارەکییان لەگەڵ هاوبەشێکی ڕەگەزی بەرامبەردا کردووە

## ئایا ( ORAL SEX ) سێکسی زارەکی زیانی هەیە بۆ تەندروستی مرۆڤ؟.

بێگومان ORAL SEX سێکس لەڕێی دەم زیانی زۆری هەیە بۆ مرۆڤ، لەوانە دەبێتە هۆی دروست بوونی چەندین نەخۆشی کە هەندێکیان بۆ مرۆڤ زۆر مەترسیدارن، نەخۆشیەکانیش (STD، Chlamydia، gonorrhea، syphilis ، Herpes، HPV، Trichomoniasis ) وە ڕەنگە زیاتریش هەبن.

## لێرەدا باسی چەند نەخۆشیەك دەکەین ...

### نەخۆشی یەکەم : STDs

STDs چیە ؟

بە نەخۆشیەگواستراوەکانی سێکسی ناسراوە و زۆر باوە، ساڵانە لە ئەمریکا ملیۆنان تووشبووی نوێ تۆمار دەکرێ .

## ئایا دەتوانرێت STDs بڵاوبکرێتەوە لەکاتی سێکس کردنی زارەکیدا؟

زۆر لە نەخۆشیەکانی STD، هەروەها توشبوونەکانی تر، دەتوانرێت لە ڕێگەی سێکسی زارەکییەوە بڵاوبکرێتەوە هەر کەسێك تووشی هاوبەشێکی تووشبوو بێت، دەتوانێت STD لە دەم، قورگ،زێ و زەکەر یان کۆتا دەرچەی کۆم دەست کەوێ.

مەترسی دەستکەوتنی STD لە سێکسی زارەکی، یان بڵاوکردنەوەی STD بۆ کەسانی تر لە ڕێگەی سێکسی زارەکیەوە، پشت بە چەند شتێک دەبەستێت، لەوانە:

STD ی تایبەت

کرداری سێکسی ئەنجام دراو

نەخۆشی STD زیاتر لەناو ئەوکەسانە بڵاوە کە هەمان ڕەگەزیان هەیە

ژمارەی ئەو کارە سێکسیە دیاریکراوانەی کە ئەنجام دراون

**بە گشتی:**

نەخۆشی (STDS) دروست دەبێ لە دەم یان قورگ، ئەویش بە پێدانی سێکسی زارەکی ( مژینی کۆم ) بە هاوبەشێك لەگەڵ توشبوێك بە نەخۆشیەکە لە کۆتا دەرچەی کۆم ، هەروەها نەخۆشی (STDS) بەڕێگەی دەمیش دەگوازرێتەوە گەر کەسەکە هەوکردنی دەم یان قورگی هەبێت، ئەمەش لەکاتی مژینی( زێ یان کۆم یان زەکەر) دەبێت، کاتی مژین نەخۆشیەکە لەو شوێنە دروست دەبێت و لەسەر پێست بڵاو دەبێتەوە.

هەروەها دەکرێت لە یەك کاتدا لە زیاتر لە ناوچەیەکدا STD هەبێت بۆ نموونە لە قورگ و شوێنە هەستیارەکانی لەش .

چەندین STD کە لەوانەیە بە هۆی سێکسکردنی زارەکییەوە بگوازرێتەوە دواتر دەتوانێت بە هەموو جەستەدا بڵاو بکرێتەوە ، ئەوانیش syphilis, gonorrhea, and intestinal infections) سیفیلس و گۆنۆرهێ و تووشبوون بە ڕیخۆڵە .

سێکس لەڕێی دەم ( یان سێکسی زارەکی لە ڕێی کۆم ) دەتوانێت ، ( Hepatitis A و B ) جۆرێکی نەخۆشیە تایبەتە بە جەرگ ، مشەخۆرەکانی ڕیخۆڵە وەک گیاردیا ( ، و بەکتریاکانی وەک E. coli و Shigella بگوازرێنەوە .

STDs دەکرێت بڵاوبکرێتەوە بۆ هاوبەشی سێکسی تەنانەت کاتێك کە هاوکارە تووشبووەکە هیچ نیشانەیەکی نەبێ .چونکە هەندێ جار توشبوو هیچ نیشانەیەکی نەخۆشی STDs لێ بەدەرناکەوێ .

## چی زیاد دەکات لە پێدانی STD لەڕێگەی سێکسی دەم؟ :

لەوانەیە هەندێك لە هۆکارەکان هەلی کەسێك زیاد بکەن بۆ بەدەستهێنانی HIV یان STDs لەکاتی سێکس کردنی زارەکی (دەم) دا ئەگەر تووشی هاوبەشێکی توشبوو بوو، وەک:

هەبوونی سیستەمێکی لاواز لەڕووی سێکسی دەمەوە ،وەکو پوکانەوەی ددان و نەخۆشیەکانی شەویلگە یان خوێن هاتن لە شەویلگە.

وە دەبێتە هۆی زوو ئاو ( زووتر ڕەحەت بوون ) هاتنەوە لەپیاودا، وە بوونی سۆرلە لە دەم یان لە جووتە گون .

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی نەکراوە بۆ ئەوەی دەربخەن کە ئایا ئەم هۆکارانە لەڕاستیدا مەترسی توشبوون بە HIV یان STDs لە سێکسی زارەکی زیاد دەکەن یان نا

**ئامار:**

ڕۆژانە لەسەرتاسەری جیهان ١ ملیۆن تووشبوی نوێ تۆمار دەکرێت،کە بە نزیکەیی لەساڵێکدا ٣٧٦ ملیۆن تووشبووی نوێ هەیە بە ١ لە ٤ STIs : کلەمیدیا یان گۆنۆرهیا یان سیفیلس یسن تریکۆمۆنیاسی ( ١ و ٢ ).[1]

[1] Who

## نەخۆشی دووەم : Chlamydia

Chlamydia چیە؟

کلەمیدیا : نەخۆشیەکی بەکتریایە بەزۆری لەڕێی سێکس بەشلەی ئەندامی توشبوو لە زەکەر یان زێ یان مژینی کۆم بڵاو دەبێتەوە.

### مەترسی تووشبوون بە سێکس لە دەمەوە:

کاتێ کەسێك ژن یان پیاو نەخۆشی **Chlamydia** ی هەیە و سێکسی دەم لەگەڵ بەرامبەر دەکات لەڕێی زەکەری گەر پیاو بوو یان زێی ئافرەت ، ئەوا کەسی بەرامبەر نەخۆشی **Chlamydia** ی لەڕێی دەمی بۆ دەگوازرێتەوە و گەرووی تووشی ئەم نەخۆشیە دەبێت.

یان کەسێیك نەخۆشیەکەی لە دەم و گەرووی هەبێت، کاتێ لێو و دەمی لە زەکەری پیاو یان زێی ئافرەت دەدات زەکەر یان زێیەکە نەخۆشیەکەی بۆ دەگوازرێتەوە.

### ناوچەکانی تووشبوونی سەرەتایی:

* گەروو

* شوێنە هەستیارەکانی لەش

* میز

* کۆتا دەرچەی کۆم

## نیشانە سەرەتاییەکانی تووشبوون:

زۆربەی توشبوونبەکەکانی کلەمیدیا لە گەروودا هیچ نیشانەیەکی نییە . کاتێك نیشانەکان ئامادە بوون، کەسەکە دەتوانێ هەست بە خورانی قورگی بکات.

زۆر بەی ئەوانەی کە نەخۆشیان هەیە هیچ نیشانەیەکیان نیە، کاتێك نیشانەکانی لێ بەدەر دەکەوێت ئەوکات دەبێتە هۆی تێکچوونی سیستەمی میزکردن و دەردانی خوێن لە گەڵی،وە هەست کردن بەئازار لەکاتی میزکردندا، هەستکردن بە ئازار لەکاتی مژینی گونەکان ، دەرچەی کۆم هەست بە ئازار دەکات لەکاتی فڕێدانی پاشەڕۆ

## ئەگەرکەسی تووشبوو چارەسەرووەرنەگرێ:

دەکرێت بڵاوبکرێتەوە بۆ هاوبەشەکانی سێکسی بێ توشبوو، بە تایبەت بە ئەنجامدانی سێکسی زارەکی لەسەر زەکەری هاوبەشی پیاو

ئەگەر کۆتایی دەرچەی کۆم چارەسەر نەکرا ئەوە بۆ کەسی بەرامبەر دەگوازرێتەوە

**لە ژناندا:**

دەکرێت ببێتە هۆی نەخۆشی هەوکردنی حەوزی ( PID ) ، کە دەبێتە هۆی ئازاری درێژخایەنی حەوز ، نەزۆکی و دووگیانی ئەکتۆپی واتا ( دووگیانی نائاسایی لە بۆریی فالۆپ یان لە شوێنێکی تری دەرەوەی سک ) .

وە لەسەرچاوەیەکی تردا :

دەتوانێت زیان بە کۆسیستەمی زاوزێی تۆ بشکێت ، ئەو ژنانەی کە نیشانەیان هەیە لەوانەیە تێبینی بکەن، نائاسایی زێ ، هەستێکی سوتاو ە لەکاتی میزکردندا[١]

## لە ژنانی دووگیاندا:

لەوانەیە ببێتە هۆی لەدایکبوونی پێشوەختە یان کێشی کەمی منداڵ لەکاتی لەدایکبوون دا،وە دەتوانرێت لەکاتی گەیاندندا ( سێکس کردندا) بڵاوبکرێتەوە بۆ منداڵەکە، هەروەها دەبێتە هۆی هەوکردنی کلەمیدیا لە چاویان یان هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە کە دەتوانێت بەرەو هەوکردنی سییەکان پەرە بسێنێت.

## لەپیاواندا:

دەتوانێت ببێتە هۆی پەتا، حاڵەتی ئازار بەخش بۆ جۆگەکان کە بەستراون بەڕیخۆڵە دروست دەکات .

وەلەسەرچاوەی تردا : هەست بە ئازار لە زەکەر ، هەستێکی سووتاو کاتێك میز دەکات،ئازار و ئاوسان لە یەك یان هەردوو دا لەجوتەگون (هەرچەندە ئەمە کەمتر باوە).[٢]

---

١ Mayo clinic
٢ Mayo clinic

## له هه‌موو كه‌سێكدا...

: ده‌بێته هۆكاری زیادبونی ئایدز وه هۆكاری زیادبوونی ڤایرۆسی ئایدز بۆ ئه‌كه‌سه‌ی كه سێكسی له‌گه‌ل ده‌كرێ، وه له‌وانه‌یه ببێته هۆكاری هه‌وكردنی له‌ش وه‌ك ئازاری جومگه‌كان و سووربونی چاوه‌كان و سور هه‌لگه‌ڕانی بنی پێ یان هه‌ر شوێنێكی له‌ش.

وه سایتی mayo clinic مه‌ترسی زیاتر ده‌خاته ڕوو :

ژن و پیاو ده‌توانن تووشی كله‌میدیا بن له كۆم ئه‌مه یان به هه‌بوونی سێكسی هه‌ڵگرتنه‌وه‌ی كۆم ڕووده‌دات، یان به بڵاوبوونه‌وه‌ی له سایتێكی دیكه‌ی تووشبوو (وه‌ك زێ) له‌كاتێكدا ئه‌و هه‌وكردنانه زۆرجار هیچ نیشانه‌یه‌ك دروست ناكات ، به‌ڵام ده‌توانن ببنه هۆكاری : ئازاری ده‌رچه‌ی كۆم دا، هه‌ست كردن به ئازار له‌كاتی ده‌رچوونی پیسایی یان میز، یان خوێن به‌ربوون.

پێویسته له‌لایه‌ن پزیشكه‌كه‌ته‌وه پشكنینی بۆ بكرێت ئه‌گه‌ر تێبینی هه‌ر یه‌كێك له‌م نیشانانه بكه‌یت یان ئه‌گه‌ر هاوكاره‌كه‌ت تووشی نه‌خۆشی STD یان نیشانه‌كانی STD بێت ده‌توانێت برینێكی نائاسایی له‌خۆ بگرێ، لێچوونێكی بۆن ناخۆش، سوتان له‌كاتی میزكردن، یان خوێنبه‌ربوون له‌نێوان ( سوڕی مانگانه )

## چی ڕوودەدات ئەگەر چارەسەری بۆ نەکەیت؟

کلەمیدیا دەتوانێت ببێتە هۆی کێشەی تەندروستی گەورە ، ئەگەر تۆ ئافرەتی ، کلەمیدیا دەتوانێت بە ناو بۆریەکانی ناو منداڵبوون و فەلوبییەکەت دا بڵاو بێت (ئەو بۆڕیانەی هێلکەی پیتێنراو لە هێلکەدان بۆ ناو منداڵدان هەڵدەگرن ) . ئەمە دەبێتە هۆی نەخۆشی هەڵاوسان (PID)

پی ئای دی زۆرجار هیچ نیشانەیەکی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە ژنان لەوانەیە ئازاری ناو دەم و حەوزیان هەبێت. تەنانەت ئەگەر لە سەرەتادا نیشانە دروست نەبێ، PID دەتوانێت زیانی هەمیشەیی بە سیستەمی زاوزێی ئافرەت بدا، PID دەتوانێت ببێتە هۆی ئازاری درێژخایەنی حەوزی زێ ، بێتوانایی لە دووگیان بوون و دووگیان بوونی ئەکتۆپی کوشندەی شاراوە ( دووگیانبوون لە دەرەوەی حەوز )

پیاوان بە دەگمەن کێشەی تەندروستیان هەیە کە پەیوەندی بە کلەمیدیاوە هەیە تووشبوون هەندێک جار هەو کردن بڵاو دەبێت بۆ ئەو بۆرییەی کە هەڵگری سپێرمە ، دەبێتە هۆی ئازار و تا . زۆر بەدەگمەن کلەمیدیا دەتوانێت ڕێگری لە پیاو بکات کە بتوانێت منداڵی ببێت هەروەها کلەمیدیا چارەسەرنەکراو لەوانەیە هەلی دەستکەوتن یان پێدانی ئایدز زیاد بکات – ئەو ڤایرۆسەی کە دەبێتە هۆی ئایدز.

**ئامار:**

CDC مەزەندە دەکات لەساڵی ٢٠١٨ دا ٤ ملیۆن کەس نەخۆشی کلەمیدیایان هەیە.لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەیەکی زۆر لە حاڵەتەکان ڕانەگەیەنراون چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی کلەمیدیایان هەیە بێ نیشانەن و پشکنینیان نەکردووە.

## نەخۆشی سێیەم: Gonorrhea

(Neisseria gonorrhoeae) چیە ؟

گۆنۆری.ا (نیٚسریە گۆنۆرهۆی) : نەخۆشیەکی گواستراوەی سێکسی ( STD ) کە دەتوانیٚت هەردوو ژن و پیاو تووش بکات وە تووشبوونێکی زۆر باوە، بەتایبەتی لە نیٚوان گەنجانی تەمەن ١٥ - ٢٤ساڵدا.

### مەترسی تووشبوون بە سێکس لە دەمەوە:

کاتێ کەسێك ژن یان پیاو نەخۆشی Gonorrhea ی هەیە و سێکسی دەم لەگەڵ بەرامبەر دەکات لەڕێی زەکەری گەر پیاو بوو یان زێی ئافرەت ، ئەوا کەسی بەرامبەر نەخۆشی Gonorrhea ی لەڕێی دەمی بۆ دەگوازرێتەوە و گەرووی تووشی ئەم نەخۆشیە دەبێت.

یان کەسێك نەخۆشیەکەی لە دەم و گەرووی هەبێت، کاتێ لێو و دەمی لە زەکەری پیاو یان زێی ئافرەت دەدات زەکەر یان زێیەکە نەخۆشیەکەی بۆ دەگوازرێتەوە.

### ناوچەکانی تووشبوونی سەرەتایی:

*گەروو

* کۆتایی دەرچەی کۆم

* بۆڕی میز
* جووتەگون

## نیشانەکانی تووشبوون:

زۆربەی توشبوونەکانی گەروو هیچ نیشانەیەکی نییە . کاتێك نیشانەکان ئامادە بوون، سووربوونەوەی قورگی لەخۆ دەگرێت.

توشبوون بە قورگ چارەسەری قورسترە لە تووشبوونی ئەندامەکانی تر .

## نیشانەکانی زێ، میزەڕۆ، یان تووشبوونی کۆم لەوانەیە بریتی بێت لە:

لێچوون لە زێ یان ئەندامی نێرینەی پیاو (لێچوون لە زێ لەوانەیە خوێناوی بێت).

هەست بە سوتان لەکاتی میزکردندا .

بە ئازارە یان ورساوی ڕیخۆڵە

ئازاری کۆتایی دەرچەی کۆم یان لێچوون

### ئەگەر چارەسەرنەکراو بەجێمابێت، تووشبوون بە گەروو:

دەکرێت بڵاوبکرێتەوە بۆ هاوبەشی سێکسی بێ توشبوو، لەوانەیە بڵاوبێت لە جەستەدا کە دەبێتە هۆی ئازاری بەراو و جومگە ئەم دۆخە پێی دەوترێت تووشبوونی گۆنۆکوکۆکاڵی بڵاوکراوە هەروەها دڵ دەتوانێت تووش بێت ئەمە حاڵەتی هەڕەشەکردنی ژیانی جدی و شاراوەیە.

### لە ژناندا:

دەکرێت ببێتە هۆی نەخۆشی هەوکردنی حەوز ( PID ) ، کە دەبێتە هۆی ئازاری درێژخایەنی حەوز ، نەزۆکی و دووگیانی ئەکتۆپی ( دووگیانی لە بۆریی فالۆپ یان لە شوێنێکی تری دەرەوەی سک )

### لە ژنانی دووگیاندا:

لەوانەیە ببێتە هۆی لەدایکبوونی پێشوەختە یان کێشی نزمی لەدایکبوون لە منداڵدا، دەتوانرێت بڵاو بکرێتەوە بۆ منداڵەکە لەکاتی گەیاندندا، وە دەتوانێت ببێتە هۆی کوێری، هەوکردنی جومگە، یان هەڕەشەکردن لە هەوکردنی خوێن لە منداڵدا.

### له پیاواندا:

دەتوانێت ببێتە هۆی پەتا، کە مەرجێکی ئازاربەخشە بۆ جۆگەکان کە بە ڕیخۆڵە لکێندراوە کە لەوانەیە ببێتە هۆی گیرانی یان بچووك بوونی جۆگە

### له هه‌موو که‌سێکدا:

*لەوانەیە مەترسی تووشبوون بە ڤایرۆسی ئایدز زیاد بکات.

*لەوانەیە مەترسی بڵاوبوونەوەی ئایدز بۆ هاوبەشی سێکسی زیاد بکات

*ڕەنگە بە نێو جەستەدا بڵاو ببێت و ببێتە هۆی ئازاری پێست و ئازاری جومگەکان.

ئەم دۆخە پێی دەوترێت تووشبوونی گۆنۆکوکۆکاڵی بڵاوکراوە هەروەها دڵ دەتوانێت تووش بێت، کە ئەوە حاڵەتی هەڕەشەکردنی مەترسیدار و ئەگەری ژیانییە.

### ئامار:

ڕێکخراوی CDC مەزەندە دەکات لە ئەمریکا نزیکەی ١،٦ ملیۆن نەخۆشی هەبووبێ لەساڵی ٢٠١٨ ، هەروەها زیاتر لە نیوەی گەنجانی تەمەن ١٥- ٢٤ ساڵ ئەم نەخۆشیە هەبێ .

## نەخۆشی چوارەم : syphilis

(Treponema pallidum) سیفیلیس چیە؟ :

بە زۆری بە هۆی پەیوەندی سێکسییەوە بڵاوبۆتەوە. نەخۆشییەکە بە ئازار دەستپێدەکات، بە شێوەیەکی ئاسایی لەسەر ئەندامی زاوزێ، بەشی کۆتایی کۆم یان دەم بڵاو دەبێتەوە لە ڕێگەی پێستەوە یان پەردەی موکۆوس پەیوەندی بەو سۆرایانە دەکات.

## مەترسی تووشبوون بە سێکس لە دەمەوە:

کاتێ کەسێك ژن یان پیاو نەخۆشی **syphilis** ی هەیە و سێکسی دەم لەگەڵ بەرامبەر دەکات لەڕێی زەکەری گەر پیاو بوو یان زێی ئافرەت ، ئەوا کەسی بەرامبەر نەخۆشی : **syphilis** ی لەڕێی دەمی بۆ دەگوازرێتەوە و گەرووی تووشی ئەم نەخۆشیە دەبێت.

یان کەسێك نەخۆشیەکەی لە دەم و گەرووی هەبێت، کاتێ لێو و دەمی لە زەکەری پیاو یان زێی ئافرەت دەدات زەکەر یان زێیەکە نەخۆشیەکەی بۆ دەگوازرێتەوە.

## ناوچەکانی تووشبوونی سەرەتایی:

* لێو

* دەم

* گەروو

* کۆتا دەرچەی کۆم

* ئەنۆس ( ئەو شوێنەیە کە کۆتایی ڕیخۆڵە بە دەرەوەی جەستە دەبەستێتەوە )

* جووتە گونەکان

## نیشانەکانی تووشبوون:

*لەوانەیە نیشانەی نەبێت.

*برینی بێ ئازار یان برین لەسەر لێو، دەم، یان گەروو، لەسەر پێست، یان لەسەر کۆتایی دەرچەی کۆم.

*ئەنجام دانی کرداری سێکس لەگەڵ کەسێك یەو نەخۆشیەی هەبێت دەبێتە هۆی سووربوونی لێو و خورانی قورگ و تووشبوونی بە نەخۆشیەکە.

*نیشانەکانی نەخۆشی هەڵامەت.

*شەقبوونی ناو لەپی دەست و سوور هەڵگەڕانی ژێر پێ.

ئەگەر سیفیلس چارەسەر نەکرێ:

دەکرێت بڵاوبکرێتەوە بۆ کەسانی تر لە ڕێگەی پەیوەندی کردن بەیەکتر.

لە ژنانی دووگیاندا:

*دەتوانرێت بڵاوبکرێتەوە بۆ منداڵەکە لەکاتی دووگیانیدا

*دەبێتە هۆی لە دایک بوون (منداڵێکی بە مردوویی لە دایک دەبێت).

*ئەو منداڵانەی کە نەخۆشی سیفیلیان هەیە، لەوانەیە گەشەکردەنیان دوابکەوێت، یان دەست بەسەراگرتنی گەشە، یان بمرن.

**لە هەموو کەسێکدا:**

*دەتوانێت مەترسی تووشبوون بە ڤایرۆسی ئایدز زیاد بکات

*دەتوانێت مەترسی بڵاوبوونەوەی ئایدز بۆ هاوبەشی سێکسی زیاد بکات

*ڕەنگە ببێتە هۆی زیان گەیاندن بە کۆئەندامەکانی ناوەوە ، کوێرەوەری ، لاوازی ماسولکەکان ، لەدەست دانی یادەوەری و تەنانەت مردنیش

لەهەمان سەرچاوە و لە شوێنێکی تر بەوشێوازە باسی نەخۆشی سیفیلس دەکات :

سیفیلز نەخۆشییەکی گواستراوەی سێکسییە کە ئەگەر چارەسەری شیوازە نەکرێ ، دەبێتە هۆی کێشەی تەندروستی زۆر مەترسیدار .

سیفیلس زیاد دەکات، بەتایبەت لە نێوان هاوڕەگەزبازان و دووڕەگەزەکان و پیاوانی تردا کە لەگەڵ پیاوان (MSM) سێکس دەکەن

زۆربەی حاڵەتەکانی سیفیلس لە ئەمریکا لە نێوان نێرباز و دووڕەگەز و پیاوانی تردان کە لەگەڵ پیاواندا سێکس دەکەن . (MSM) و سیفیلس زیاتر لە دە ساڵە لە نێو (MSM) دا ڕوو لە زیادبوونە. ئەگەر چارەسەری نەخۆشی سیفیلس نەکرێ ، دەتوانێت کێشەی تەندروستی ترسناکی لێ دروست بکات ، لەوانە ئازار لە ( مێشک و دەمار ) ، کێشەی چاو و تەنانەت کوێری . جگە لەوەش ، سیفیلس بەستراوەتەوە بە زیادبوونی مەترسی گواستنەوەی تووشبوون بە HIV

سیفیلس دابەش دەبێت بەسەر قۆناغەکانی ( سەرەتایی ، لاوەکی ، دواکەوتوو ، و سێتەری ) ، نیشانەی جیاواز هەیە کە لەگەڵ هەر قۆناغێك پەیوەستن .

کەسێك کە نەخۆشی سیفیلسی سەرەتایی هەیە بە گشتی لە شوێنی بنەڕەتی تووشبوون بە نەخۆشی برین یان سوور بوونەوەیان هەیە .

ئەم سووربوونەوانە بە زۆری لەسەر یان لە دەوری جووتەگون یان کۆم، یان لە ناو دەم یان لە دەوروبەری دەمدا ڕوودەدات. سۆرانە بە زۆری ( بەڵام هەمیشە نا ) جێگیر و خڕ و بێ ئازارن . نیشانەکانی سیفیلسی دووەم بریتین لە : ڕشپێستی پێست، گرێی لیمفی ئاوساو ، تا.

نیشانەکانی سیفیلسی سەرەتایی و لاوەکی دەکرێت نەرم و نیان بن و ڕەنگە تێبینیان پێ نەبکرێت . لە کاتی قۆناغی دواکەوتوودا هیچ نیشانەیەک نییە .

سیفیلس (Tertiary syphilis) پەیوەندی بە کێشەی سەختی پزیشکییەوە هەیە و بە یارمەتی چەند تاقیکردنەوەیەک لە لایەن پزیشکەوە بە زۆری دەستنیشان دەکرێت. دەتوانێت کاریگەری لەسەر دڵ و مێشک و ئۆرگانەکانی تری لەش هەبێت وەسفێکی وردی هەر قۆناغێکی سیفیلس دەکرێت بدۆزرێتەوە لەسەر شیتی ڕاستی[١]

وە لەسایتی mayo clinic دا هاتووە کە باس لە پەیوەندی نێوان syphilis and HIV هەروەها MSM دەکات.

## سەرەتا با بزانین ئایالە نێو MSMدا سیفیلیس چەند باوە؟

لە نێوان ساڵەکانی ٢٠١٧ بۆ ٢٠١٨، ژمارەی حاڵەتەکانی ڕاپۆرتی سەرەتایی و لاوەکی (P&S) لە ئەمریکا ٪١٤،٤ زیادیکردووە، هەروەها لە ساڵی ٢٠١٨دا ٣٥ هەزار و ٦٣ حاڵەتی نەخۆشی سیفیلس تۆمارکراوە زۆرترین (٪٦٤ ) ئەم حاڵەتانە لە نێو msm دا بوون

تاکە ڕێگا بۆ زانین ئەوەیە کە تاقی دەکرێنەوە زۆربەی ئەو پیاوانەی نەخۆشی سیفیلسیان دەست کەون بۆ ماوەی چەندین ساڵ هیچ نیشانەیەکی نییە ،

---

١ cdc.gov

لەگەڵ ئەوەشدا لە مەترسی دا ماون بۆ کێشەی تەندروستی ئەگەر چارەسەریان بۆ نەکرا.

هەروەها ئەو ئازارانەی کە لە قۆناغەکانی سەرەتای نەخۆشی سیفیلسدا دەرئەکەون، زۆر جار ناناسرێنەوە لەلایەن ئەو کەسەی کە ئەو کەسانەی هەیە. ئەو کەسانەی کە بێئاگان لە تووشبوونیان دەتوانن بە هاوبەشی سێکسی خۆیان بڵاوەی پێ بکەن.

## پەیوەندی نێوان سیفیلس و HIV چییە؟

لە ئەمەریکاش نزیکەی نیوەی MSM بە نەخۆشی سیفیلسی سەرەتایی و لاوەکی ( P &S ) لەگەڵ HIV دا دەژیان .

سەرەڕای ئەوەش، MSM کە نەخۆشی ئایدزی هەیە و نەخۆشی سیفیلسی S&p ی هەیە، لە داهاتوودا تووشی نەخۆشی ئایدز دەبێت.

هەبوونی سکپڕی یان تەقین لە پێست لە STD وەک سیفیلس لەوانەیە ڕێگە بە HIV بدات بە ئاسانتر بچێتە ناو لەشتەوە.

## چارەسەرم بۆکراوە ئایا دەتوانم جارێکی تر نەخۆشی سیفیلز بگرمەوە؟

بوونی نەخۆشی سیفیل سفیل جارێکی تر ناتانپارێزێت لە بەدەست هێنانی. تەنانەت دوای ئەوەی بە سەرکەوتوویی چارەسەرکرایت، هێشتا دەتوانیت دووبارە توش بیتەوە

چونکە سووربوونەوە سیفیلیس دەکرێت بێ ئازار بن و لە ناو زێدا شاراوەبن ، بە ئازارەوە ، لە ژێر پێستی زەکەر ، یان لە دەمدا .

## ئامار:

لەساڵی ٢٠١٧ لەئەمریکا ٣٠ هەزار و ٦٤٤ حاڵەتی نەخۆشی تۆمار کراوە، کە ڕێژەی ٩.٥ حاڵەت لە هەر ١٠٠ هەزار کەسێکدا بووە بە بەراوورد بە ساڵی ٢٠١٦ کە ٨.٦ بۆ هەر ١٠٠ هەزار کەس بووە.

ئەوەمەش واتا بەرزبوونەوەی نەخۆشیەکە بەڕێژەی ٪ ١٠،٥ ، وەهەروەها بە بەراوورد بەساڵی ٢٠١٣ ، ٪ ٧٢،٧ زیادی کردووە،کە ساڵی ٢٠١٣ ٥،٥ حاڵەت بۆ هەر ١٠٠ هەزار کەس بووە.[١]

[١] CDC. GOV

## نەخۆشی پێنجەم : Herpes

(herpes simplex virus types ١ and ٢) (ڤایرۆسی هەربس سیمپلێکس جۆری ١ و ٢) چیە؟

ڤایرۆسی هێرپێس سپلکس ١ و ٢ کە بە ناوی پۆلێنیی خۆیان ناسراوە، ڤایرۆسی ئەلفاهەرپێس ١ و٢ Alphaherpesvirus ی مرۆڤ، دوو ئەندامی خێزانی هێرپێسڤیریدای مرۆڤن، کۆمەڵە ڤایرۆسێکی نوێن کە لە زۆرینەی مرۆڤەکاندا هەوکردنی ڤایرۆسی بەرهەم دەهێنن هەردوو hsv-١ و hsv-٢ هاوبەش و هاودژن

## مەترسی تووشبوون بە سێکس لە دەمەوە:

ئەنجام دانی سێکسی زارەکی لەگەڵ کەسێك کە نەخۆشی هێرپسی هەیە لە کۆم و دەوروبەری گوون و شوێنە هەستیارەکان، دەبێتەهۆی تووشبوونی ئەو کەسە لە دەم و لێو و گەروو، وە بە پێچەوانەوە

## ناوچەکانی توشبوون:

* لێو و دەم

* گەروو

* کۆتایی دەرچەی کۆم

* دەوروبەری جوتە گون

## نیشانەکانی تووشبوون:

*لەوانەیە نیشانەی نەبێت

*ژانەسەر یان تا (لەکاتی تووشبوونی سەرەتایی)

*ئازاربەخش یان خوران لە یان نزیک ناوچەی هەوکردن

## چارەسەر:

*هیچ چارەسەرێك بۆ هێرپس نیە، بەڵام دەرمانی دژە ڤایرۆس دەتوانێت ماوەی نەخۆشیەکە کورت بکاتەوە و یارمەتی کەمبوونەوەی نیشانەکانی سەرهەڵدانی هەرپێس بدات .

*دەرمانی دژە ڤایرۆسی ڕۆژانە دەتوانێت ڕێگری بکات یان بڵاوبونەوەی هەرپس کورت بکاتەوە.

*تەنانەت لەگەڵ کەمکردنەوەی نەخۆشیەکەش لە (لێو، دەم و قوڕگ) هێشتا هەر دەبێتە گواستنەوە بۆ کەسی بەرامبەر

*دەکرێت بڵاوبکرێتەوە بۆ هاوبەشی سێکسی بێ توشبوو

## له ژنانی دووگیاندا:

ڕەنگه لەکاتی گەیاندندا بڵاوبکرێتەوه بۆ کۆرپەکه، وه دەتوانێت ببێته هۆی تێکچوونی مێشک، زیان گەیاندن به ئەندامەکانی لەشی ناوەوه، یان تەنانەت مردنی کۆرپەکه.

## له هەموو کەسێکدا:

*دەتوانێت مەترسی تووشبوون به ڤایرۆسی ئایدز زیاد بکات

*دەتوانێت مەترسی پێدانی ئایدز به هاوبەشەکانی سێکس زیاد بکات.

## ئامار:

٣.٧ ملیار کەس ئەوانەی تەمەنیان له خوار ٥٠ ساڵەوەیه مەزەنده دەکرێت ٪ ٦٧ هەوکردنی HSV-١ یان هەبێت.

٤٩١ ملیۆن کەس ئەوانەی تەمەنیان له نێوان ١٥ – ٤٩ ساڵیدایه مەزەنده دەکرێت ٪ ١٣ لەسەر تا سەری جیهاندا هەوکردنی HSV -٢ یان هەبێت.[١]

---

[١] WHO

## نەخۆشی شەشەم : HPV

ڤایرۆسی HPV پاپیلاما چیە؟ : ئەمە بڵاوترین نەخۆشیە لەسێکسدا، هەندێکیان بێزیانن و دەرۆنبەڵام هەندێکیان دەتوانن ببنە هۆی نەخۆشی شێرپەنجە.[١]

## مەترسی تووشبوون بە سێکس لە دەمەوە:

ئەنجام دانی سێکسی زارەکی لەگەڵ کەسێك کە نەخۆشی HPV هەیە لە کۆم و دەورووبەری گوون و شوێنە هەستیارەکان، دەبێتەهۆی تووشبوونی ئەو کەسە لە دەم و لێو و گەروو، وە بە پێچەوانەوە

## ئەگەرەکانی توشبونی بە هەمان شێوەی نەخۆشی هێربسە.

## ناوچەکانی توشبوون:

*دەم

* گەروو

* کۆتایی دەرچەی کۆم

* زێ

[١] www. Plannedparenhood.org

* زەکەر

* ئەنۆس ( ئەو شوێنەیە کە کۆتایی ڕیخۆڵە بە دەرەوەی جەستە دەبەستێتەوە )

## نیشانەکانی تووشبوون:

*هەندێ جار لەوانەیە هیچ نیشانەیەکی نەبێت.

*دروست بوونی بالوکە لە گەروو .

*ڕەنگە ببێتە هۆی گۆڕانکاری لە دەنگدا ، زەحمەتی قسەکردن ، یان کورتهێنانی هەناسە .

*هەبوونی بالوکە لە شوێنە هەستیارەکانی لەش

*هەندێ گۆڕانکاری نائاسایی لەسەر زێ و کۆم بەجێ دێڵێت کە دەتوانرێت لەڕێی پشکنینی پزیشکیەوە وەکو (Pap and/or HPV tests) دەربکەوێت.

*دەبێتە هۆی نەخۆشی شێرپەنجە لە خانەکانی زێ و زەکەری پیاو و کۆم و سەر و مل.

## ڤاكسين:

ڤاكسینی HPV دژی گواستنەوەی هەموو جۆرەکانی HPV یە ، پێشنیار دەکرێ بۆ ئەو کوڕ و کچانەی کە تەمەنیان لەنێوان ١١ بۆ ١٢ ساڵە، هەروەها بۆ هەر کەسێك کەوا تەمەنی لەسەرووی ٢٦ ساڵیە کە ڤاکسینەکەی لەخۆ نەدابێ .

## چارەسەر:

*بالوكەی دەم و قوڕگ: لەوانەیە ون بێت، بە نەگۆڕی بمێنێتەوە، یان بە قەبارە یان ژمارە گەورە بێت.

*نەشتەرگەری لەوانەیە بەکار بێت بۆ لابردنی بالوکە لە گەرروودا.

*چارەسەر لەوانەیە ماوەکەی کەم بکاتەوە بەڵام چارەسەری تووشبوونی ئێچ پی ڤی ناکات

## بالووكەی شوێنە هەستيارەكان:

*لەوانەیە خۆی بڕوات،یان بە نەگۆڕی بمێنێتەوە، یان بە قەبارە یان ژمارە گەشە بکات.

*چارەسەرەکان ئەو دەرمانانەی کە بەسەربالوکەکەدا جێبەجێ دەکرێن، بە بەستکردنی ( سرکردن ) بالوکە (cryotherapy)) (کرایۆتێر) یان نەشتەرگەری بۆ لابردنی بالوکە دەگرێتەوە.

*چارەسەر لەوانەیە بالوکەکە لەناو ببات یان کەم بکاتەوە بەڵام چارەسەری تووشبوونبە HPV ناکات .

## گۆڕانکاری نائاسایی لە خانەکانی زێ، سەرو، یان هەوکردنی:

*لەوانەیە پێویستی بە تاقیکردنەوەی زیاتری کلینیکی و تاقیکردنەوە (Pap و/یان HPV) بێت.

*ڕێکاری تر لەوانەیە بەکار بێت، وەک بیۆپسی (وەرگرتنی نمونەیەکی بچوک لە شانەیی)، بەپێی تەمەن، دۆخی دووگیانی، و ئەنجامی تاقیکردنەوە.

*تەنانەت لەگەڵ چارەسەری بالوکە لە قوڕگدا لەوانەیە ببێتە هۆکار بۆ گواستنەوەی نەخۆشیەکە بۆ کەسێکی تر و لەوانەیە دووبارە مەترسی سەرهەڵدانەوەی هەبێت

*تەنانەت لەگەڵ چارەسەرکردنی بالوکەکەدا لە کۆم و شوێنە هەستیارەکانی تریش دەکرێت بڵاوبکرێتەوە بۆ هاوبەشی سێکسی بێ توشبوو.

*لەوانەیە بگەڕێتەوە بەڵام نابێتە هۆکاری تووشبوون بە نەخۆشی شێرپەنجە

## گۆڕانکاریە نائاساییەکانی خانەکانی زێ یان بەلەمی زێ:

لەوانەیە گەشە بکات بۆ شێرپەنجە هەرچەندە هەندێك لە ژنان ئەنجامی تاقیکردنەوەی نائاسایی Pap and/or HPV یان هەیە، بەڵام ئەگەر بەدواداچوون و چارەسەری گونجاویان بۆ ئەنجام بێت، کەم ژن تووشی شێرپەنجە دەبێت .

وە لە سایتی HEALTH LINE بەوشێوازە باس لەم ڤایرۆسە و نیشانەکانی دەکات:

ڤایرۆسی پاپیلاما (HPV) ی مرۆڤ لە دەم:

ئەوەی پێویستە بیزانی، زۆربەی کەسانی چالاك لە بواری سێکسییەوە لە هەندێك خاڵدا لە کاتی ژیانیاندا تووشی ڤایرۆسی پاپیلامیۆما (HPV) دەبن ، HPV باوترین سەرچاوەی باوەڕپێکراوی نەخۆشی سێکسی (STI) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانە.

زیاتر لە ١٠٠ جۆری HPV بوونی هەیە و زیاتر لە ٤٠ جۆری لاوەکی HPV دەتوانێت کاریگەری لەسەر ناوچەی زێ و زەکەر و کۆم و قورگ بکات.

HPV بڵاوبۆتەوە بە پەیوەندی پێست بە پێستەوە زۆربەی خەڵك لە ناوچەی ئەندامی خۆیان لە ڕێگەی پەیوەندی سێکسییەوە HPV یان بۆ دەکەن .

ئەگەر تۆ پەیوەندیت بە سێکسی زارەکییەوە هەیە و ئەنجامی دەدەیت، لەوانەیە بە دەم یان قورگەوە گرێی بدەی. ئەمە بە گشتی بە (HPV) زارەکی ناسراوە.

ئەم جۆرە لە HPV دەتوانێت ببیتە شێرپەنجەی ئۆروفارنژال ، کە دەگمەنە . ئەگەر تۆ شێرپەنجەی ئۆروفارنژالت هەبێت، لە ناوەڕاستی قورگدا خانە

شێرپەنجەییەکان پێکدێت، لەوانە زمان، تانسیل، دیواری فارینکس ئەم خانانە دەتوانن لە HPV دەمەوە پەرە پێبدرین نیشانەکانی زوو شێرپەنجەی ئۆروفارینجی بریتین لە:

* کێشە لە قوتدان

* گوێچکەی ئازاری دەبێ و تەپ دەبێ بەردەوام

* کۆکەی خوێن

* دابەزاندنی کێش بێ هۆکار

* گرێ لیمفی گەورەکراو

* گەرووی ئازاری بەردەوام

* گرێی سەر ڕوومەتەکان

* گەشەکردن یان گرێی سەر مل

ئەگەر تێبینی هەر یەکێك لەم نیشانانەت کرد و دەزانیت یان پێت وایە لەوانەیە HPV ت هەبێت، دەبێ بەخێرایی پشکنین ئەنجام بدەی.

## HPV ئامار [1]

لێرەدا چەند ڕاستی و ئاماری زیادە سەبارەت بە تووشبوونی HPV:

CDC مەزەندە ی ئەوە دەکات کە ٧٩ ملیۆن سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ئەمریکی HPV هەیە زۆربەی ئەو کەسانە لە تەمەنی هەرزەکاریی درەنگیان دایە یان سەرەتای بیستەکانە.

مەزەندە دەکرێت کە ساڵانە نزیکەی ١٤ ملیۆن کەس لە سەرچاوە  توشی HPV ببن.

لە ئەمریکا، HPV ساڵانە لە ژن و پیاودا دەبێتە هۆی زیاتر لە ٣٣ هەزار شێرپەنجەی سەرچاوەی باوەڕپێکراو

مەزەندە دەکرێت کە ٪ ٩٥ سەرچاوەی باوەڕپێکراوی شێرپەنجەی کۆم بەهۆی تووشبوون بە HPV ەوە دروست بێت زۆربەی ئەو حاڵەتانە بەهۆی یەك جۆری HPV ١٦ : HPV .

لە ساڵی ٢٠٠٦ یەکەم کوتانی HPV دەستی پێکرد . بەپێی سەرچاوەی باوەڕ پێکراو بووە هۆی کەمکردنەوەی لە٪ ٦٤ نەخۆشیەکە لەناو کچە هەرزەکارەکان .

لە ساڵی ٢٠١٨ دا نزیکەی ٤٣ ملیۆن نەخۆشی HPV هەبوو، کە زۆر کەس لە تەمەنی هەرزەکاریی دواکەوتوو و سەرەتای بیستەکاندا بوون HPV چە ندین

[1] https://www.healthline.com/

جۆری جیاوازی هە یە هەندێك جۆر دەتوانن کێشەی تەندروستی دروست بکەن لەوانە ئەو بالوکانەی لە جووتە گون دروست دەبن وە شێرپەنجە . بەڵام کوتان هەیە کە دەتوانێت ئەم کێشە تەندروستیانە نەهێڵێت

هەندێک حاڵەتی تووشبوون بە HPV هەیە لە جووتە گون لەوانەیە هیچ کێشەیەکی تەندروستی لێ دروست نەبێت . لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک جۆری HPV دەتوانێت ببێتە هۆی گەشەکردنی زورناژەنی ئەندامی و تەنانەت شێرپەنجەی لە ئەندامی زاوزێ و دەرچەی کۆم و قورگ

هەندێک لە نەخۆشیەکانی HPV دەتوانن لە پیاواندا شێرپەنجەی زەکەر و کۆم و قورگ دروست بکەن هەندێك پیاو لەوانەیە زیاتر مەترسیان هەبێت بۆ گەشەدان بە شێرپەنجەی پەیوەندی بە HPV ، لەوانە ئەو پیاوانەی کە سێکسێکی کۆم و ئەو پیاوانەی کە سیستەمی بەرگری لاوازیان هەیە وەردەگرن .

نزیکەی ٧٩ ملیۆن ئەمریکی لە ئێستادا HPVیان هەیە و تەنیا لەمساڵدا ١٤ ملیۆن کەس لە سەرچاوە باوەرپێکراوەکان تازە دەستنیشان دەکرێت.

نزیکەی لە ٪ ٧ ی ئەمریکیەکان کە تەمەنیان لە ١٤ بۆ ٦٩ ساڵ دایە ، HPV زارەکییان هەیە .

ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ماوەی سێ دەیەی ڕابردوودا HPV زارەکییان هەیە زیادی کردووە.

لە پیاواندا زۆر باوترە وەك لە ئافرەتان .

نزیکەی دوو لەسەر سێی ئەوانەی شێرپەنجەی سێکسی زارەکیان هەیە لەجۆری HPV DNA ی لە ناودایە زۆرترین جۆری ژێرەوەی زارەکی HPV-١٦ یە HPV-١٦ بە جۆرێکی پڕ مەترسی دادەنرێن.

شێرپەنجەی سێکسی زارەکی دەگمەنە نزیکەی لە ٪ ١ ی خەڵك HPV -١٦ یان هەیە کەمتر لە ١٥ هەزار کەس ساڵانە شێرپەنجەی سێکسی زارەکی HPV-positive بەدەست دەهینن.

خواردنەوە کحولیەکان و زۆرخواردنی کحول مەترسی تووشبوون بە نەخۆشی HPV لە پیاواندا زیاد دەکات . ئەگەر جگەرە بکێشیت و بخۆیتەوە، ئەوە مەترسی زیاترت هەیە.

مەزەندە دەکرێت لە ٪٨٠ سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ژنان بە لایەنی کەمەوە لە ماوەی ژیانیاندا گرێبەست لەگەڵ یەک جۆری HPV دا بکەن وەك لەگەڵ پیاواندا ، زۆر ئافرەت کە تووشی HPV دەبن هیچ نیشانەیەکیان نییە و تووشبوونەکە بە بێ ئەوەی هیچ کێشەیەکی تەندروستی دروست بکات دوور دەکەوێتەوە

هەندێک لە ئافرەتان لەوانەیە تێبینی ئەوە بکەن کە بالوکە لەشوێنە هەستیارەکان دروست دەبێت کە دەکرێت لە ناو زێدا ، یان دەورووبەری کۆم دا

## نەخۆشی حەفتەم : HIV (human immunodeficiency virus ) ڤایرۆسی بەرگری لە مرۆڤ.

HIV (human immunodeficiency virus ) ڤایرۆسی بەرگری لە مرۆڤ چیە؟:

HIV (ڤایرۆسی بەرگری لەش) ڤایرۆسێکە هێرش دەکاتە سەر خانەکان کە یارمەتی لەش دەدات بۆ بەرهەڵایکردنی نەخۆشی، وا دەکات مرۆڤ زیاتر لاواز بێت لە تووشبوون بە نەخۆشییەکانی تر.[١]

**مەترسی تووشبوون بە سێکس لە دەمەوە:**

پێدانی سێکسی زارەکی بە سەر ئەو کەسانەی کە نەخۆشی ئایدزیان هەیە دەبێتە هۆی تووشبوون بە ئایدز، وە ئەنجامدانی سێکس لەڕێی دەم بۆ ( زێ و کۆم و زەکەر ) کە هەریەکێکیان هەڵگری HIV بێ ئەوە مەترسی گواستنەوەی نەخۆشیەکە لەڕێی دەمەوە هەیەبۆ هەردوولا.

هۆکارێکی تری گرنگ کە کاریگەری لەسەر مەترسی بڵاوبوونەوەی HIV هەیە، ئاستی ڤایرۆسی (i.e., viral load) لە خوێنی هاوبەشێکی تووشبوو و شلەکانی دیکەی لەش لە کاتی بەریەککەتنی سێکسیدا مەترسی تووشبوونی هەیە .

[١] HIV.gov

## ناوچەکانی توشبوون:

هەوکردنی کۆئەندامی بەرگری لە هەموو لەشدا

## نیشانەکانی تووشبوون:

*لەوانەیە هیچ نیشانەیەکی بۆ چەندین ساڵ نەبێ.

*نیشانەکانی نەخۆشی هەڵامەت.

## چارەسەر

هیچ چارەسەرێك بۆ HIV نییە، بەڵام دژە ڤایرۆس و دەرمانەکانی تر دەتوانن یارمەتی ئەو کەسانە بدەن کە ئایدز یان ڤایرۆسی ئایدز زیاتر دەژین بە کوالێتی یەکی باشتری ژیان.

تەنانەت لەگەڵ چارەسەری تووشبوون بە HIV، دە توانێت مەترسی تووشبوون بە هەوکردنی شێرپەنجەی دیارکراو زیاد بکات

## ئامار:[١]

ژمارەی ئەو کەسانی HIV یان هەیە لەجیهاندا :

٢٦ ملیۆن واتا ( ١.٢٥ تا ٢.٢٦) ملیۆن کەس چارەسەری ئەو نەخۆشیە وەردەگرن لەکۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٢٠

٣٨ ملیۆن واتا ( ٦.٣١ ملیۆن تا ٥.٤٤ ملیۆن ) خەڵك لەسەرانسەری جیهان ئەو نەخۆشیەیان هەیە لە ٢٠١٩ دا.

٧.١ ملۆن واتا ( ٢.١ ملیۆن تا ٢.٢ ملیۆن ) خەڵك لەجیهاندا تووشی ئەو نەخۆشیەدەبن لە ٢٠١٩ دا.

٦٩٠ هەزار، واتا ( ٥٠٠ هەزار تا ٩٧٠ هەزارکەس ) کەس ڕۆژانە بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە گیان لەدەست دەدەن.

٧٥.٧ ملیۆن کەس واتا ( ٩.٥٥ ملیۆن تا ١٠٠ ملیۆن) کەس ڕۆژانە تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن لە ٢٠١٩ دا .

٧.٣٢ ملیۆن کەس واتا ( ٨.٢٤ ملیۆن تا ٢.٤٢ ملیۆن) کەس گیانیان لەدەست داوە لەسەرەتای نەخۆشی کۆرۆنا تا کۆتایی ساڵی ٢٠١٩.

---

[١] https://www.unaids.org/en

## ئەوکەسانەی کە لەگەڵ HIV دەژین...

لە ساڵی ٢٠١٩ دا ٣٨.٠ ملیۆن واتا (٦.٣١ ملیۆن–٥.٤٤ ملیۆن) کەس بە نەخۆشی HIV دەژین.

٢.٣٦ ملیۆن واتا (٢.٣٠ ملیۆن–٥.٤٢ ملیۆن)کەس تەمەنیان گەنج و گەورەیە

٨.١ ملیۆن واتا [٣.١ ملیۆن–٢.٢ ملیۆن] منداڵ تەمەنیان لەنێوان(٠ سفر واتا هێشتا لەدایك نەبوون –١٤ ساڵ)دایە .

٨١٪ [٦٨–٩٥٪] لە هەموو ئەو کەسانەی کە لەگەڵ HIV دەژین، واتا دەیانزانی ئەو نەخۆشیەیان هەیە.

نزیکەی ١.٧ملیۆن کەس بەو نەخۆشیە مردوون و نەشیانزانیوە کە ئەو نەخۆشیەیان هەیە .

## نەخۆشی هەشتەم : نەخۆشی Trichomoniasis تریکۆمۆناس

نەخۆشی Trichomoniasis تریکۆمۆناس ( infection with T. vaginalis):-

نەخۆشیەکی زۆر باوە لەڕووی سێکسیەوە std ، بەهۆی تووشبوون بە مشەخۆرێکی پرۆتۆزۆیان بەناوی trichomonas تریکۆمۆناس هەرچەندە نیشانەکانی نەخۆشیەکە جیاوازیان هەیە، وە هەندێ کەسیش مشەخۆریان هەیە بەڵام ناتوانرێت بگوترێت تووش بوون بەو نەخۆشیە[١].

لەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەساڵی ٢٠١٨ مەزەندە دەکرێ زیاتر لە دوومليۆن نەخۆشی تریکۆمۆناس هەوکردن هەیە، بەڵام ٪ ٣٠ نیشانەکان بەدەر دەکەون، ئەم نەخۆشیە لەژنان زۆر باوترە وەك لە پیاوان بەتایبەت ژنانی بە تەمەن[٢].

[٢] CENTERS FOR DISEASE CONTROL AND PREVINTION( CDC).

## مەترسی تووشبوون بە سێکس لە دەمەوە:

بەژداری کردنی دەم لە سێکس کردن لەشوێنە هەستیارەکانی وەك ( زێ – کۆم – زەکەر ) دەبێتە هۆی تووشبوون بە نەخۆشیەکە، جا خۆشیەکە لە هەر کامێکیان دابێ بۆ ئەوی تر دەگوازرێتەوە.

## ناوچەکانی تووشبوونی سەرەتایی

( زێ - زەکەر – جووتە گون- دەم/قورگ (لەوانەیە)

## نیشانەکانی تووشبوون

ڕەنگە تووشبوون لەجووتە گوون یان میز هیچ نیشانەیەکی نەبووبێ، بە تایبەتی لە پیاواندا، نیشانەکانی تووشبوون لە جووتەگون یان زێ دەکرێت بریتی بێت لە:

( دەرکردن لە زێ یان زەکەر، سووربوونی ناوچەی زێ ، سووربوون و خورانی زێ،سوتانی هەست لەکاتی میزکردندا )

## چارەسەر:

ئەو کەسانەی کە نەخۆشی **Trichomoniasis** **یان هەیە** دەبێ چارەسەر وەربگرن و نابێت بە هیچ شێوەیەك سێکس بکەن تا بەتەواوی چارەسەر

وەردەگرێ،چونکە گەر چارەسەر وەرنەگرێ نەخشیەکە دەگوازێتەوە بۆ کەسێك کە نەخۆشیەکەی نەبووبێت پێشتر.

**تێبینی:** هەموو نەخۆشیەکان لە سایتی cdc.org ( centers for disease cntrol and prevention ) وەرگیراوە هەر شتێ زیاد کرابێ ئاماژە بەسەرچاوەکە دراوە.

## نەخۆشی نۆیەم : STI

ئەو نەخۆشیانەن کە لەڕێگەی سێکسەوە دەگوازرێنەوە،لەڕێگەی دەم یان کۆم یان ئەندامی نێرینەی پیاو.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر لە٩ملیۆن ژن تووشی نەخۆشی STI بوون، ساڵانە ( ١.١ ) ژن زۆر جار کێشەی تەندروستی جدیتری هەیە لەلایەن STIs وەك لە پیاوان، لەوانە نەزۆکی

هەروەها ژنان زۆر جار کێشەی تەندروستی مەترسیدارتریان هەیە لە STI لە پیاوان.

### چۆنیەتی تووشبوون :

* کەسێ نەخۆشی STI هەبێت و سێکس لەگەڵ کەسێ بکات کە ئەو نەخۆشیەی نیە ئەوا ئەویش تووش دەکات، جا ئەو سێکس کردنە لەڕێی دەم یان زێ یان کۆم یان مژینی ئەندامی نێرینەی پیاوبێ.

* یان لەکاتی دەست لێدانی شوێنە هەستیارەکان دەکرێت هەندێك لە (STIs) بەدەست بهێنرێ، وەک (سیفیلس و هەرپێس) بەبێ ئەوەی سێکس بکەن.

* لە ڕێگەی پەیوەندی سێکسی نێوان ئەو ژنانەی کە تەنیا لەگەڵ ژنانی تردا سێکس دەکەن.

* لە ژنێکی دووگیان یان شیردەر ەوە بۆ منداڵەکەی.

**STI دەبێتە هۆی کێشەی جیاوازی تەندروستی بۆ ژنان . هەندێك جۆری چارەسەرنەکراوی STIs دەتوانێت ببێتە هۆی:**

* کێشەی سکپڕبوون یان نەزۆکی هەمیشەیی

* کێشەی دووگیانی و کێشەی تەندروستی بۆ کۆرپە لە دایك نەبووەکە

* هە وکردن لە ئە و بە شانەی دیکە ی لە ش

* هەندێک جۆری شێرپەنجە، وەک شێرپەنجەی سیوی مەرگ.

**ئایا STI دەبێتە هۆی توشبوون بە HIV یان چارەسەری هەیە ؟**

هەبوونی جۆری دیاریکراوی STIs ئاسانکاریت بۆ دەکات بۆ بەدەستهێنانی HIV.

زۆرێک لە STIs تەنها نیشانەی مامناوەندیان هەیە یان هیچ نیشانەیەکی نیە.

کاتێك ژن نیشانەی هەیە، ڕەنگە بۆ شتێکی تر هەڵە بێت، وەك تووشبوون بە میزەڕۆ یان تووشبوون بە هەڵاواسراو .

بۆ هەندێك لە STIs، چارەسەری لەوانەیە وەرگرتنی دەرمان بە دەم یان وەرگرتنی لێدان ( بە دەرزی ) بێت.

نەخۆشی (STIs) کە چارەسەری بۆ ناکرێت، وەك هەرب یان ئایدز، دەرمانەکان تەنها دەتوانن یارمەتیدەربن لە کەمکردنەوەی نیشانەکان یان خاوکردنەوەی نەخۆشیەکە[1]

**وە لەسایتی mayo clinic ئەماژەی بە باوترین نیشانەکانی STIs داوە.**

**باوترین نیشانەکانی STIs بریتین لە:**

*خوران یان سوتانەوە لەدەورووبەری زێ دا و فێڕدانی میز بە زەحمەت

* لەکاتی میزکردن لەپیاواندا بەزەحمەت میز دەکا

* ئازار لەکاتی سێکس دا یان لەکاتی میزکردندا .

* ئازار لە ناوچەی حەوزی میزدا

* خورانەوە یان سوتانی قورگ لە ناو ئەو کەسانەی کە سێکسی زارەکیان هەیە

* سوربوون و خورانەوەی جوتەگون و شوێنە هەستیارەکانی کۆم و زمان و گەروو

* دروست بوونی پەڵەی ڕەش لە ناو لەپی دەستەکانت و قاچەکانت.

[1] https://www.womenshealth.gov

* دەبێتە هۆی تاریک بوونی میز کە ڕەنگی ئاسایی خۆی لەدەست دەدەت وە زەردبوونی چاوەکان و پێست

* لەکاتی دەرچوونی هەوا لە دەرچی کۆم بۆنێکی ناخۆش دروست دەکات.

* ئاوسانی لیك ڕژێنەکان و تا و ئازاری جەستە

* تووشبوونی نائاسایی ، ماندووبوونی بێ ڕوونکردنەوە ، ئارەقی شەوان و دابەزاندنی کێش .

* بەهێواشی ڕەنگی ناو کۆئەندامە هەستیارەکانی دەگۆڕێت.

نەخۆشیە گواستراوەکانی جنسی (STDs) — یان نەخۆشییە گواستراوەکانی جنسی (STIs) – بە گشتی بە پەیوەندی سێکسی بەدەست دێت. ئەو زیندەوەرانەی ( بەکتریا ، ڤایرۆس یان مشەخۆر ) کە دەبێتە هۆی نەخۆشییە گواستراوە سێکسییەکان ، لەوانەیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێک بگوازرێتەوە لە خوێن ، سێمن ، یان زێ و شلەکانی دیکەی لەش و لەشەکانی تری لەش تێپەڕین.

هەندێک جار ئەم هەوکردنانە دەکرێت بە شێوەی ناسێکسی بگوازرێتەوە وەک لە دایکەوە بۆ کۆرپە لە کاتی دووگیانی یان منداڵبووندا یان لە ڕێگەی خوێن گواستنەوە یان دووکانی هاوبەشەوە .

STDs هەمیشە نیشانە دروست ناکات دەکرێت بۆ توشبوون بە نەخۆشییە سێکسییەکان لەو کەسانەوە گرێ بدرێت کە بە تەواوی تەندروست دەردەکەون و ڕەنگە نەزانێ کە تووشبوونیان هەیە

**ئامار:**

لەهەر ساڵێکدا بەنزیکەیی ٣٧٦ ملیۆن تووشبوو هەیە بە ١ لە ٤ : STIs و سیفیلیس و گۆنۆر هیا و کلەمیدیا و تریکۆمۆنیاس .

مەزەندە دەکرێت زیاتر لە ٥٠٠ ملیۆن کەس هەوکردنی ئەندامی هەبێ لە ڤایرۆسی هەرپێس سمۆکس HSV ٣، وە زیاتر لە ٢٩٠ ملیۆن ژن ڤایرۆسی پاپیلۆما ٤ HPVیان هەیە.[1]

بە چاودێری بەپەلەی دەوڵەت لە تە مە نی ٢٥ ساڵیدا یە کێک لە دوو ئە مە ریکی گرێبە ستیان لەگەڵ STI کردووە لە ساڵی ٢٠١٧ دا، ٢٢٩٥هەزار و ٧٣٩ حاڵەتی دەستنیشانکردنی نەخۆشی (STD) هەبوو

ئەم ژمارانە جیاوازییان هەیە، کەواتە جیاوازی نێوان STD بەرامبەر STI چییە؟

STD Vs. STI

[1] who

یەکەم جیاوازی نێوان STDs و STIs لە ناودایە، STD بۆ نەخۆشی گواستراوەی سێکسیە، بەڵام STI واتە پەتا سێکسیە گواسراوەکان ، لە بنەڕەتدا جیاوازیەکە لە نێوان نەخۆشییەک و هەوکردنێکدایە

هەموو نەخۆشیەکان بە تووشبوون دەست پێ ناکات، بەڵام زۆر کەس نەخۆشی گواستراوە سێکسیەکان سەرەتا دەست پێدەکات وەک ئەو نەخۆشیانەی کە لە شێوەی سێکسیدا گواستراونەتەوە تووشبوون بە بەکتریای گواستراوەی سێکسی یان ڤایرۆس ڕوو دەدات سەرەتا دەچێتە ناو لەش و دەست دەکات بە لێکدان

هەر کە بەکتریا یان ڤایرۆسە گواستراوە سێکسییەکان چوونە ناو لەش، ڕەنگە تووشبوون بەرەو نەخۆشییەک بچێت نەخۆشی کاتێک ڕوودەدات کە ئەم ئامادەبوونە بیانییە بە فەرمی کار و پرۆسە ئاساییەکانی لەش تێک دەدات

جیاوازیەکی تری سەرەکی لە نێوان STDs و STIs ئەوەیە کە چۆن ئەوان پێشکەش دەکەن لەبەرئەوەی STD قۆناغی دواتری STI ە، لەوانەیە هەندێک نیشانەت هەبێت. لەگەڵ ئێس تی ئەی بەڵام زۆرێک لە هەڵگرەکان هیچ نیشانەیەکی توشبوون بە توشبوون نیشان نادا [١]

١ 

## لە ئیسلام دا ...

ئەوەی من پرسیارم کرد و لە سایتەکان بەدوایدا گەڕام بەو شێوازە لەلایەنی شەرعەوە زانایان قسەیان لەسەر کردووە.

ئەسڵ لە ڕابواردنی نێوانی ژن و مێرد دەستکراوەییە، واتە هەموو شتێك حەڵاڵە تەنها ئەوانە نەبێت بە دەقێکی شەرعی قەدەغە کرابێت وەك چوونە لای خێزان لە ڕێگەی کۆمەوە (دبر) یان سەرجێی وەختی بێنوێژی ئافرەت (حەیز و بیفاس).. یاخوود ئەگەر ئافرەتەکە بە ڕۆژوو بوو بە فەرز(ڕۆژوی ڕەمەزان و ڕۆژوی نەزر) یان لە کاتی ئیحرامیدا بوو بۆ حەج و عومرە.

لەمەوە  سەبارەت بە مژین یان لێسانەوە و ماچکردنی ئەندامی یەکتری نێووانی ژن و مێرد یاخوود هەر جۆرە ڕابواردنێکی تر هیچ بەڵگەیەکی ڕوون نیە حەڕامی بکات هەندێك لە زانایان دەفەرموون ئەو ڕابواردنانە دەچێتە بازنەی ڕێگەپێدراوەکان

هەردوولا بۆیان هەیە دەست لە هەموو جەستەی یەکتری بدەن و سەیری بکەن.

- خوای گەورە دەفەرموێ: **(نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا لِأَنْفُسِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ مُلَاقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ)** [1]

واتە:- ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بە هەر شێوەیەك دەتانەوێت تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە (بە هیوای بەرهەم) و بۆ

---

[1]- [البقرة:٢٢٣]

خۆتان دەست پێشکەری بکەن (سەرەتا هاوسەری خواناس و چاک هەڵبژێرن، لەوەودواش دوعاو نزاو خواپەرستی بەردەوام فەرامۆش مەکەن)و لە خوابترسن و خۆتان لە خراپە بپارێزن و چاک بزانن و دڵنیابن کە بە دیداری خوا شاد دەبن و ئەم مژدەیەش بدە بە ئیمانداران.

- ئەبووحەنیفە-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- لە وەڵامی پرسیارێکی لەو جۆرەدا کە ئەگەر پیاوێك دەستی بدات لە ئەندامی خێزانەکەی بۆ ئەوەی ئارەزووی بجووڵێنێ ئایا هیچی تێدایە؟ فەرمووی"نەخێر، ئومێدیش هەیە پاداشتی بکات.".

- ئەصبەغ دەفەرموێ: دروستە سێکسی زارەکی .

- مالیکیش-ڕەحمەتی خوا لێ بێت- سێکسی زارەکی بە جائیزی داناوە .

- فەنانی شافیعی مەزهەبیش-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێ جائیزە بۆ مێرد هەموو جۆرە ڕابواردنێك لەگەڵ خێزانەکەی تەنها ئاڵقەی کۆمی نەبێت (واتە سەرجێی کۆم) ئەگەرچی بە مژینی قیتکە(بظر)یشی بێت.

مەرداوی حەنبەلی مەزهەبیش-بەڕەحمەت بێت- دەفەرموێ لە(الإنصاف) کە قاضی لە (الجامع)دا فەرموویەتی: جائیزە ماچکردنی ئەندامی ئافرەت (خێزان) لە پێشی سەرجێی و ناپەسەندیشە لە دوای.. وە بۆی هەیە دەستی لێ بدا و ماچی بکات بە ئارەزووەوە..

بەڵام ئەگەر ئەو ماچکردن و لێسانەوە و مژینە دەرکەوت زیانی تەندورستی لێدەکەوێتەوە، ئەوا لەو کاتەدا وازی لێ دەهێنرێ چونکە لە ئیسلامدا جائیز نییە

زیان لە خۆ بدرێ یان لە خەڵکی بدەی وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ :- **(لا ضرر ولا ضرار)**[1]

هەروەها ئەگەر لایەک لە ژن و مێردەکە پێی قەبووڵ نەبوو یان ئەزیەتی پێ بخوات، ئەوا دیسان دروست نییە چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: - **{ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ }**[2]

واتە :- بە چاکە لەگەڵیان تێکەڵی و ژیانگوزەرانی ئەنجام بدەن

شایەنی باسە هەندێ لە زانایانیش پێیان باش نەبووە چونکە دەڵێن ئەوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ و پەیوەندی هاوسەریی و دابونەریتی بەرزی ئیسلامدا ناوەشێتەوە، یاخوود دەڵێن زمان بۆ یادی خوا و قسەکردن و نانخواردنە نەوەك بەکارهێنانی لەو جێگەیە کە بێگومان پیسی و تەڕایی وای لەگەڵە ڕەنگە بێزی لێ بکرێتەوە.

ئەوەی کە پێیان باش نییە وەکو لایەنی پزیشکییە چونکە چەندین نەخۆشی لێ دەکەوێتەوە بەتایبەت ئەگەر بە پیسی ئەنجام بدرێ

باشتر وایە نەکرێتە پیشە وە ئەم ئاوە ڕونەی لە دامەن یان لەزەکەری پیاو دەردەچی نابی قووت بدرێ چونکە وەك میز پیسە ئەگەر بەپاکی و ڕێك و پێکی ئەنجامدرا هەندێك لە زانایان ڕێگەیان داوە.

---

[1] - رواه ابن ماجه.

[2] - [النساء:١٩]. . .

## کاریگەری سەیرکردنی پۆرن بۆ ناوەوەی خێزان ...

هاوڕێیەکی نزیکم لەقوتابخانە بەیەکەوە بووین بۆی گێڕامەوەو گوتی: کوڕێك ئالوودەبوو بەو گرتانە، ڕۆژێکیان بەتەنیا لەماڵ بوو ئەوەندە زۆر چوو بووە ناو سەیرکردنی گرتە ڤیدیۆیەکان ئارامی لێ هەڵسابوو، وەختێك خوشکێکی ١٥ ساڵانی ئەو کوڕە لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە ماڵەوە و کاتێك کچەکە دەرگای ژوورەوە دەکاتەوە دەبینێ براکەی بەدیار فیلمی ڕووت دانیشتووەو پانیۆڵەکەشی داکەندووەو دەست بە زەکەری دادێنێ شۆك دەبێ، کاتێك کوڕەکە خوشکەکەی دەبینێ هەڵدەستێ لەباوەشی خۆی دەنێ و جلی لەبەر دادەکەنێ و پەردەی کچێنی دەدڕێنێ و ئارەزووەپیسەکەی لەو خوشکە پاکەی بەتاڵ دەکات ڕۆژان دێ و دەڕوا کچە لەترسی بوختان پێکردن و کوشتنی بێدەنگی هەڵدەبژێرێ و ناوێرێ هیچ شتێك بدرکێنێ لەبەر ئەوەی براکەی بەوە دەیترسێنێ گەر یەك ووشە بدرکێنێ ئەوە لەلای دایك و باوکی دەڵێ لەگەڵ کوڕی تر پەیوەندی هەیە و لەگەڵ ئەویشدا داوێن پیسی کردووە. وە کوڕەکە ڕۆژانە و بەردەوام دەچووە لای خوشکەکەی، ئەم کارە پیس و قێزەونە چەند مانگێکی خایاند، ڕۆژێك کچە نەخۆشدەکەوێ و هەست بە بێ تاقەتی و ناخۆشی دەکات و دەچێتە دکتۆر دەردەچێ کە دووگیانە. ئەو برایە دەڵێ : ڕۆژێکیان ئەو کچە ڕایکردە کۆڵان کە لاشەی نیمچە ڕووت بوو و هاواری لێهەڵسا و گووتی: ئەی هاوار ... من لەبراکەم دووگیانم !! و ئێستا منداڵی براکەمم لە زگ دایە. دەڵێ: دوای ئەوە دایکی کچەهات و کچەکەی بردەوە

ماڵ،بۆ بەیانی ماڵیان لە گەڕەکەکەمان نەما و ڕۆیشتن. چەندین ڕووداوی تر هەن و شاراوەن وە چەندینی تریش لەڕێگایە ...

## چەند زانیارییەکی مەترسیدارلەسەرسەیرکردنی پۆڕن

- لە هەر چرکەیەك ٢٨٢٥٨ کەس سەیری پۆڕن دەکەن.
- لەهەر دەقەیەک دا ١٨٤٥٠٠ دۆلار لەسەر پۆڕن خەرج دەکرێت.
- لەوڵاتانی ئەوروپی داوای گرتە و سێکسی منداڵان ڕوو لەزیاد بوونە و بەردەوام داواکاری پۆڕن لەبەرز بوونەوەیە، داواکاری پۆڕنی منداڵان رۆژانە ١١٦ هەزارە کە نایاسایە، وە ئەو سایتانەی کەوا پۆڕنی منداڵان دەخەنەروو ١٠٠ هەزار سایتە.
- لە ٧٠% ئەو داتایانە کەوا لەلایەن هەرزەکاران دەگوازرێتەوە پۆڕنە.
-لە دەزگای ((online physiology degree داهاتووە کە : ئەمریکا ٨٩% هەموو پۆڕنی جیهان بەرهەم دەهێنێت.
-% ٧.٤٢ هەموو بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت پۆڕن بەکار دەهێنێت کەدەکاتە (١٥٢٤٣٤٥٦٧)کەس.
-پۆڕن پیشەسازێکە نرخەکەی ١٣ بلیۆن دۆلارە کە گەورەترە لەهەموو کۆمپانیاکانی تر بەیەکەوە لەوانە گۆگڵ ومایکرۆسۆفت و ئەمازۆن و یاهۆ وئەپڵ ونیتفلیکس وێرس لینک.
-وشەی سێکس ژمارە یەکە لەگەڕانەکانی ئینتەرنێت دا.
-٦٨ ملیۆن گەڕان دەکرێت بۆ پۆڕن لە رۆژێکدا کە ٢٥% هەموو گەڕانەکانە.

-٨.٢ ملیارئیمێڵی پۆڕن دەگازرێتەوە کە دەکاتە ٨% هەموو ئیمێڵەکانە.

-٢٨% ئافرەتان وە ٧٢% پیاوانن کەسەردانی سایتی سێکسی دەکەن.

-زیاتر لە ٢٠٠٠٠٠ ئەمریکی ئالوودەی پۆڕن بوون کەوا زیاتر لە ١١کاتژمێر لە هەفتەیەك دا سەیری پۆڕن دەکەن.

* لە توێژینەوەیەک لە دەزگای Christian post لە ٢٠١٤/٢/١٣ دا دەرکەوتووە کە رێژەی سەیرکردن لە ئیرلەندا لەساڵی ٢٠١٠ بە رێژەی لە ٧٧% بەرزبۆتەوە.

* لە توێژینەوەیەکی تری دەزگای Christian post لە ٢٠١٣/١٢/٣٠ دا دەرکەووتوە کە:

-لە ئەمریکا % ٥٢ سەیرکردنی پۆڕن لەرێگای مۆبایلی زیرەکەوەیە وە ١٠% لەسەر تابلێتەوەیە.

* لە توێژینەوەیەك لە دەزگای lol life style لە ٢٠١٣/٩/٣ دا دەرکەووتوە کە: ئەمریکا پاشای پۆڕنە کە لە ٦٠% سایتە پۆڕنەکان لەخۆدەگرێت.

-وە لە % ٢٦ لە هۆڵەندان وە % ٧ لە بەریتانیانی گەورەن وە لە ١% لە ئەڵمانیان.

-لە ٦٦% هەموو پۆڕن لە ئەمریکا بەرهەم دەهێنرێت.

*لە دەزگای Christian Examiner لە ٢٠١٥/٢/٢٣ رووپێویەك کراوە لەسەر ٧٥٠٠٠ پیاو دەکەووتوە:

٦٤% ووتویانە کەوا تامی پۆڕنیان گۆڕاوە بۆ پۆڕنی توند و تیژ وە وای لێکردووون کە هەستی سێکسی لەگەڵ خێزانەکانیان لاوازبێت(تامی لێنەکەن).

٣٥% ی هەموو ئەو شتانە لە ئینتەرنێت داونلۆد دەکرێن سێکسین.

٣٠% هەموو ئەو داتایانەی لە ئینتەرنێت ئاڵوگۆڕ دەکرێن سێکسین.

-ئەو ئەکتەرە سێکسییەکانەی ( پۆڕن ستارانەی) تەمەنیان لە بیستەکانە زۆرترین تەماشاکەریان هەیە.

-تەنها لە ساڵی ٢٠١٦، ٤ ملیار و ٥٩٩ ملیۆن کاتژمێر سەیری پۆڕن کراوە.

٨٨ %ی ڤیدیۆ سێکسییەکان توندووتیژی لە خۆ دەگرن و ٤٩ %ی وشەی توندووتیژیی بەکار دەهێنن.[1]

-هەموو ـ ٢٩ ـ خولەکێك ڤیدۆیەکی پۆڕن لە ئەمریکا بەرهەم دەهێنرێت .

-لە ( ٣٠٪ ) ئاڵوودەبوانی پۆڕن ڕەگەزی مێن و لە ( ٧٠٪ ) کەیتری بریتین لە ڕەگەزی نێر .

-زیاتر لە (٤٣٠ ) ملیۆن پەیجی پۆڕنۆگرافی هەن .

-هەموو ساڵێك زیاتر لە ( ١٣٠٠٠ ) فلیمی پۆڕن بەرهەم دەهێنرێت .

-زیاتر لە ( ٢.٤ ) ملیۆن ماڵپەڕی پۆڕنۆگرافی هەن .

-( ٦٨ ) ملیۆن گەڕانی ئینتەرنێت پەیوەندیان بە پۆڕنۆگرافیەوە هەیە .

- ( ٧٢ ) ملیۆن کەس مانگانە لە سەرانسەری جیهانەوە سەردانی ئەم ماڵپەڕانە دەکەن .

-لە ئەمریکا پۆڕنۆگرافی ساڵانە بڕی ( ٨٤.٢ ) ملیار دۆلاری ئینتەرنێت لە خۆی دەگرێت لە کاتێکدا هەموو ئەو پارەیەی لە ئینتەرنێتدایە ( ٩.٤ ) ملیار دۆلارە ..

-بە تەنها لە ئەمریکادا (٤٠ ) ملیۆن کەس بە بەردەوامی سەردانی ئەم ماڵپەڕانە ئەکەن .

---

[1] - سەرچاوە: NBC News, HuffPost, ASACP, IWF

-سایتی پۆڕنی ٢.٤ ملیۆن دانەیە کە ١٢% هەموو سایتەکانە.

-لاپەڕەی پۆڕن ٣٧٢ میلیۆن دانەیە.

- لە سعودیە لە توێژینەوەیەکدا دەرکەتووە کەوا ٥٠ ملیۆن گەڕان لەسەر سێکس لە مانگێکدا کە هاوڕەگەز بازیشی تێدایە کە دەکاتە ٥.١ گەڕان لە رۆژێکدا هەبووە.

- ئەمریکا ٨٩%پۆڕنی جیهان بەرهەم دەهێنێت.

-لە ١٢%ی وێبسایتەکان بریتیە لە وێبسایتی پۆرن . کە بە ٤٢ ملیۆن دانە دادەنرێت، لەگەڵ زیاد لە ٣٧٢ پەڕەی پۆرنیدا.

-ڕۆژانە ٦٢ ملیۆن گەڕان ئەنجام دەدرێت بۆ پۆرن ، کە لە ٢٥% ی هەموو گەڕانەکان لە بزوێنەرەکانی گەڕاندا.

-ڕۆژانە زیاد لە ٥.٢ ملیار نامەی ئەلیکترۆنی پۆرنی دەگوازرێتەوە.

-مانگانە ١.٥ملیار دابەزاندن " داونڵۆد " ی پۆرن ئەنجام دەدرێت ، ئەمەش دەکاتە ٣٥% ی هەموو دابەزاندنەکان.

-لە هەر چرکەیەکدا ٣٧٢ کەس لە بزوێنەری گەڕانی ئینتەرنێتدا وشەی adult دەنوسێت.

-لە ٨٠% ی پیاوان بە شێوەیەکی گشتی و زیاد لە نیوەی ئافرەتانی جیهان مانگی جارێك سەیری ڤیدیۆی پۆرن دەکەن.

-لە هەر ٥ مۆبایلێکی زیرەك یەکێکیان تەماشای پۆرنی پێ کراوە.

-لە هەر سێ کەسێك کە سەردانی پێگە پۆرنیەکانیان کردووە ئەوا یەکێکیان ئافرەتە.

-بە پێی ئامارێکی ساڵی ٢٠١٠ لە ٢٨% ی هەموو کۆمپیتەرەکانی جیهان بەکارهێنراون بۆ چونە ناو پێگە پۆرنیەکانەوە.
-٧٨% ی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی تەماشای پۆرنیان کردووە .
-لە ساڵی ١٩٨٨ دا ١٣٠٠فیلیمی پۆرن بەرهەم هێنراوە .
-لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ١١٥٠٠ فیلیم بەرهەم هێنراوە .
-بزوێنەری گۆگڵ لە پلەی یەکەمدا دێت بۆ گەڕان تێیدا بۆ پۆرن بە ڕێژەی لە ٨٣%، پاش ئەو یاهوو و یاندێکس ..هتد .
-ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە پلەی یەکەمی بەرهەم هێنەرانی پۆرندایە ، پاش ئەو بەریتانیا و ئەڵمانیا و بەڕازیل و فەرەنسا و ڕوسیا و یابان و کەنەدا و هندستان و ئیتاڵیا و ئیسپانیا و هۆڵەنداو تورکیا و پۆڵەندا و ئوستورالیا دێت .
-ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا خاوەنی ٢٤٤ ملیۆن پەڕەی پۆرنیە لەسەر ئینتەرنێت ، پاشان ئەڵمانیا خاوەنی ١٠ ملیۆن پەڕەیە و دواتر بەریتانیا ٥.٨ ملیۆن پەڕەو پاشان ئوسترالیا ٥.٥ ملیۆن پەڕە ..هتد .
-تێکڕای تەمەنی دیاریکراو بۆ بینینی یەکەم گرتەی پۆرنی تەمەنی ١١ ساڵییە .
-هیو هێفنەر، دامەزرێنەری گۆڤاری پلای بۆی ، بووە هۆی گۆڕانێکی گەورە لە جیهانی پۆرنیدا لە جیهاندا و بە تایبەت لە ویلاییەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا .
-هەفتانە نزیکەی ٢٠٠٠٠ وێنەی پۆرنی منداڵان بڵاو دەکرێتەوە .
-ژمارەی ئەو یانانەی کە ئافرەتی روتی لێیە بۆ کاری جنسی لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا زیاترە لە یانەکانی هەر وڵاتێکی تری جیهان .

-ئەو ئافرەتانەی لە یانەکانا کار دەکەن ١٠٠% دەست درێژی سێکسی کراوەتە سەریان ، وە ڕێژەی لە ٥١% ین هەڕەشەی کوشتنیان لێ کراوە .

-ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لەم سەردەمەدا و لە دەیەیەدا کار دەکەن لە بواری پۆرندا زیاترە لە هەر سەردەمێکی تر .

-ئەستەمە بتوانرێت داتایەکی وردی ئەو روداوانە بە دەس بهێنرێت کە لەو کارەدا ڕو دەدەن.

بۆیە ناتوانرێت ژمارەی تەواوی قوربانیانی ئافرەت و پیاو لە کارەدا بزانرێت .

ئەو لیکۆڵینەوانەی ئەنجام دراوە لەو بوارەدا ئەم زانیاریيانەی دەرخستووە :

- ٦٦% بۆ ٩٠% ی ئەو ئافرەتانەی لەو بوارەدا کار دەکەن بە منداڵی دەست درێژی سێکسی کراوەتە سەریان .

-لە چاو ڕێژەی گشتی دانیشتوانی جیهاندا ئەو ئافرەتانەی لەو بوارەدا کار دەکەن زیاتر توشی ( ئازاردان ، توندوتیژی و لێدان ، نەخۆشیە گواستراوەکانی سێکس ، توندوتیژی خێزانی ، خەمۆکی ) دەبن .

- لەم کارەدا ئافرەتان توشی ژمارەیەکی زۆر لە کێشەی دەرونی و جەستەی دەبنەوە.

-لە ئێستادا زیاد لە ١٠ ملیۆن منداڵ لە بواری پۆرندا کار دەکەن .

-لە ٨٨% ی فیلیمە بەد ڕەوشتیەکان توندوتیژی جەستەییە بەرانبەر بە ئافرەت ، وە لە ٤٤% یشیان توندوتیژی قسەیە بەرانبەر بە ئافرەت .

- لە ٢٠١٦ دا گرتە سێکسیەکان، ٢٣ ملیۆن سەردان کەری هەبووە کە ٧٢٩ کەس دەکات لە چرکەیەکدا وە ٦٤ ملیۆن کەس دەکات لە دەقەیەکدا کە ژمارەی هەموو ئەو کەسانە دەکات کەلە بەریتانیای گەورەدا دەژین.

-ژمارەی ئەو فیدیۆیانەی کەوا سەیر کراوە دەگاتە ٩١٩٨٠٢٢٥٠٠ کەنزیکەی ٩٢ ملیارە کە ئەگەر دابەشی بکەین بەسەر زەویدا هەرکەسێکی سەر زەوی ٥.١٢ فیدیۆی بەر ئەکەوێت.

-ڕێژەی ئەوداتایەی کەوا لە سەیر کردنی فیدیۆکان سەیرکراوە ٣١١٠٤٠٠٠٠٠ گیگا بایتە کە ئەگەر بیکەینە ناو فلاش میمۆرێکەوە ئەوا ١٩٤٠٠٠٠٠٠ پر دەکات کە ئەگەر لەسەر یەك خەت ریز بکرێن یەك سوڕی مانگ تەواو دەکات.

-ژمارەی ئەو کاتژمێرانەی کە لەسەیر کردنی فیدیۆکان بەسەر براوە ٤٥٩٩٠٠٠٠٠٠ کە دەکاتە ٥٢٤٦ سەدە.

## بواری ئابووری پیشەسازی پۆڕن...

-پۆرن بەشێکە لە ئابوریە نهێنییەکەی ئەمریکا و داهاتێکی باش بۆ ئەو وڵاتە و بەرهەم هێەرانی بە دەست دەهێنیت .

-تەنها لە ساڵی ٢٠٠٥ دا بازرگانی پۆرنی منداڵان ٣ملیار دۆلار بووە .

-قەبارەی جیهانی پیشەسازی پۆڕن بە ٥٧ ملیار دۆلار دائەنرێت کە ١٢ ملیار دۆلاری لە ئەمریکایە.

-فیدیۆی پۆڕن بە ٢٠ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-خزمەتی دابین کردنی پارێزگاری بۆ پۆڕن بە ١١ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-گۆڤارەکانی پۆڕن بە ٧.٥ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-نادی(کڵەپ)سێکسی بە ٥ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-تەلەفۆنی سێکسی بە ٥.٤ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-کەناڵی کەیبڵ بەپارە بە ٢.٥ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-ئینتەرنێتی پۆڕن بە ٢.٥ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-سی دی پۆڕن بە ١.٥ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-پێداویستی سێکسی بە ١ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-ئەوانی تر بە ١.٥ ملیار دۆلار دا ئەنرێت.

-لە هەر چرکەیەکدا ٣٠٧٠ دۆلار خەرج دەکرێت لە پۆرنۆگرافیدا لەسەر هێڵی ئینتەرنێت.

-رێژەی داونلۆدی پۆڕن١،٥ ملیارە کە ٣٥٪ هەموو داونلۆدەکانە.

-پۆڕن پیشەسازێکی ١٣ ملیار دۆلارە.

-لە ساڵی ( ٢٠٠٦ ) داهاتی بڵاوکراوە سێکسیەکان لە ئەمریکا بریتی بووە لە ( ١٣ ) ملیار .

-لە ساڵی ( ٢٠٠٧ ) داهاتی پۆڕنۆگرافی بە ( ٢٠ ) ملیار دۆلار مەزەندەکرا کە ملیاری تەنها لە ئەمریکا بووە.

- لە ساڵی ( ٢٠٠١ تا ٢٠٠٧ ) داهاتی ساڵانەی پۆڕنۆگرافی لە یەك ملیارەوە بەرزبووەتەوە بۆ (٣٠ ) ملیار دۆلار.

-لە ساڵی ٢٠١٤ دا زیاد لە ١٣٠٠٠ فیلیمی پۆرنی بەرهەم هێنراوە ، کە قازانجەکەیان بە ١٣ ملیار دۆلار دەخەمڵێنرێت .

-بە پێی هەندێ سەرچاوە داهاتی پۆرنۆگرافی لە ساڵی ٢٠٠٦ دا ٩٧ ملیار دۆلار بووە کە پشکی شێر بەر وڵاتی چین کەوتووە .

## هەڵە گەورەکە دەربارەی سەیرکردنی پۆرن ...

هەندێك هەڵەهەن کە مرۆڤەکان دەیکەن دەربارەی سەیرکردنی پۆڕن و کەسی ئاڵوودەبوو لەو ڕێگەیەوە تێی کەوتوون و بەشێوازێکی هەڵە بیردەکەنەوە ، لەوانە ...

هەیانە دەڵێ تەنها بۆ ئەوە سەیری پۆڕن دەکەم تا هەندێ زانیاری و شارەزایی وەربگرم،بێگومان ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە هەڵەیەکی کوشندەیە،لەبەر ئەوەی پۆڕن سێکسی ئاسایی نییە و شێوازەکەی شێوازێکی سروشتی و تەندروست نییە.

کەسانێکی تر دەڵێن ئێستا سەیری دەکەین و دواتر دوای ئەوەی هاوسەرگیریم ئەنجامدا واز لەسەیرکردنی دێنم... بەڵام ئەو جۆرە بیرکردنەوانەش هەڵەیە، لەبەر ئەوەی بە سەیرکردنی بۆ پۆڕن کەسەکە ئاڵوودە دەکات .

کەسانێکی تر وای دادەنێن کە سەیرکردنی پۆڕن هیچ زیانێك بە خۆیان و دەوروبەر ناگەیەنێ، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش هەڵەیە،لەبەر ئەوەی کاریگەری زۆر خراپ لەسەر کەسەکە لەلایەنی دەروونی و جەستەیی دروست دەکات و دواتریش دەبێتە نەخۆشی و پێیوە دەلکێت و ناخی لەپاکییەوە دەگۆڕێ بۆ ئەوپەڕی پیسی و وای لێ دەکات ئارەزووی بچێتە هەمووشتێکی دەوروبەری بە ئاژەڵ و مرۆڤەوە بە هەموو جۆرە جیاوازەکانەوە، وە ئەو گەنجانەی کە بینەری فیلمە سێکسیەکانن، توانای ڕەقبوونی چووکیان لاواز دەبێت و دەبێتە هۆی ئەوەی دواتر کە هاوسەرگیریشیان پێك هێنا، چێژ لە جوتبوونی سرووشتی نەکەن.

## خۆپاراستن لە پۆڕن...

باشترین چارەسەر ئەوەیە تاکەکانی کۆمەڵگە خۆیان بپارێزن لەم پەتا کوشندەیە و لێنەگەڕێن ئەو پەتایە تووشیان بێ و ئاڵوودەیان بکات و بیان ڕووخێنێ، هەرچەندە خۆ پاراستنیش تاڕادەیەك قورسە چونکە ئەو پەتایە بەردەوام و لە هەموو شوێنێك بوونی هەیە و دەرگای کراوەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بجەنگین تا ژینگەی خۆمان و دەورووبەرمان لەم پەتا پیسە پاك بکەینەوە.

ڕیگەی خۆپاراستن زۆرن لەوانە :

**یەکەم:** دروستکردنی ژینگەیەکی پەروەردەیی شایستە لەلایەن کەسانی شارەزاو دەروون تەندروستەکانەوە بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگاداربکەنەوە لەو مەترسییە کوشندەیە.

**دووەم:** حکومەت دەبێ سانسۆر بخاتە سەر ئەنتەرنێت و ئەوسایتانەی گرتەی بەدڕەوشتی تێدایە دیبخات .

**سێ یەم:** ئاسانکاری کردن بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری بۆ گەنجان بۆ ئەوەی پەنا بۆ پۆڕن نەبەن لەمەشدا دەبێ کەسەکان یارمەتی پێشکەش بکەن و ئەوانەی دەیانەوێ ئەو پرۆسەیە ئەنجام بدەن باری شانیان قورس نەکەن، وە حکومەتیش دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکات.

**چوارەم:** کەرتی پەروەردە: دەبێ پەروەردە سیستەمێکی پەروەردەیی تەندروست لەڕێگای دایەنگە و قوتابخانە و زانکۆکانەوە پێشکەش بکات،بەشێوازێك کە لەهەر قۆناغ و تەمەنێکدا فێرخوازانی زانست فێری شتی نوێ و زانستی و

ئەخلاقی بن و دووربن لەهەر نەخۆشییەکی نەخوازراو، بەم شێوازە پەروەردەییەش کۆمەڵگا بەشێوازێکی تەندروست گەشەدەکات و ئاسایش و ئارامیش بەرقەرار دەبێت.

**پێنجەم:** کەسایەتی خۆت: ئەگەر کەسێك داوای کرد بۆ تەنها جارێك سەیری گرتەیەکی سێکسی بکەی ڕاستەوخۆ ڕەتی بکەوە و بۆ چرکەیەکیش ڕازیمەبە لەبەر ئەوەی تەنها جارێك سەیرکردن بەسە بۆ ئەوەی ئەو گرتە سێکسیە و وێنەکانی لە مێشکت خەزن بێ و دواتریش بیری لێبکەیەوە و هەوڵی دووبارەکردنەوەی بدەی.

**شەشەم :** بەهێزترین ڕێگا بۆ تووش بوون بەم پەتایە ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانە وەك کۆمپیوتەرو مۆبایل و تابلێت، بۆیە پێویستە لەسەر ئەوکەسانەی ئەو ئامێرانە بەکاردێنن ئەو جۆرە بەرنامانە دابنێن کە ڕێگری دەکات لە نیشاندانی ئەو جۆرە گرتانە، لەبەر ئەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان گەورەترین دەرگان بۆ هاتنی فیلمی ڕووت بۆ ناو ماڵەکان.

ئەوەی لە سەرەوە باسکران چەند ڕێگایەکن کە لە ناو کۆمەڵگادا ئەنجام دەدرێن، هەمووشیان بە توێژینەوە سەلمێنراون کەوا ئەنجامی زۆر باشیان هەیە.

**حەفتەم:** چاودێری دایك و باوك لەسەر منداڵەکانیان: لەگەڵ زۆر بوون و هەرزانی مۆبایلە زیرەکەکان، ئێستا دەبینین هەموو چین و توێژەکان ئامیرە زیرەکەکان بەکاردێنن و منداڵیش یەکێکە لەو چینانەی کە ئێستا بەشێوەیەکی نا تەندروست ئەو ئامێرانە دەخەنە بەردەستیان و منداڵانیش بەشێوەیەکی

هاکەزایی ئەو ئامێرانە بەکاردێنن و ئەگەری تووشبوونیان بە بەرکەوتن لەگەڵ پۆڕن زۆر زیاتر دەبێ لە کەسێکی پێگەیشتوو و ئاسایی، بۆیە پەروەردەکاران دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکەن و پێش ئەوەی ئامێرە زیرەکەکان بدەنە دەست منداڵەکانیان دەبێ سەرەتا ڕۆشنبیرییەکی پتەو بۆ منداڵەکانیان دەروست بکەن و منداڵەکانیان ڕابهێنن لەسەر گونجانێکی تەندروست لەگەڵ تەکنەلۆژیادا و فێریان بکەن کە تەکنەلۆژیا بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی بەکاردێ نەوەك تێك دانی کۆمەڵگە و ڕوخاندنی کەس و کەسایەتییەکان، وە لەڕێگەی تەکنەلۆژیاوە ئاسانکاری بۆ مرۆڤەکان دێتە پێش نەك ناڕەحەتی و ناخۆشییەکان، بەمەش پەروەردەکاران منداڵەکانیان دەپارێزن لەگەڵ هەر بەرکەوتنێکی ناتەندروست و دوور لەبەها ڕەوشتییەکان و کەسەیەتییەکی بەهێزی لێ بەرهەمدێ.

## چۆن خۆت ڕزگاردەکەی لە ئالوودەبوون بە پۆرن؟ ...

لەسەرەتادا باسمان کرد کە ئەوکەسانەی سەیری فیلمی پۆڕن دەکەن خووی پێوە دەگرن و ئەو خوەش وایان لێدەکات بەردەوام هەوڵی بەدەستهێنانی ئەوشتە بدرێ کە مێشك داوای دەکات.

سەرەتا دەبێ بزانین خووچییە و چۆنە ؟،ئەوجا چۆن خۆمان ڕزگاربکەین لەم ئاڵوودەبوونە ( خووە ).

خوو چییە و لەچی پێکدێت .

خوو: بە زۆربەی ئەو کارانەی کە ڕۆژانە مرۆ ئەنجامی دەدات و دووبارەی دەکاتەوە دەڵێن" خوو" .

خوو دەتوانرێت دروست بکرێت وە دەتوانرێت لاش بدرێت، جا خووەکە باش بێ یان خراپ.

خوو لە سێ بەش پێکدێت کە هەموو خووێك ئەو سێ بەشەی تێدایە :

**یەکەم:** لە cue کە خاڵی دەست پێکە. ( بۆ نمونە : کەسێك فێری شۆفێری دەبێت، خاڵێکی دەستپێکی هەیە بۆ فێر بوون ).

**دووەم:** routine ڕۆتین ، کەچەند کردارێکی دیاری کراوە. ( کاتێك کەسەکە بێتاقەت دەبێ، بە ئۆتۆمبێلەکەی دەچێتە گەشتێك ، ئەوە" ڕۆتینە" ).

**سێیەم:** reward ڕیوارد، " پاداشت" کە دەسکەوتێکی دیاری کراوە .( ئەوکەسە کە بە ئۆتۆمبێلەکەی گەشتی کردووە بێتاقەتییەکەی نامێنێ، ئەوە " پاداشتە " ).

بۆ فیلمی " ڕووت " یش بەهەمان شێوە ئەوانەی کە بینەری ئەو جۆرە فلمانەن و " خوو" یان پێوە گرتووە هەرسێ خاڵییان لەسەر جێبەجێ دەبێ :

ئەو کەسەی سەرەتا سەیری پۆرن دەکا ( ئەوە خاڵی دەستپێکە) ، دواتر کە بێتاقەت بوو دەچێتەوە سەری بەئومێدی ئەوەی بێتاقەتییەکەی نەمێنێ ( ڕۆتین ) ، کاتێکش سەیری فیلمێکی ڕووت دەکات، ڕژانی دۆپامین ڕوودەدات کە هەستی خۆشی بە کەسەکە دەبەخشێت، وە دۆپامین چەندی زیاتر بێ خۆشی زیاتر دەبێ ئەوەش ( پاداشتەکەیە ).

کەواتە زانیمان خوو لەدەستی مرۆڤە خۆی دروستی دەکات و خۆشی دەتوانێ لایبەرێت، بۆیە مرۆڤ دەبێ ئیرادەیەکی بەهێزی هەبێت و خووە پیس و ناشرینەکان لەخۆی دارنێ و بە وورەیەکی بەرزەوە ڕووبەڕوویان ببێتەوە و لەناویان ببات و دەروون و جەستەی بە خووی باشتر و چاکتر ڕابهێنێت.

بۆ ئالودەبوون بە پۆڕنیش دەڵێین: ئالوودەبوون بە پۆڕن نەخۆشییەکی دەروونییە و چارەسەری هەیە، کەسی ئالوودەبوو تاوەکو زووتر هەوڵی چارەسەری بدات باشترە و ئاسانتر دەتوانێ واز بهێنێت و چەندی زیاتر بەدوای کەوێت مەترسیدارتر دەبێ لەسەر تاکی سەیرکەر و قورستر دەتوانێ وازبهێنێ.

هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی ئەو کەسانەی کەوا ئاڵوودەبوون بە پۆڕن ناتوانن بە ئاسانی وازی لێبهێنن، چونکە شێوەی مێشکیان گۆڕاوە کەوا بەس تام لەو سەیرکردنە وەردەگرن وە بۆ ئەو کەسانەی کەوا ماوەیەکی کەم سەیری ناکەن ئەوە بەس نییە بۆ ئەوەی واهەست بکەن کەوا وازی لێی هێناوە چونکە بە بچووکترین نیشاندەر یان بە زوورترین کات دەگەڕێتەوە سەری بەڵکو کاتێکی زۆر زیاتری دەوێت تا مێشکی دێتەوە سەر شێوەی خۆی کەوا نزیکەی ١٨ مانگی دەوێت.

بۆیە خۆڕزگارکردن لە ئاڵوودەبوون بە پۆڕن شتێکی ئاسان نییە لەبەر ئەوەی ئاڵوودەبوونەکە جەستەیی و دەرونییە، بۆیە کەسی ئاڵوودەبوو دەبێ بەرنامەیەکی پتەو دابنێت وە داوای هاوکاری و یارمەتیش بکا لەکەسانی دەوروبەر بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن لەم خۆ چارەسەر کردنەدا، وە دەبێت

ووریا بیت کە داوای یارمەتی لەکێ دەکەی لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسەکە نەشارەزابێ ئەوە بێگومان سەرکەوتوونابیت لەم چارەسەرییەدا.
وە ئەوەی جێگای دڵخۆشییە ئەوەیە کە ئاڵوودەبوون خووە و خووش ڕێگەچارەی هەیە و دەتوانرێت کەسی ئاڵوودەبوو دووربکەوێتەوە لەم خووە، وە ئاڵوودەبوونیش لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوەزە و بۆ وازهێنان و دووركەوتنەوە پێویست بەکات دەکات، کە هەیانە زووتر توانای وازهێنانی هەیە و هەیانە درەنگتر، ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە سەر زۆر سەیرکردن و ئاڵوودەبوونی زیاتر لەلایەن کەسەکانەوە.
هەندێ جار قۆناغی دووركەوتنەوە و چارەسەی ١٨ مانگ دەخایەنێ ئەمەش بۆ چاکبوونەوەی وەرگرەکانی دۆپامین لە مێشك پێویستە، وەهەروەها ئەوکەسەی کە وازلەو جۆرە گرتە سێکسیانە دێنێ دەبێ ووریابێ لەبەر ئەوەی بە بچووکترین سەیرکردنەوە ڕەنگە ئاڵوودە ببێتەوە.

## سەرەتا ...

کەسی ئاڵوودەبوو دەبێ بەبوێری بڕیاربدات و ئیرادەیەکی بەهێز دروست بکات و سەر لەنوێ دەست بەژیان بکاتەوە و شێوازی ژیانی بگۆڕی، وەدەبێ هەردەم ئەوەی لەبیر بێ کە بەهۆی پۆرنەوە ژیانی وێران بووە و زیانێکی گەورەی بەرکەوتووە .

دەبێ هەوڵ بدات تەنها نەبێ و بەردەوام لەگەڵ کەس و کەسایەتییەکان هەڵسوکەوت بکات بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە ئەهلی تەقوان و دەست بەدەست نوێژن.

ماڵەکەت پاك بکەرەوە لەهەموو ئەوشتانەی کە سەرەنجت بەلای پۆرن رادەکێشن و لەژوورەکەت کتێبخانەیەکی بچووك دروست بکە و ئەو جۆرە کتێبانە دانێ کە بەسوودە و ژیانت بۆ ڕێکدەخەن و ئاستی ڕۆشنبیریت بەرزدەکەنەوە لەپێش هەموویان قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا.

بیرکردنەوەت بگۆڕە و تێبکۆشە و خۆت بسەلمێنە کە هەی و دەتوانی خزمەتێك پێشکەشی دەورووبەر بکەی .

بەپێی پێویست ئەنتەرنێت بەکاربهێنە و کات بەفیڕۆ مەدە و خۆت بەدوور بگرە لەهەر ئیمێڵێکی بەدڕەوشتی .

نوێژەکان بەکۆمەڵ ئەنجامبدە و خووی بەدڕەوشتی وازلێبێنە و خوو بە عیبادەتەوە بگرە .

خۆت بەدووور بگرە لەو حاڵەتانەی کەوا باری دەرونیت تێکدەدا.

وەک: تووڕەبوون، برسیبوون، تەنهانیی، ماندووبوون.

ڕەنگە هەر یەکێک وەک ڕێخۆشکەر وابن بۆ دووباره گەڕانەوە یان وەك بیانوویەك کەسەکە بە شێوەیەك یان خود ئاگایانە بەکاریان بهێنێت بۆ درێژەدان بە ئالوودەبوونەکەی.

هەرکاتێ کەوتی هەڵسەوە و بەردەوام بە، کەوتن شتێکی ئاساییە وەك چۆن سەرەتا مرۆڤ بە کەوتن فێری وەستان و ڕۆشتن بوو،بۆیە کەکەوتی ڕێگای تریش بەکاربهێنە بۆڕووبەڕوو بوونەوە و وازهێنان.

## سودی وازهێنان لە سەیرکردنی پۆڕن:

کاتێك وازلەسەیرکردنی پۆرن دێنی مێشکت دەگەڕێتەوە سەر شێوازە ئاسایی و سروشتییەکەی خۆی ( کاراکردنەوەی مێشك ) ، بەمەش هەموو لایەنە خراپ و زیانبەخشەکان دەگۆڕێن بە لایەنی باشە، کە بەوازهێنانێکی کورت کەسی ئالوودەبوو هەست بەو باشیانە دەکا وەك گەورەبوونی مێشك کەپەیوەندی هەیە بە(باشتر بیرکردنەوە وباشتر بریاردان وزیاتر تەرکیز خستنە سەر بابەتێکی ژیان و زیاتر توانینی خەزنکردنی باشتر و لایەنی دەروونی بەهێز) وە هەست نەکردن بەتەنیای و دوورکەوتنەوە لە خەمۆکی و هەست کردن بە توانایەکی زۆر وە متمانە بەخۆبوونێکی زۆر، وەهەروەها گێڕانەوەی توانای سێکسی و چێژی جووتبوون لەگەڵ خێزاندا، لەبوارەکانی تری ژیانیش گۆڕانی گرنگ ڕوودەدات کە ئەو گۆڕانانەش بەپێی کەس کەسایەتییەکان جیاواز دەبێ ، وە چەندان سودی تر.

## هۆکاری چوارەمی داوێن پیسی:

## مەساج و بارەکان و دووکانەکانی مەی خواردنەوە ...

لێرە هەموو ئاسانکاریەك دەکرێ بۆ کەسێك کە بیەوێ ئیش بکا بەتایبەت گەر ئیشەکەشی دژایەتی قورئان و ئیسلامی تێدابێ ئەوکات زیاتریش یارمەتی دەدرێت.

بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ کرانەوەی کۆمەڵگەی موسڵمانان و بەرکەوتنی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا شەپۆلە فراوانە بەدڕەوشتیەکەی ئەوان کاریگەری زۆری دروست کرد لەسەر هەر تاکێکی موسڵمان، تایبەتتر لەسەر گەنجەکان.

جاران ئەگەر کەسێك زینای بکردایە زۆر بە زەحمەت شوێنی دەست دەکەوت تا زیناکەی تێدا ئەنجامبدا وەکاتێکیش زیناکەی دەکرد دەیشاردەوە، بەڵام ئێستا ئاسانکاری ئەوەندە زۆر کراوە هەرکەسێك بیەوێ دەتوانێ زۆر بەئاسانی داوێن پیسی ئەنجامبدا.

لەم وڵاتەدا هەر شوێنێك دەکرێتەوە یان هەرجۆرە تەکنەلۆژیایەك دێ زیاتر سوود لەلایەنە خراپەکەی وەردەگرن نەك لایەنە باشەکانی، ئەدی ئەگەر ئەو شوێنەی کە دەکرێتەوە بارڕ و مەساج بێ دەبێ چۆن ئەم میللەتە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات؟.

بابزانین لەبارڕ و مەساجەکانی ئەم وڵاتە چی دەگوزەرێ ...

## لە مەساجەکان ...

مەساجەکان شوێنی شێلانی لاشە و پشوودانی لاشەیە، بەڵام لێرە لەبەر ئەوەی ئافرەتان کارمەندن لەو شوێنانە و کاری شێلان بۆ پیاوان ئەنجام دەدەن زۆرترین بەریەککەوتن ڕوودەدات لەنێوان پیاو و ئافرەتەکان، بۆیە مەساجەکان ماناو مەبەستەکەی خۆی لەدەست دەدات کەبریتیەلە شێلان و پشوو وە دەبێتە گەورەترین خانەی لەشفرۆشی .

لەم هەرێمە زۆرن ئەوانەی تەنها بۆ ئەنجامدانی داوێن پیسی سەردانی مەساجەکان دەکەن، وە زیاتریش گەنجەکانن، ئەمەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هیچ ئاسانکارییەك بۆ گەنجان ناکرێ بۆ ئەنجامدانی هاوسەرگیری وەهەروەها بێکار کردنی گەنجانیش لەلایەن حکومەتەوە وەکردنەوەی ئەوشوێنانەش کەبەنرخێکی کەم دەتوانی داوێن پیسی تێدا ئەنجام بدەی، هۆکارن بۆ ئەوەی گەنجان لە پرۆسەی هاوسەرگیری دووربکەونەوەو پەناببەنە بەر داوێن پیسی.

گەنجێکم دواند کە یەکێك بوو لەوانەی زوو زوو سەردانی مەساجەکانی دەکرد و لێم پرسی: لەبەر چی دەچیە ئەو شوێنە ؟ بۆچی بەشێوازێکی پاك و سەربەرزانە هاوسەرگیری ئەنجام نادەی ؟ ...

گوتی: کە زانکۆم تەواو کرد بێ ئیش دەسوڕامەوە زۆر هەوڵی ئەوەم دەدا تا کارێك بدۆزمەوە و بتوانم کەمێك پارە کۆبکەمەوە و دواتر ئەو کچەی کە لەدڵی

خۆم نیشانم کردبوو بچمە داوای و هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجام بدەم، بەڵام ڕۆژێك هەواڵم بۆهات ئەو کچە کوڕێك چۆتە داوای منیش زۆرم پێناخۆش بوو، بەدایك و باوکمم گوت بڕۆنە داوای ئەو کچە، بەڵام نەکرا لەبەر ئەوەی ماڵی باوکی داوای مارەیی و زێڕێکی زۆریان کرد، من بێکاربووم و باوکیشم ئەو کەمە پارەیەی کە دەهاتە دەستی بەزەحمەت بەشی بژێوی خۆمانی دەکرد.

کچە شووی کرد و خەم و پەژارەیەکی زۆر دایگرتم، دوای ئەوە ئیتر ئومێدێکم بە ژنهێنان نەما ئێستا ئەو کەمە پارەیەی دێتە دەستم هەمووی لەمەساجەکان خەرج دەکەم، ئەو ئافرەتانەی لێرە کاردەکەن سێکسم لەگەڵ هەموویان کردووە، هەوڵی وازهێنانم داوە بەڵام هەرکاتێ سەیری بێ کاری و بێپارەیی خۆم دەکەم دەست بەو کارە پیسە دەکەمەوە.

ئەو کوڕە بەدەم ئاخێکەوە گوتی: لەم وڵاتەدا هیچ شوێنێکی نیە بۆ هەژاران بۆ ژیانێکی زۆر سادەش ئیتر دێم و غەم و ناخۆشیەکانی خۆم لێرە هەڵدەڕێژم.

ئەوە کەسێکی هەژار بوو قسەی دڵی خۆی کرد بەڵام چەندانی تر کە لە دەوڵەمەندەکان بوون نەیان ویست هیچ بڵێن تەنها یەکێکیان ئەوەندەی گووت: گوتی پارە بۆچی باشە ئەگەر لەشتێکی وادا خەرجی نەکەی و بۆ خۆت تۆزێ ڕانەبوێری ؟.

لەمەساجەکان کەسانێك هەژاری ناچاریان دەکات لەوێ کۆ ببنەوە و کەسانێکیش پارەی زۆر .

## لەبارِەکان...

ئەوانەی لە بارِەکان ئیش دەکەن ئافرەتن ئافرەتەکان ئەو ئافرەتانەن کە سنگیان ڕووتە و سنگیان گەورەیە ئەوانەن کە قاچیان ڕووتە و سمتیان گەورەیە ئەوانەی کەبەناسکی و لەنجەو لار دەڕۆن و دەچنە باوەشی پیاوانەوە ئەوانەن کە ئامادەن سەما لەپێش پیاوان بکەن لەگەڵ ئاوازو گۆرانیەوە.

لەو شوێنانەشدا بێگومان داوێن پیسی ڕوودەدات و ئاسانکاری زۆر دەکرێ بۆ ئەنجامدانی داوێن پیسی ئەمەش لەپێناو بەدەستهێنانی برِێ پارە و بەسەربردنی کاتێکی کەمی خۆشی لەلایەن داوێن پیسانەوە .

دوو گەنج دەچنە بارێك لەوێ یەکێك لە گەنجەکان عاشقی یەکێك لە کارمەندەکان دەبێ، بانگی ئەو کارمەندە دەکەن ئەویش دەچێتە لایان دوای ئەوەی داوای هەندێ خواردنەوە دەکەن و ئەوکارمەندەش بۆیان دێنێ، دوای ئەوە داوا لەکارمەندە کچەکە دەکەن کەمێك لایان دانیشێ ئەویش کەمێك دادەنیشێ ئەو دانیشتنە کەمە دەبێ چی بەدوای خۆی دا بێنێ؟؟.

بەڵێ مەوعیدیان دانا کاتێ کە درەنگانی شەو کچە کارەکەی تەواو بوو بەیەکەوە کەمێك کات بەسەر بەرن و لەبەرامبەر ئەوەشدا برێك پارە دەدەنە ئەو کارمەندەکچە.

دوای نیوەی شەو ئەو دوو هاورێیە کچە کارمەندەکە دەبەنە شوێنێکی چۆڵ و هەدووکیان زینای لەگەڵدا ئەنجام دەدەن .

## دوكانەكانی مەی خواردنەوە ...

بێگومان هیچ خێرێك لەوكەسانەدا نیە كە خۆیان بێهۆش دەكەن،لەبەر ئەوەی كاتێك كە خۆیان بێهۆش دەكەن ئەگەری ڕوودانی هەموو كارێكی نابەجێیان لێدەكرێ لەپێش هەمووشیان نێربازی و زینا...

دراوسێیەكمان دەیخواردەوە گوتی: ئەو شوێنانەی كە مەی لێدەخورێتەوە تاوانی زۆری تێدا ئەنجام دەدرێ.

گوتم : تۆ جگە لەخواردنەوەی مەی هیچ تاوانێكی تر ئەنجام دەدەی ؟

گوتی: ئەوانەی كە تازە مەی دەخۆنەوە زوو سەرخۆش دەبن ئێمەش دەچینە لایان و مەی زیاتریان پێدەدەین دواتر ئەوان تەواو بێئاگا دەبن و ئێمەش كاری خۆمانیان لەگەڵدا دەكەین واتە "نێربازی"یان لەگەڵدا دەكەین، وە ئەگەر ئەو كەسانەمان دەست نەكەوێ ئەوە دەچینە ئەو شوێنانەی كە ئافرەتەكان بۆ بڕێك پارە داوێن پیسی ئەنجام دەدەن ئێمەش بڕێك پارەیان پێدەدەین و زینایان لەگەڵدا ئەنجام دەدەین.

## له ئیسلامدا ...

هەموو شتێکی سەرخۆشکەر حەرامە جا بڕەکەی زۆربێ یان کەم، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **( كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَمَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ )**[١]. واتە:- هەرشتێ خەڵك سەرخۆش بکات حەرامە و هەرچیش زۆرەکەی سەرخۆشت بکات کەمەکەشی حەرامە.

وەلە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: **(كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ)**[٢]. واتە: هەموو شتێ مەست کەر بێت حەرامە و قەدەغەیە وە هەموو مەستکەرێکیش (ئارەقە ) مەیە.

ئەوانەی کە تەوبە ناکەن و لەسەر خواردنەوەی مەی بەردەوام دەبن و لەسەر ئەو کارەش بەردەوام دەبن تا مردن ئەوانە لەبەهەشتدا

لەخواردنەوەی مەی بێبەش دەبن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **(مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَفِي الدُّنْيَا ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا، حُرِمَهَا فِي الآخِرَةِ )**[٣]

واتە:- هەر کەسێك لەدنیادا مەی بخواتەوە و تەوبەی لەسەر نەکات لەبەهەشت نایخواتەوە.

---

[١] - ابن ماجه

[٢] - سنن النسائي

[٣] - البخاری

## هۆکاری پێنجەمی داوێن پیسی :

## سیحر و جادوو ...

ڕەنگە زۆربەمان وابیر بکەینەوە کە سیحر و جادوو پەیوەندی چیە بە داوێن پیسیەوە، ئەمەش مانای  ئەوە دەگەیەنێ ئێمە بێئاگاین لە کاری ساحیر و جادووبازەکان، بێئاگاین لەوەی کە ڕۆژانە چەندین ئافرەت لەژێر ناوی" چارەسەر"ی کێشەکانیان هەڵدەخەڵەتێنرێن و داوێن پیسیان لەگەڵ ئەنجام دەدرێت و ئافرەتەکان پاکیان لەدەست دەدەن و پیس دەکرێن .

ساحیرەکان و جادووبازەکان لەژێر ناوی بەناو"شێخ و مەلا و پیاوچاك "و تاد ... کارەپیسەکانیان ئەنجام دەدەن.

نمونەی ئەو ئافرەتانە زۆرن کە لەلایان ساحیر و جادووبازەکان داوێن پیسیان لەگەڵ کراوە، لەوانە ...

ئافرەتێك گووتی: مامۆستا من خاوەنی ماڵ و منداڵم و جێگەو ڕێگەی خۆم هەیە و هەمیشە کەسێکی بەحەیا و بەئابڕووبوومە، بەڵام لەبەر دروست بوونی هەندێ کێشە لەنێوان من و پیاوەکەم، من داوێن پاکی خۆم لەدەستدا ...

دەڵێ: سەرەتا من و پیاوەکەم ژیانێکی ئاسایی دەژیاین و بووینە خاوەن منداڵ، دوای چەند ساڵێك هەندێك کێشە لەنێوانمان دا ڕوویدا و کێشەکان کەمێك

درێژەیان کێشا هەرچەندە کێشەکان گەورەش نەبوون بەڵام من بەگەورە دەمبینی و زۆر خەمم پێی دەخوارد.

ڕۆژێکیان دراوسێیەکمان هاتە ماڵمان منیش کەمێك باسی کێشەو گرفتەکانی خۆمم بۆی کرد، ئەو دراوسێیەمان ڕێنمایی شێخێکی بۆکردم گوتی: بڕۆ لای ئەو شێخە ڕەنگە سیحرت لێکرابێ، ئەو شێخە پیاوێکی باشە بەڵکو دوعایەکت بۆ بکا و ڕێگایەکی باشت نیشان بدا، ئافرەتی تر چووینەلای و دوعا و نوشتەی بۆ کردوونە بەجۆرێك کاریگەری هەبووە کە پیاوەکانیان کەوتۆتە دەستیان و ئەوان هەرچی بڵێن پیاوەکانیان جێبەجێی دەکەن هەرچی بکەن پیاوەکانیان بێدەنگی لەئاستانا دەنوێنن.

دەڵێ: لەبەر ئەوەی زۆر دەترسام لەوەی کە کێشەکانمان گەورەتر بێ و بگاتە ئەو حاڵەتەی کە تەڵاق بدرێم بڕیارمدا بچمە لای شێخەکە و چارەسەرێکم بۆ بدۆزێتەوە.

دەڵێ: کەچوومە لای وەکو فریشتە خۆی نیشان دەدا و بە پاکی قسەکانی لەسەرەتاوە دەست پێکرد، دوای ئەوەی چەند پرسیارێکی لێکردم دەربارەی کێشەکان گووتی: تۆ سیحرت لێکراوە سیحرەکەش پیسە و دەبێ بە پیسی سحرەکە بەتاڵ بکەمەوە، واتە :"پیسی بە پیسی لادەچێت"

گوتی: سحرەکەی تۆ لە "ڕەحمت" دایە و لێی پیس کردووی، بۆ ئەو سحرە لاناچێ تاکو پیسی لەو شوێنە نەکەی.

دەڵێ : منیش لەمەبەستەکەی نەدەگەیشتم گوتم : چۆن بەپیسی لای دەبەیت؟

گوتی : من کەسێکی لەخواترسم و حەز لەوکارە ناکەم بەڵام ناچارم ئەو کارە بکەم لەبەر تۆ ئەویش ئەوەیە کە دەبێ من ئاو " تۆو " ی خۆم لەڕەحمت بکەم بۆ ئەوەی سیحرەکە بسوتێنێ و نەیهێڵێ وەکو گوتم من نامەوێ کاری لەو جۆرە بکەم بەڵام چارەسەرەکەی تۆ بەو شێوەیەیە .

دەڵێ: منیش گوتم: باشە بەڵام باکەس نەزانێ من سحرم لێکراوە و تۆش بەوشێوازە سحرەکەت بەتاڵ کردۆتەوە، شێخیش گوتی: دڵنیابە هیچ کەس نازانێ وە منیش ناچارم ئەگەر نا من لەو جۆرە کەسانە نیم کە ئەو جۆرە کارانە بکەم .

دەڵێ: شێخ هەرچی حەز و ئارەزووی پیسی هەبوو لەمندا بەتاڵی کردەوە و بەشێوەیەکی توند و بەئازارەوە لەگەڵم جووتبوو و ئاو " تۆوە" کەشی لەناو ڕەحمی کردم و زۆر شەکەت و هیلاکی کردم، جگە لەوە پارەشی لێسەندم لەبەر ئەوەی چارەسەری بۆ کردوومە .

دوای ئەوە خۆم کۆکردەوە و بەرە و ماڵێ بەڕێ کەوتم، کە گەیشتمەوە ماڵێ کاتی بانگ بوو کە گوێم لەبانگ بوو ویستم بچم نوێژ بکەم کە چووم بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن گەڕامەوە دواوە بەخۆمم گوت: من ناتوانم نوێژ بکەم لاشەم پیسە، چوومە گەرماو خۆم پاککردەوە کەچوومە سەر بەرماڵ بۆ نوێژ کردن لەڕووم نەهات نوێژ بکەم ئاااای چیم بەخۆمکرد ! من داوێن پیسیم

ئەنجام داوە؟!! من خیانەتم لە شەرەف و ئابڕووی پیاوەکەمدا کرد من ئابڕووی پیاوەکەمم نەپاراست.

بەڵێ ئێستا ساڵێك تێپەڕیوە بەسەر ئەو داوێن پیسیەی کە ئەنجامم دا و مانگێك تێپەڕیوە بەسەر تەڵاق دانمدا ئێستا لەماڵی باوکم کەوتووم قێز لەخۆم دەکەمەوە لەبەرئەوەی پیاوەکەم بەوەی زانی کەمن کارێکی وام کردووە بۆیە منداڵەکانی بردە لای خۆی و بەبێ دەنگی تەڵاقی دام ماڵی باوکم ئەو بابەتە نازانن بەڵام من لەناو شەرمەزاری و بێ حەیایی و دووری منداڵەکانم گیانم خەریکە دەربێ و چاوەڕوانی مەرگم بەڵام هێشتا نەهاتووە .

پرسیاری ئەوەم کرد پیاوەکەی چۆن بەو کارەی ئەوی زانیوە ؟ گوتی : ئەو ماوەیەی نێوانی ئێمە خۆش نەبوو پیاوەکەم نەدەهاتە لام و بەتەنیا دەخەوت، مانگێك دوای تێپەڕ بوونی ئەو کارەپیسەی نێوان من و شێخ هەستم کرد لاشەم بەرەو لاواز بوون دەڕوا کە چووم پشکنینم کرد دەرکەوت دووگیانم، دوای چەند ڕۆژێك پیاوەکەم هەستی پێ کرد و زانی من دووگیانم و سەرەتای دووگیانیمە، پیاوەکەم بەسەرسامیەوە پێی گوتم: ئەتۆ دووگیانی ؟ منیش گوتم : نەخێر دەگیانی چ؟ هەر لەو کاتەدا بیرم لەوە کردەوە کە منداڵەکە لەبار ببەم، هەمان ڕۆژ چوومە لای دکتۆر بۆ ئەوەی منداڵەکەم لەبار ببەم و کارەکەشم ئەنجامدا، بەڵام ئەوەی لێی بێئاگابووم ئەوەبوو کە پیاوەکەم ئەو ڕۆژە چاودێری کردبووم و لەدوام هاتبوو و بە منداڵ لەبار چوونەکەشی زانیبوو ، دوای ئەوە بەڵێنی شاردنەوەی ئەو کارەی پێدام و تەڵاقی دام.

کچێك دەڵێ : مامۆستا من کەوتمە داوی خۆشەویستی لەگەڵ کوڕێك ماوەیەکی زۆر بەیەکەوە بوین چەند داواکاریەکم هات لەبەر ئەو کوڕە ڕەتمکردەوە و شوم نەکرد، چەند جارێك داوام لەو کوڕە کرد بێتە داوام بەڵام هەر جارە و بە بیانویەك خۆی ڕزگار دەکرد و بابەتەکەی منی دەبردە لایەکی تر.

ڕۆژێکیان ئەو کوڕە تەلەفۆنی بۆکردم و گووتی: ئەوە دواجارە تەلەفۆنت بۆ دەکەم نێوانی من و تۆ کۆتایی پێهات

گوتی: من نامەوێ لەگەڵ کچێك هاوسەرگیری بکەم کە خیانەتی لە دایك و باوکی خۆی کردبێ ئەگەر کچێك خیانەتی لەکەس و کاری خۆی بکات بەیانی لەمنیشی دەکات.

گوتی: منیش زۆر پاڕامەوە کە وازم لێنەهێنێ بەڵام سوودی نەبوو .

دەستە خوشکێکم هەبوو کە ئاگاداری هەموو شتێکی من بوو هاتە لام و گووتی: کەسێکی باشم دۆزیوەتەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی تۆ، منیش بەپەرۆشەوە گووتم: کێ؟ گووتی: برۆ لای فڵانە شێخ و بەسەرهاتی خۆتی بۆ بگێڕەوە بەڵکو چارەسەرێکت بۆ بدۆزێتەوە.

دەڵێ : منیش چوومە لای و باسەکەم بۆ گێڕایەوە، شێخ گووتی : ئەو کێشەیەی تۆ بەدوو ڕێگە چارەسەر دەکرێ، جارێ یەکەم ڕێگە تاقی دەکەینەوە ئەگەر ئەو ڕێگەیە سەریگرت باشە ئەگینا ناچارین ڕێگەی دووەم بەکاربێنین .

دەڵێ : ڕێگەی یەکەم بەکارهێنانی نوشتە و سیحربوو کردی لەبەرامبەردا بڕەپارەیەکی زۆری لێسەندم ئەویش هەندێ زێڕم هەبوو بە نهێنی فرۆشتم و پارەکەم پێیدا کە یەك ملیۆن بوو .

سیحرەکە کاریگەری زۆری لەسەر ئەو کوڕە دروستکرد، ماوەیەك دەستمان بەقسەکردن کردەوە و تەلەفۆن لەنێوانمان بەردەوم بوو بەڵام ئەو کوڕە هەردەم دەیگووت دڵم تووندە و بێزارم و هەندێ قسەی وای دەکرد.

شەوێکیان تەلەفۆنی کرد گوتی : لەکەینێوە سحرت لێم کردووە؟

گوتی: منیش شڵەژام و گوتم : سیحری چی ؟

گوتی: ئەو ماوەیەی دڵم توووند بوو و بێزار و بێتاقەت بووم هەموو شوێنێکم کرد تا چارەسەریەك بدۆزمەوە تا لەکۆتاییدا تووشی مامۆستایەکی بەڕێزی ئاینی بووم و باسەکەم بۆی کردەوە و ئەویش ڕێگەی نیشاندام و دۆعای لەسەرم خوێند تا سیحرەکەی بەتاڵ کردەوە .

دەڵێ : ئەو کوڕە قسەی زۆری پێ گوتم و دواتر مۆبایلەکەی لەسەر داخستم و جارێکی تر بێئومێد بوومەوە، دەڵێ : کاتێك بەدڵێکی پڕ لەخەمەوە چوومە سەرجێگا بیری ئەو شێخەم کەوتەوە کە پێی گوتبووم ئەگەر ڕێگای یەکەم سەری نەگرت ئەو کاتە ڕێگای دووەم بەکاردێنین .

دەڵێ: بەیانی زوو خۆم گەیاندە شێخ و باسەکەم گێڕایەوە، شێخ گوتی: ئێستا یەك ڕێگات لەپێشە و ئەمجارەیان دڵنیابە ئەو کوڕە دەبێتە هی تۆو دێتە داواشت.

دەڵێ: منیش بەپەرۆشەوە گووتم: تەنها ئەو کارەم بۆ بکە هەرچی داوای دەکەی بیکە.

شێخ گوتی: ئەو کوڕە دڵی لەسەرت نەماوە و تۆی لەلا ناشرین بووە جا بۆ ئەوەی دڵی بکەوێتەوە سەرتۆ و تۆش لەبەر چاوی جوان بەدەربکەویەوە دەبێ هەندێ قسەی کرد منیش ڕازیبووم.

کە بەئاگا هاتمەوە هەموو گیانم دەلەرزی لاشەم ڕووت بوو، بەخێرایی خۆم کۆکردەوە و جلەکانم لەبەر کرد و ئەوێم جێهێشت، نەمدەتوانی بەباشی هەنگاوەکانم بهاوێژم لەبەر ئەو ئازارە زۆرەی کە هەمبوو بە هەرحاڵ و دەردەسەری خۆم گەیاندەوە ماڵ و ماوەیەك نەمدەتوانی دانیشم .

ئەو کچە گوتی: مامۆستا تکایە هاوارم بگەیەنە بە خەڵکی بەتایبەتی ئافرەتان ئامۆژگاریان بکەن کە بەهیچ شێوەیەك نەچنە لای ئەو ساحیر و داوێن پیسانە ، مامۆستا ئەو شێخە داوێن پیسە بەقسەکانی بێئاگای کردم و لە دواوە لەگەڵم جووتبوو ئازارێکی زۆری دام پارەی لێسەندم پاکی لێسەندم و ئەو کوڕەشی بەیەکجاری لێ دوور خستمەوە ، ئێستا ئەو کوڕە هاوسەرگیری

کردووه منیش بە کۆمەڵێ سەرشۆڕیەوە چاوەڕوانی هاتنی کەسێکم بۆ ئەوەی شوی پێبکەم و تەمەنیشم هەڵکشاوە.

بەڵێ بەڕێزان ئەوە دوو بەسەرهاتی ڕاستەقینەی کۆمەڵگاکەمانە بەسەرهاتەکان هێندە زۆرن ئافرەتان هێندە زۆرن کە فێڵیان لێکراوە و داوێنیان پیس کراوە کە بەژمار نایەن بەڵام ئەو دوو بەسەر هاتە بەسە بۆ کەسێك کە پەند وەربگرێت.

## حوکمی چوونە لای ساحیرو جادوو بازەکان و زیانەکانی

ڕۆیشتن بۆلایان حەرامە و هەرکەس بڕواتە لای ساحیران و بڕوایان پێ بکات ئەوە ئەو کەسە لەبازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە و کافر دەبێت بەو دینەی کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیوە، ڕۆیشتن بۆلایان لە تاوانە هەرە گەورە لەناوبەرەکانە وخانەوەکەی لەناودەبات و کەسێك هەر کێشە ودەردێکی هەبوو، حەز وئارەزوویەکی هەبوو، ئومێدێکی هەبوو، ترسێکی هەبوو، بۆ جێ بەجێکردنیان پەنا بۆ ساحیر ببات، دڵی پەیوەست دەبێ بەغەیری خواوە، ئەمەش شیرکە، وە سیحر کردن یەکێکە لەو شتانەی یەکخواپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوە، زانایان لە باسی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام «نواقض الإسلام» یەکێك لەو هەڵوەشێنەرەوانەی باسی دەکەن، سیحر کردنە، واتە: بە سیحرکردن ئیسلامەتیەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

بە بەڵگەی چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ:

* پەیامبەر ﷺ دەفەرموێ:- ( مَنْ أَتَى عَرَّافًا أَوْ كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ)[1].

واتە: هەر کەسێك بڕوات بۆ لای تاڵەگرێك یان جادوگەرێك بڕوا بکات بەوەی پێی دەڵێت، ئەوە کوفری کردوە بەوەی بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ. قَالُوا: وَمَاهُنَّ يَارَسُولَ اللهِ؟ قَالَ : (الشِّرْكُ بِاَللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاتِ الْمُؤْمِنَاتِ)[2].

واتە: خۆتان بپارێزن لە حەوت تاوانە لەناوبەرەکە: شیرك وسیحر و.. ئەمانە دین و ئیمانی موسوڵمان بەرەو لەناوچون دەبەن وچارەنوسی دەسوتێنن.

* چل شەو وچل ڕۆژ نوێژی قەبوڵ نابێت، پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةُ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً)[3].

---

[1] - مسند إمام أحمد

[2] - البخاری

[3] - مسلم

واتە: هەر کەس بڕواتە لای تاڵەگرێك وپرسیاری شتێکی لێ بکات تا چل ڕۆژ نوێژی قبوڵ نابێت.

* ساحیران ئەم کارانە ناکەن لە بەرامبەر بڕێك پارە نەبێت، کە بە ستەم وەریدەگرن، ئەو برە پارەیەش بە پێی دەقی فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ وڕای سەرجەم زانایان حەڕامە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:

**( نَهى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ ... )**[١].

واتە: پەیامبەر ﷺ نەهی کردوە لە نرخی سەگ، ونرخی زیناکردن و فاڵچی وجادوگەر.

* کە دەڕۆی بۆ لای ساحیرەکە وەکو ئەوە وایە پێی بڵێی من دان دەنێم بەو کارەی تۆ، بەڕاستی ئەم کارەی تۆ کارێکی چاکە، بۆیە هەرکەس بڕوای پێیان هەبێت ناڕواتە بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:

**(لاَ يَدْخُل الجَنَّة مُؤْمِنٌ بِسِحر)**[٢].

واتە: ناچێتە بەهەشتەوە کەسێك باوەڕی بەسیحر هەبێت.

---

[١] - سنن النسائی

[٢] - مسند إمام أحمد

* هەرکەس بڕوا بۆلایان تا سیحری بۆ بکەن لە ئوممەتی موحەممەد نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **(لَيْسَ مِنَّا مَنْ سَحَرَ، أَوسُحِرَلَهُ، أَوتطَيَّرَ، أَو تُطِيِّرَلَهُ، أَوتكَهَّنَ، أَوتُكُهِّنَ لَهُ).**

واتە: لە ئێمە نیە ئەوەی سیحر دەکا وئەوەشی سیحری بۆ دەکرێت، ئەوەی غەرری دەکات وئەوەشی داوای کردنی دەکات، ئەوەی تاڵە دەگرێتەوە وئەوەشی داوای گرتنەوەی دەکات.

* چارەسەرکردن بە سیحر چارە سەر کردنە بە حەڕام، لە کاتێکدا پەیامبەر ﷺدەفەرموێ: **(إنَّ اللهَ أَنْزَلَ الدَّاءَ وَالدَّوَاء، وَجَعَلَ لِكُلِّ داءٍ دواءً، فَتَدَاوَوْا، ولا تَدَاوَوْا بِالْمُحَرَّم).**

واتە: بێگومان خوای گەورە دەرد ودەرمانی دابەزاندووە و بۆ هەر دەردێکیش دەرمانی داناوە، بۆیە بە دوای چارەسەردا بگەڕێن وبەڵام چارەسەری حەرام بەکار مەهێنن .

ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڕەشەی دیار و ڕوونن بۆ کەسێك کە بڕوا بەساحیر و جادوو بازەکان دەکات و دەچێتەلایان، جگە لەوە وەك لەپێشتردا نمونەی زیندوومان باس کرد کە ساحیر و جادووبازەکان جگە لە کوفرکردن بەخوا داوێن پیسیش ئەنجام دەدەن، لەبەر ئەوەی یەکێك لە مەرجەکانی بوون بە ساحیر ئەوەیە کەدەبێ داوێن پیسی لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆی ئەنجام بدات کە مەحرەمی خۆینە وەك ( خوشك و دایك و

پوور و ...تاد )، بۆیە ساحیران دەست ناپارێزن لە هیچ کەسێ، وە پارەیەکی زۆریش لەکەسەکان وەردەگرن بەناوی چارەسەر و هیچ چارەسەریەکیشیان لەدەست نایە.

بۆیە ئەگاداربە و خۆت لەسەردانیکردنیان و نزیکیان بپارێزە .

ئەگەر نیشانەی سیحر لێکردنت لەخۆتا بەدی کرد ئەوکاتە باشترین شت ئەوەیە کە کەسەکە خۆی ڕوقیەی شەرعی لەسەر خۆی بخوێنێ، ئەگەر نا بابچێتە لای مامۆستایەکی بەڕێز تاوەکو بەشێوەیەکی دروست و شێوازێکی شەرعیانە ڕوقیەی شەرعی بەسەردا بخوێنێ، خوداش زاناترە بەهەموو شتێك.

## هۆکاری شەشەمی داوێن پیسی :

## ڕوولەیەکتروەرگێڕان و گرینگی نەدان بەیەکتر...

ئەم جۆرەیان تایبەتە و لەنێوان" ژن و مێرد" دا ڕوودەدات.

ئافرەت و پیاو کاتێك هاوسەرگیری پێك دێنن، زۆر جار ئەو هاوسەرگیریە تەنها لەسەر حەزی جنسی بنیاد دەنرێ واتە پیاوەکە تەنها بیر لە تێرکردنی ئارەزووەکانی دەکاتەوە بیر لەوە ناکاتەوە کە خێزان پێویستی بە لایەنی ماددی یە وە پێویستی بە گرنگی دانە وە پێویستی بە پەروەردە و گونجانە لەگەڵ دەورووبەردا وە دروستکردنی خزمایەتیە و لەکۆتاییدا شەرەف و ئابڕووی دوو بنەماڵەشی دەکەوێتە دەست.

هاوسەرگیری قۆناغێکی هەستیارە و پێویستە بەشێوازێکی چاك و باش مامەڵە لەگەڵ ئەو قۆناغەدا بکرێ بۆ ئەوەی خێزانێکی سەرکەوتوو دروست بێ، خێزانێك کە پڕبێ لە ڕەوشتی جوان و ڕێزگرتن و پەروەردە ئەوانەی کە بەجوانی لە مافەکانی ژن و مێردا تێگەیشتوون ئەوانە کەسانێکی سەرکەوتوون و دەرگای فیتنە لەسەر خۆیانا دادەخەن ،وە ئەوانەی کە تەنها بیر لە سێکس دەکەنەوە لەگەڵ ئافرەتان ئەو جۆرە پیاوانە ناتوانن گرنگی بە خێزان و منداڵەکانیان بدەن، ئەم جۆرە گرنگی پێنەدانەش بێگومان زۆر جار کێشەی کۆمەڵایەتی گەورە و هەندێ جار داوێن پیسی و تەڵاقیشی لێدەکەوێتەوە، وە

ئەو جۆرە پیاوانە هیچ لە ئاداب و تێکەڵاوی و مافەکانی بەرامبەری نازانێ یان کەمێ شارەزایی هەیە و ناتوانێ بەم کەم زانینەی خێزانەکەی لە بێ پەروەردەیی و ئەگەری ڕوودانی بەدڕەوشتی بپارێزێ.
ئەمەش فیتنەی گەورەی بەدواوە دێ ...
**یەکەم** : داواکردنی سەرجێی و ڕەدکردنەوەی لەلایەن کەسی بەرامبەر.
داواکردن زیاتر لەلایەن پیاوانەوە دەبێت و ڕەدکردنەوەکەش لەلایەن ئافرەتەوە زیاتر ڕوودەدات، بێگومان ئەمەش بێکێشە نابێ، لەبەر ئەوەی پیاو زۆر بەی کاتەکانی لەدەرەوە بەسەردەبات وە ئافرەتانی جیاواز دەبینێ،کاتێ دەگەڕێتەوە ماڵ پێویستی بەوە دەبێت کە ئافرەتەکە لەباوەشی خۆی بیحەسێنێتەوە و ئارامی پێ ببەخشێ ، وە داواکاری پیاوەکەی بەپێی توانا جێبەجێ بکات و نەرم و نیانی کە سروشتی ئافرەتە بەرامبەر پیاوەکەی بنوێنێ.
بەڵام وەکو باسمان کرد لەبەر نەبوونی ڕۆشبیریەکی ئیسلامی ئەو جۆرە نەرم و نیانیە و خۆشەویستی دەربڕینە لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا زۆر کەمە، کاتێکیش کە ڕۆشنبیری کەم بوو بێگومان بێ سەرو بەری و کێشە سەرهەڵدەدات.
لێرە کاتێك پیا داوای سەرجێی لە خێزانەکەی دەکات زۆر جار خێزانەکەی بەبەهانەی ئەوەی کە ماندووە داوای پیاوەکەی ڕەد دەکاتەوە، ئەمەش کێشە بۆ پیاوەکەی دروست دەکات لەبەر ئەوەی پیاوەکە پێویستی بە جووتبوون هەیە و پێویستی بەوە هەیە کە ئەو شەهوەتەی هەیەتی بەشێوەیەکی حەڵاڵ و تەندروست دایبمرکێنێ، وە ئەو کاتەی کە خێزانەکەی گوێڕاڵی ناکا ئەو کاتە

پیاوەکە ئەگەر ئیمانێکی بەهێزی نەبێت هەوڵ دەدات پەنا بۆ شێوازی تر ببات بۆ دامرکاندنەوەی شەهوەتی، جا ئەو پەنابردنەش دووشێواز دەگرێتەوە ...

*یەکەم: خوی نهێنی ( دەستپەڕ ) .
*دووەم: زیناکردن.
بێگومان هەردوو ڕێگەکە حەرامە بەڵام زینا تاوانەکەی زۆر گەورەترە خوای گەورە پەنامانبدا.

**دووەم :** زۆر جۆر پیاو هەن کە ناتوانن خێزانداریەکی ڕێك و پێك بکەن ئەمەش بەپێی کەسەکان دەگۆڕێ
پیاوانێ هەن کە تەنها دوای مادده کەوتوون و خێزانەکانیان فەرامۆش کردووە و گرنگیان پێنادەن، هەندێ جار بەچەند شەو و ڕۆژ ناچنەوە ماڵەکەیان و کەمێك لەلای هاوسەرەکانیان ئارامبگرن بەمەش بۆشایی هاوسەرگیری دروست دەبێ و دواتریش بەریەککەوتنی نائاسایی دروست دەبێ کە هەندێ جار بە خیانەتی هاوسەرگیری کۆتایی دێت.
هەندێ پیاوی تر هەن تا ڕاددەیەك گرنگی بەخێزانەکانیان دەدەن بەڵام لەدەرەوەی پەیوەندی هاوسەرگیری پەیوەندی تریش دەبەستێ وە زۆر جار پیاوان ئەو پەیوەندیە بە ئاشکرا و لەبەر چاوی خێزانەکانیان ئەنجام دەدەن و لەگەڵ ئافرەتی تردا داوێن پیسی ئەنجام دەدەن، ئەمەشیان لێکەوتەی خراپ و شوێنەواری خراپ بەسەر خێزان و کۆمەڵگەدا جێدەهێڵن.
دوو نمونەی زیندوو ...

دراوسێکەمان زۆر دەوڵەمەندن، خێزانێکی چوارکەسین... پیاوێك و ئافرەتێکی جوان و دوومنداڵ.

پیاوەکە شەو و ڕۆژ لەکۆمپانیا کەیەتی و زوو زووش دەڕواتە دەرەوەی وڵات بۆ بازرگانی لەوانە لەمانگێکدا کەمتر لە هەفتەیەك شەوان بگەڕێتەوە ناو ماڵ و منداڵەکانی .

ڕۆژێکیان ئۆتۆمبێلەکەم دەشۆرد، کزەبایەك هات و دەرگای ماڵی دراوسێکەمانی کردە سەرپشت کاتێ ئافرەتەکە هات دەرگاکە دابخا هەستم کرد پیاوێك لەژوورەوەیە، ئەو پیاوەش هیچ لەمێردەکەی نەدەچوو ئەوشتە زۆر سەرقاڵی کردم بۆیە بڕیارمدا چاودێری ئەو ماڵە بکەم .

درەنگانی شەو کاتێ کۆڵان چۆڵ بوو ئافرەتەکە سەرێکی کێشا کۆڵان و دڵنیا بوو کە چۆڵە و پیاوەکەی بەڕێ کرد، منیش لەناو ئۆتۆمبێلەکەم بووم و بەهێمنی دوای پیاوەکە کەوتم هاوڕێیەکیشم لەگەڵ بوو، کەمێك دوای کەوتین تا پێی گەیشتین و گرتمان.

سەرەتا وەکو برای ئافرەتەکە خۆی ناساند بەڵام ئێمە وازمان نەهێنا تا دانی بەوەدانا کە پەیوەندی لەگەڵ ئەو ژنە هەیە ئەوەی لەلام سەیر بوو ئەوەبوو ئەو کەسە دەیگووت جاری واهەیە دووڕۆژ یان سێ ڕۆژ من لەو ماڵە دەمێنمەوە و لەگەڵ ئەو ئافرەتە حەزەکانی خۆمان تێر دەکەین.

دەڵێ: من و هاوڕێکەم هەڕەشەیەکی زۆرمان لێی کرد و پەیمانی دا کە ئیتر نەگەڕێتەوە ئینجا وازمان لێی هێنا .

گوتیشی: من هۆکاری ئەو خیانەتە بۆ گرنگی نەدانی پیاوەکەی دەگێڕمەوە بەرامبەر خێزانەکەی، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە هاوسەرگیری لەگەڵ پارەدا کردووە نەك ئافرەتێك .

کوڕێك کە هاوڕێی خۆمە گوتی: من پەیوەندیم لەگەڵ ئافرەتێك هەیە کە پیاو و منداڵیشی هەیە، سەرەتای پەیوەندیەکەمان دەگەڕێتەوە بۆ دووساڵ پێش ئێستا کاتێ لەیەکێك لە مۆڵەکان یەکترمان بینی لەگەڵ یەکەم بینینا چاوەکانی پەیامی خۆشەویستیان بۆ ناردم، دوای ئەوەی لەو مۆڵە دەرفەتێکم وەرگرت و ژمارەی مۆبایلەکەم پێی دا گەڕامەوە ماڵ و هەندێ ئیشی ئاساییم هەبوو کە دەبوایە بیکەم.

بەیانی بوو لەگەڵ زەنگی مۆبایلەکەم بەخەبەر هاتم کە وەڵامم داوە، ئافرەتێك سڵاوێکی کرد منیش وەڵامم دایەوە و خۆی ناساند و ئەو ڕۆژە هەندێ قسەمان کرد.

دواتر پەیوەندیەکەمان فراوانتر بوو، دوای سێ مانگ پەیوەندی و قسەکردن ئینجا زانیم کە هاوسەر و منداڵی هەیە، ئەویش خۆی باسیکرد و گوتی ئەگەر بەردەوام بی لەگەڵم ئەوە هەرچیت بوێ بۆت دەکەم.

ئەوەی لام سەیر بوو کە ئافرەتەکە زۆر بەپەرۆش بوو بۆ خیانەت کردن، چەند جارێك داوای ئەوەی لێکردم بچمە ماڵیان و دەیگووت: پیاوەکەم ڕۆشتووە و منداڵەکانیش لە قوتابخانەن وەرە کەمێك بۆخۆمان بەتەنها قسەدەکەین و بەیەکەوە دادەنیشین.

دەڵێ: ڕۆژێکیان ئەو ئافرەتە بەتەنها بوو پەیوەندی کرد و زۆری لێکردم تابچمەلای، منیش ڕازیبووم و ئەویش سوپاسی کردم، کەچووم و لەدەرگام دا ئەو ئافرەتە هات و دەرگاکەی کردەوە ... چی دەبینم !! جلێکی تەنك پرچێکی کراوە کەشۆڕ ببۆوە سەر ڕوومەت و شانەکانی... زەردەخەنە ناسکەکەی..!!!.

دەستی گرتم و چوینە ژووری خەوتن و لە تەنیش یەکەوە دانیشتین، سەرەتا کەمێك قسەمان کرد دواتر داوای ئەوەی کرد چاوەکانم دابخەم منیش وام کرد، ماچی کردم ...باوەشی پێداکردم منیش هیچم بیر نەما .... بەڵێ زینام لەگەڵی کرد ...

دەڵێ دوای ئەو ڕۆژە ئێمە بەردەوامین لەسەر ئەوپەیوەندیە سیکسیە و مەگەر هەفتەی ڕۆژێ یان دووان نەچمە لای ئەگینا بەردەوام لەلای ئەوم و زینای لەگەڵ دەکەم.

پرسیاری ئەوەم لێیکرد: ئەو ئافرەتە سەرەتا بۆچی ئەوەندە بەپەرۆشی خیانەت و داوێن پیسی بوو ؟؟

گووتی: منیش هەمان پرسیارم لێیکرد،ئەو ئافرەتە گوتی: پیاوەکەم بەبەرچاوی من قسە لەگەڵ ئافرەتی تر دەکات و دەچێتە لایان منیش لەڕقی ئەو ئەو کارە دەکەم .

بەڵێ بەڕێزان ئەوە دوو بەسەرهاتی ئەم سەردەمەی ئێمەن و ئەو بەسەرهاتانە تا ئێستا بەرداوامن و نەگەیشتوونەتە کۆتایی پەیوەندیەکان بەردەوامن خیانەتەکان بەردەوامن و بەردەوامن .

سەرنج: پێش ئەوەی هاوسەرگیری پێکبهێنی " پیاوبە" لەبەر ئەوەی پیاوەکان ئابڕووی خۆیان و خێزانەکانیان دەپارێزن و ئابڕووی کەسیش لەکەدار ناکەن و مافی تەواویش بەخێزانەکانیان دەدەن ئەوانە ئەوانەن کە خوا لەخۆیان ڕازی دەکەن، وە دڵخۆشترینی خێزانەکانی سەر ڕووی زەمین دەبن.

## هۆکاری حەفتەمی داوێن پیسی :

## مۆبایل و بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ...

بێ سەرووبەری و نەبوونی هۆشیاری کۆمەڵایەتی و دوور کەوتنەوە لەدین هۆکاری سەرەکین بۆ کێشە نانەوە و سەرهەڵدانی بێ ئابڕوویی و لەناچوونی خێزان و نەمانی بەهاڕەوشتییەکان .

لێرە ... بێ سەرووبەریەکی ڕەها هەیە، لەبەرامبەردا پلانێکی تۆکمە و ڕێك و پێك هەیە بۆ تێکدان و نەهێشتنی سەنگ و ئابڕووی خێزان و پیرۆزیەکانی خەڵکی بەگشتی ،وە بەردەام بەچەندین جۆر و ڕێگە کاری لەسەر دەکەن ، وە یەکێك لەکاریگەرییە مەترسیدارەکانیش مۆبایل و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانن کە بەشێکن لەو پەتا مەترسیدارەی کە بەردەوام کاری لەسەر دەکرێ .

تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانیش بەتەنها پەیوەست نییە بەلایەنێك بەڵکو چەند لایەنەیە، ئەویش لەنێوان پیاو و ئافرەت یان پیاو و پیاو یان ئافرەت و ئافرەت کار لەسەر ئەو تۆڕەکۆمەڵایەتیانە دەکەن.

لەگەڵ ئەوەی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بۆ باشە و چاکەکاری بەکاردەهێنرێت، لەبەرامبەریشدا خراپە زۆر زیاتر .

لێرە کەسانێکی نەفس نزم و نابەرپرس ئەو تۆڕانە بۆ هەوەسی خۆیان بەکاردێنێن، هەیانە بۆ خەڵك هەڵخەڵەتاندن هەیانە بۆ فریودان و داوێن پیسی و هەیانە تەنها بۆ چەواشە و ...تاد، بەکاریان دێنن .

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە و تیشکی دەخەینەسەر لەناو ئەو تۆڕانە بریتیە لە داوێن پیسی .

لەناو تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دەست خستنی کەسانی داوێن پیس و ئەنجامدانی داوێن پیسی کارێکی ئەستەم نییە وە هەندێك جار کەسانێك خۆیان داوای ئەوە دەکەن کە داوێن پیسیان لەگەڵ بکەن بە کوڕ و کچیشەوە.

برایەك گووتی : لە فەیس بووك کوڕێك " ئادد"ی بۆ ناردم و داوای هاوڕێیەتی لێکردم منیش وەرم گرت، دوای ئەوەی نامەی نارد و خۆی ناساند و هەندێك قسەمان لەگەڵ یەکتر کرد.

دەڵێ : ئەو کوڕە جارجارە نامەی دەنارد و خۆی لەمن نزیك دەکردەوە، تاوای لێهات بەبەردەوامی قسەی لەگەڵ دەکردم.

شەوێکیان درەنگ نامەی نارد، منیش وەڵامم نەدایەوە و نوستم، بەیانی هەڵسام و خەتی ئەنتەرنێتەکەم کردەوە دووبارە نامەی ناردەوە و نووسیبووی : خۆشەویستم خۆ هیچ نەبووە ؟ ئەمشەو نامەم نارد وەڵامت نەبوو ؟.

کاتێك ئەو شتانەم خوێندەوە زۆرم لا سەیر بوو، خۆشەویستم !! ، گووتی : منیش بۆم نووسی خۆشەویستی چ؟، نامەی ناردەوە نووسی بووی : ( ......) گیان من زۆرم خۆشم دەوێی بەدڵ خۆشم دەوێی و دەمەوێ ئەتۆش هەمان هەستی منت هەبێ ، حەز دەکەم یەکتر ببینین و پیاسەیەك بکەین و زیاتر یەکتر بناسین .

گووتی : منیش گووتم چ خۆشەویستیەك ؟ مەگەر تۆ کوڕ نیت ؟...

گوتی: بەڵێ کوڕم بەڵام حەز دەکەم لەگەڵم بی و تەنها منت خۆشبوێ، لەبەرامبەر ئەوەشدا من هەموو شتێکت بۆ دەکەم و حەزەکانت تێر دەکەم .

ئەو برایە دەڵێ : دوای ئەوە تێگەیشتم کە ئەو کوڕە دەیەوێ من نێربازی لەگەڵ بکەم، دوای ئەوە "بلۆك" م کرد و لەلای خۆمم سڕیەوە .

جگەلەوە ...

ڕۆژانە بە دەیان و سەدان کچ دەکەونە داوی کوڕان ئەو کوڕانەی کەشەیتانن و بەرگی فریشتەیان پۆشیوە، وە کاتێ بەئاگا دێن کار لەکار ترازاوە و حەیا و شەرەفی لەدەست داوە..

مامۆستایەکی بەڕێز گوتی: ڕۆژێکیان لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانەوە نامەیەکی نوسراوم بۆهات، منیش سەیرم کرد و خوێندمەوە موچڕکێکی توند بەلاشەم داهات، لەسەرەتای نامەکەدا کچێك نووسیبووی: مامۆستاگیان ئەوەی بەسەرمن هات کچانی لێ ئاگادار بکەوە با وەکو من نەکەونە تەڵەوە.

ناوەڕۆك و بەسەرهاتی ئەو کچەش بەوشێوەیە وەکو خۆی نوسیبووی دەیخەینە بەردەست ...

مامۆستاگیان من تەمەنم ١٦ ساڵە، خاوەنی مۆبایلی خۆمم و لە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانیش بەشدارم و ئەکاونتی خۆم هەیە .

من و چەند دەستە خوشکێکم لەڕێگەی فەیس بووکەوە بەردەوام لە کۆمێنت و لەڕێگەی ماسنجەرەوە قسە و نامەمان دەگۆڕیەوە.

ڕۆژێك وێنەیەكی ئاسایم بڵاو كردەوە كوڕێك كۆمێنتی نووسی كە من نەمدەناسی، منیش زۆر گوێم پێی نەدا، دواتر بینیم ئەو شتانەی كە پێشتر من بڵاوم كردبۆوە هەمووی لایك كردبوو و كۆمێنتێكی زۆریشی كردبوو.

ڕۆژێكیان ئەو كوڕە لەڕێگەی ماسنجەرەوە نامەی نارد، دوای سڵاوكردن و خۆناساندن كەمێك قسەمان كرد بەیەكەوە و دواتر كۆتایمان پێهێنا و كوڕەكە لە ئاستێكی زۆر بەرز قسەكانی دەكرد و ڕۆشنبیریەكی زۆری پێوەدیار بوو.

هەركاتێ بچومایە سەر هێڵ ئەو كوڕە نامەی دەنارد و كەمێك قسەمان دەكرد و دواتر ماڵئاواییمان لەیەك دەكرد .

ڕۆژێكیان چوومە سەر خەت ئەو كوڕە لەخەت بوو و نامەی نەنارد، زۆرم لاسەیر بوو ! بۆچی ئەمڕۆ نامە نانێرێ !!! ....

كەمێك لەخەت بووم هیچ دەنگی نەبوو، شتێك لەناخەوە پاڵی دەنام و دەیگوت نامەی بۆ بنێرە ئەو كوڕە كوڕێكی باشە ، سەیر بوو تەواوی ئەو كاتەی لەخەت بووم ئەو كوڕە هەموو بیر و هۆشی داگیر كردبووم.

بۆ بەیانی چوومەوە خەت بینیم لەخەتە و نامەش نانێرێ، منیش خۆم پێنەگیرا و سڵاوێكم بۆ نارد، ئەو كوڕەش بەر لەوەی وەڵامی سڵاوەكە بداتەوە نووسی : " خۆشم دەوێی " ، دوای ئەوە لەخەت نەما.

سێ ڕۆژ تێپەڕی لەخەت نەمدەدی، بەڵام چ سێ ڕۆژ!! سێ مانگ یان سێ ساڵ بوو بەلامەوە ، لەبەر ئەوەی خەو و خەیاڵی بردم و لێم وون بوو و دیارنەما، بەردەوام لەخەت بووم و ئەو نەبوو .

ڕۆژی چوارەم لەخەت بینیم خەریك بوو لەخۆشیان باڵ بگرم، بەڵام شەرمم دەکرد نامەی بۆ بنێرم، دەمویست ئەو بینێرێ .

کەمێك لەخەت بووم هەرچاوم لەسەر ئەوبوو نامەبنێرێ بەڵام نامەی نەنارد، منیش هەستم بەدڵتەنگیەکی زۆرکرد و مۆبایلەکەم دانا ویستم بچمە لای دایکم و یارمەتی بدەم لە ئیش و کارەکانی و دوو سێ هەنگاوم نا بۆ لای دایکم، لەناکاو زەنگی مۆبایلەکەم لێی دا ...

بەپەلە سەیرم کرد بزانم ئەوە ؟، کەبینیم .... بەڵێ ئەوە دووبارە نوسیویەتی خۆشم دەوێی دڵم ئەوەندە پێی خۆش بوو هەر باس ناکرێ...

دوای ئەوە وەڵامم دایەوە و کەوتینە گفتوگۆ و بەقسەی خۆش و ڕۆمانسی و داهاتووی ژیانمان ڕۆژەکانمان بەڕێ دەکرد، دوای چەند مانگێك قسەکردن داوای وێنەی کرد ، سەرەتا من ڕازینەبووم و داواکاریەکەیم ڕەتکردەوە بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەوە و هەندێ قسەی کرد یەك لەو قسانەی ئەوەبوو گووتی تەنها تۆ هاوسەرو هاوژینی داهاتووی منی و تەنها تۆم خۆشدەوێ و کاتێ کە بیرت دەکەم تەنها سەیری دەکەم بۆ ئەوەی هەرکاتێ بیرم کردی سەیری دەکەم ، بەو قسانە و کۆمەڵێ قسەی تری بریقەدار کەوتمە داوی و وێنەم بۆی نارد.

ماوەیەك بە ڤیدیۆ قسەمان کرد و ڕۆژان هات و ڕۆی کاتێ کە بەئاگا هاتمەوە پەردەی کچێنیم نەمابوو.

ئەو مامۆستایە بەڕێزە گوتی : منیش گووتم چۆن؟!

ئەویش بۆی نوسیمەوە و گوتی: مامۆستاگیان بە قسە ناسك و بێهۆشکەرەکانی هەموو گیانی داگیر کردبووم، ئەو کاتانەی بەکامیرا قسەمان دەکرد زۆر جار سینگم بۆی بەدەر دەخست بێئاگابووم لەوەی کە ئەو ئەو قسانە و ئەو وێنانە وێنە دەگرێ .

گوتی: ڕۆژێکیان تەلەفۆنی کرد و گووتی: کەسێك دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکات،منیش سەیرم پێهات کێ دەیەوێ قسەم لەگەڵ بکات ؟!!، کچێك تەلەفۆنەکەی وەرگرت و سڵاوی کرد و گووتی: من خوشکی گەورەی ئەوم و ئەو برایەم بەردەوام باسی تۆ دەکات و تۆی زۆرخۆشدەوێ، وە لەگەڵ دایکم و هەندێ خزمی تر بەمزوانە دێینە داوات وە هەندێ قسەی ترمان کرد و دواتر مۆبایلەکەمان داخست.

خۆشیەکی یەکجار زۆر داگیری کردم کە باسکردنی مەحاڵە، دوای نیو سەعاتێ ئەو کوڕە تەلەفۆنی بۆ کردمەوە و دەستمان بەقسەکرد، دواتر گوتی: دەمەوێ بەیەکەوە بچینەدەرەوە و کەمێك بەیەکەوە بین، منیش بێ هیچ بیرکردنەوەیەك ڕازیبووم و کات و شوێنمان دیاریکرد.

بۆ بەیانی لەماڵ هاتمە دەر و چوومە ئەو شوێنەی کە ئەوباسی کرد، دوای کەمێك وەستان ئەو کوڕەش بەدەرکەوت، کەهات تەوقەمان کرد و ماچێکی لێکردم،دوای ئەوە من گلەییم لێی کرد کە بۆچی دواکەوتووە ، ئەویش گوتی : دایکم و خوشکەکەم بردە لای ماڵتان و ئێستا لەلای دایکتن بۆ ئەوەی داوای تۆ بکەن.

کە ئەو قسانەی کرد زۆر زۆر دڵم خۆش بوو و زیاتر خۆشم ویست و باوەشێکی قوڵم پێیدا کرد و ماچی کردم و منیش ماچم کردەوە، دوای ئەوە ڕۆشتینە شوێنێکی چۆڵ و ئەو کوڕە کۆمەڵێ قسە و کۆمەڵێ ئومێدی پێ دام منیش باوەڕم بەهەمووی کرد.

دوای ئەوەی بەڕێگەوە قسەمان دەکرد،گەشتینە شوێنێکی چۆڵ و ئارام ئەو کوڕە دەستی بۆ سنگم هێنا منیش گووتم وامەکە هێشتا زووە دوای هاوسەرگیری ئەوە بکە، بەڵام ئەو گوێی پێنەدام و بەردەوام بوو و گوتی: بەس ماوە مارەت کەم هەموو شتێ کۆتایی پێهاتووە، ئیتر منیش بێدەنگ بووم .

دوای ئەوە داوای سێکسی لێکردم، من ڕازینەبووم بەو کارە بەڵام ئەو گووتی : لەم هەفتەیە هەموو شتێك بەکۆتا دێنم و دوای ئەو هەفتەیەش دەتهێنمە لای خۆم و هاوسەرگیری دەکەین ...بەڵێ ڕوویدا .

کەهاتمەوە لاشەم زۆر بێهێز بوو، خوێن لە دامەنم دەهات و جەستەم شێوابوو، چوومە ژوورەکەم و کەمێ پاڵکەوتم، چاوەڕوانی دایکم بووم بێ و بڵێ کچم ئەمڕۆ داوات هاتبوو، بەڵام دیار نەبوو، منیش خۆم خەریك کرد بە مۆبایل و چوومە خەت نامەیەکم پێگەیشت...

نامەکە هی خوشکی کوڕەکەبوو، بەخێرایی کردمەوە تا بزانم چی لێ نووسراوە، کەکردمەوە چی نوسرابێ!!!، من خوشکی ئەو کوڕەنیم من خۆشەویستی بووم بەڵام هەڵی خەڵەتاندم و وێنە و ڤیدیۆی گرتم و ڕووتی کردمەوە و ئابڕووی بردم و کچێنیم لەدەستدا، دوێنێ بەمەرجی ئەوەی وێنە و ڤیدیۆکانم بداتەوە و بیسڕێتەوە ئەو قسانەم کرد و گووتم کە خوشکی ئەوم ، کچەجوان نەکەی

وێنە و ڤیدیۆی بۆ بنێری ... نەکەی لەگەڵی بچیتە دەرەوە ئەوە مرۆڤ نییە ئەوە کەسێکی داوێن پیسە شەیتانە لەبەرگی فریشتەدا... بمبوورە تا توانیم بتدۆزمەوە لە تۆڕی کۆمەڵایەتی کەمێك درەنگ کەوتم، دوا قسەم ئەوەیە واز لە مۆبایل و ئەنتەرنێت بێنە و هەمووی داخە، واز لەو کوڕە بێنە و بڕۆ بۆخۆت کەسێکی تر بدۆزەوە... خوات لەگەڵ .

کاتێ ئەو نامەیەم خوێندەوە بەلەشی بەخوێنەوە ڕامکردە لای دایکم و پرسیاری ئەوەمکرد: ئەمڕۆ کێ هاتۆتە ماڵمان ئەویش گووتی : کچەکەم هیچ کەس نەهاتووە لەبەر چی دەپرسی؟؟، بێ هیچ قسەیەکی تر گەڕامەوە ژوورەکەم و تەلەفۆنم بۆ ئەو کوڕەکرد مۆبایلی داخرابوو، لەخەت نەبوو خەریك بوو گیانم دەردەچوو و کەمێکیش لەهۆش خۆم چووم.

دوای ئەوە چوومە گەرماو و خۆم پاك کردەوە لە خوێن و پیسیەکانی لاشەم و جلێکی ترم پۆشی و دواتر دایکم بانگی کردم بۆ نان خواردن ، کە چوومە سەر سفرە باوکم و برا و دایکمم بینی ، شەرمەزاری ڕوو ڕەشیەکی زۆر زۆر دایگرتم... من خیانەتم لەو خێزانەکرد کە شەو و ڕۆژیان لەگەورەکردنی مندا بەسەربردووە!!! .... من خیانەتم لەو باوکە کردووە لەبەیانی تا ئێوارە بۆ بژێوی ژیانی ئێمە گیانی هیلاك دەکا و تەمەنی بۆ ئێمە کردۆتە قوربانی !! ...

ئەمانە و چەندین پرسیاری تر بەمێشکم دەهات و دەڕۆیشت.

مامۆستا گیان ئێستا سێ مانگ تێپەڕیوە بەسەر ئەم کارە قێزەونەم و ئەو کوڕەش نە لە تۆڕی کۆمەڵایەتی و نە لەمۆبایلیش هیچ دەنگێکی نییە، وە

ڕاستیەکەم بۆ دەرکەوت کە ئەو کوڕە کاری تەنها لەناوبردنی ئابڕووی خەڵکییە.

مامۆستا گیان: ڕێگایەکم پێنیشانبدە تا لەو تاوان و ڕوو ڕەشیە ڕزگارم بێ، ڕێگەیەکم نیشن بدە کە پەردەی کچێنی و شەرەف و ئابڕووم بۆ بگێڕێتەوە... ڕێگایەکم نیشانبدە بتوانم بەسەربەرزی شووبکەم و خێزانێکی پاك بنیات بنێم... دەزانم ئەوشتانە ئەستەمە و لەتوانای تۆدا نییە، بەڵام داوای ئەوەت لێدەکەم کە هاواری من بگەینیتە کچانی تر تاکو وەکو من نەخەڵەتێن و لەناو نەچن ، پێیان بڵێ با بەدامێنێکی پاکەوە شووبکەن و بچەنە ماڵ و حاڵی خۆیان

.

بەڵێ ئەمە کۆتا قسەکانی ئەو کچەبوو کەببوە قوربانی دەستی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و ئابڕووی دایك و باوکی نەپاراست و کچێنی خۆشی لەدەستدا ، ئەوەش بەهۆی نەبوونی ترسی خوا و نەبوونی ڕۆشنبیرییەکی چاك لەنێو کۆمەڵگەدا.

خوشکە بەڕێزەکەم: بزانە بۆ ئەوەی سەنگین و بەڕێز بی پێویستە شەرم و حەیات لەدەست نەدەی لەبەر ئەوەی کاتێك شەرم و حەیا نەما و بەدڕەوشتی جێگەی گرتەوە ئەوا ئەو کات سووك و بێقیمەت دەبی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **( مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا شَانَهُ ، وَلَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا زَانَهُ)**[1]

---

[1] - ابن ماجه

واتە: بێ ڕەوشتی لەهەر شتێکا هەبێ ئەوا ئەو شتە سوك و بێ قیمەت دەکات، شەرم و حەیاش لە هەر شتێکدا هەبێ ئەوا ئەوشتە سەنگین و بەڕێزی دەکات. کەواتە ڕێزدار و سەنگین بەو خۆت خاوەنی خۆتبە و ژیانت بخە دەستی خۆت نەوەك دەست کەسانێکی شەیتانی کە بەرگی فریشتەیان پۆشی بێ.

## سزای زیناکارپێش هاوسەرگیری ...

پەروەردگار دەربارەی ئەوانەی کە هاوسەرگیریان نەکردووە و ئەوتاوانە پیسە ئەنجام دەدەن دەفەرموێ:-

**(ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ)**[1]

واتە: کچی زیناکار یان کوڕی زیناکار پێش ئەوەی کە زەواجێکی شەرعی بکەن ئەگەر بە ویستی خۆیان زینایان کرد هەر یەکێك لەوانە سەد جەڵدەو قامچیان لێ بدەن، وە لەسوننەتیشدا هاتووە بۆ ماوەی ساڵێك لەو شوێنە دوریان بخەنەوە، ئەگەر خۆیان دانیان پێدا نا، یان چوار شایەت هەبوو، یان کچەکە حەملی هەبوو، وە بەزەیشتان پیادا نەیەتەوە لە ئەنجامدان و جێبەجێ کردنی ئەم سنوورەی خوای گەورە (بەزەیی وا لە حاکم نەکات ئەم حوکمەی

---

[1] - [٢] النور

خوای گەورە جێ بەجێ نەکات)، ئەگەر ئێوە ئیمانتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، وە با کۆمەڵێك لە باوەڕدارانیش ئامادەی ئەم سزایە ببن وە لە پێش چاوی خەڵکی بە ئاشکرا جێبەجێ بکرێت بۆ ئەوەی ببێتە پەند و عیبرەت بۆ ئەوەی خەڵکی لەو تاوانە دوور بکەوێتەوە ( بە یەك کەس و سەروتر دەوترێت: **طَائِفَة**).

## هۆکاری هەشتەمی داوێن پیسی :

## کۆلێژو پەیمانگا ئەهلی و حکومیەکان و مانەوە لە بەشەناوخۆیی...

دەتوانین کۆلێژ و پەیمانگا ئەهلی و حکومیەکان و مانەوە لە بەشەناوخۆیی بکەینە دوو بەش

**یەکەم : کۆلێژو پەیمانگا ئەهلی و حکومیەکان .**

**دووەم : مانەوە لە بەشەناوخۆیی .**

## یەکەم : کۆلێژو پەیمانگا ئەهلی و حکومیەکان

لەگەڵ ئەوەی لەم سەردەمە مرۆڤەکان تا ڕادەیەکی باش گرنگیەکی زۆر بە بەدەستهێنانی بڕوانامە دەدەن، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەو بڕوانامەیە سودیان پێناگەیەنێ نە لەڕووی تێگەیشتن و ڕۆشنبیری نەلەڕووی ماددیەکەش چونکە دڵنیان کە دەرچوون دامەزراندن نابینن لەهیچ دەزگایەکی حکومی ئەمە لەلایەك

لەلایەکی تر کچان و کوڕان کاتێ کۆلێژ و پەیمانگا تەواو دەکەن دەگەنە تەمەنێك کە تەمەنی هاوسەرگیریە یان هەندێجار لە تەمەنی گونجاو بۆ هاوسەرگیری تێپەڕیش بونە

کێشەکە لێرەوە دەست پێدەکات ...

کوڕان دەگەنە ئەو تەمەنە هیچ داهاتێکیان نیە تا بتوانن خێزان پێکبهێنن نەدامەزراندن هەیە و نەکارێ تا بتوانن دەست مایەك بێتە دەستیان و تا هەوڵی هاوسەرگیری بدەن، کچەکانیش وورده وورده تەمەنیان هەڵدەکشێ، لەگەڵ ئەو تەمەن هەڵکشانەش بەهۆی کاریگەری قسەی خەڵك و دەوروبەر لەناخەوە تووشی گرێی دەروونی دەبن، تووشی پاڵەپەستۆی قسە پوچەکانی کۆمەڵگا دەبن،دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوەی زۆر ناخیان دەخوا، وایان لێدێ هەست بە کەم و کوڕی و نامۆیی دەکەن لەناو ئەو کۆمەڵگایەی کە پڕیەتی لە کەم و کوڕی ، بۆیە کچان پەنا بۆ دوو ڕێگە دەبەن تا لەو حاڵەتانە بەدووربن :

**یەکەم : خۆشەویستی پێش زەواج .**

**دووەم : شووکردن بەکەسێ کە دڵی نایەوێ .**

## یەکەم : خۆشەویستی پێش زەواج:

زۆرێك لە کچان هەوڵ دەدەن پێش ئەوەی تەمەنیان هەڵکشێ و نەگەنە ئەو حاڵەتە دەروونیەی کەباسمان کرد زووتر بەدوای کوڕدا دەگەڕێن و پەیوەندی خۆشەویستیان لەگەڵ دەبەستن تا لەم ڕێگەوە بتوانن زووتر هاوسەرگیری ئەنجام بدەن، کە ئەم جۆرە پەیوەندیەش بەداخەوە ڕووداوی خراپی لێدەکەوێتەوە و کۆتایی چیرۆکەکان بەخراپتر لەوە کۆتایی دێ کەکچان بیری لێدەکەنەوە.

## نامەی کچێك ...

دڵم بەوە خۆش بوو قۆناغی ئامادەییم تەواو کردووەو چوومەتە کۆلێژ، ساڵی یەکەمم ئاسایی بەڕێ کرد و نمرەکانم باش بوون ساڵی دووەم یەکترناسینەکان زۆر دەبوون و تێکەڵاوی و دانیشتن و قسە و لێك نزیکبوونەوەکان زیاتردەبوون، لەم نزیك بوونەوانەش کوڕێکم ناسی زۆر ڕێك و پێك، دوای ئەوە ماوەیەکی باش پەیوەندیمان هەبوو وەك و خوشك و برا بەڵام دوای ئەو ماوەیە پەیوەندیەکە گۆڕا و هۆگری بووم و خۆشەویستی کەوتە نێوانمان .

بەبەردەوام قسە و نامە گۆڕینەوە لە نێوانمان هەبوو، قسەو نامەی زۆر زۆربەی جارەکان ڕایدەکێشان بۆ قسەکردنی سێکسی بێ ئەوەی من مەبەستم بێ ئەو جۆرە قسانە بکەم

کاتێ دەکەوتینە ناو ئەوقسە سێکسیانە ئەوکوڕە دەیگوت کەی بێم وابکەین ؟ کە بەتەنها بین ئاوا و ئاوات لێدەکەم، من ئەو قسانەم بەشتی ئاسایی لێکدەدایەوە، تا ڕۆژێك زوو لە کۆلێژ هاتینە دەرەوە گوتی وەرە بچین خانوەکەمانت پیشان بدەم پێشتر باسی کردبوو کە خانووی بۆ خۆمان کڕیوە تا دوای تەواو بوونی کۆلێژ بێتە داوام و لەو خانوە بەیەکەوە بژین منیش بەڵێنم پێی دابوو لە مەجالێکا بچین بیبینین، ئیتر ئەو ڕۆژە چووین

لەڕێگادا زۆر ئاسایی مامەڵەی دەکرد هیچ چاوەڕوانیەکی خراپم لێی نەبوو تا ئەو کاتەی گەیشتمە ماڵەکەم، ئەو ماڵەی کە بڕیارە ببێتە شوێنی حەوانەوەو پشوودانم، ببێتە ئەو بەهەشتەی کە ئەو کوڕە دروستی کردبوو لەناخ و بیرکردنەوەکانم ئەو ماڵەی کە دەبێتە شوێنی لەدایك بوونی منداڵەکانم، بەڵام ... کەوتمە داوەکە ...

ئەو ماڵە دۆزەخ بوو شوێنی لەگۆڕنانی من بوو، منداڵی چی !!! پشوودانی چی !!! ئەوەی نەدەبوو بهێڵم کرا ، بە ئازارێکی زۆرەوە جلەکانم لەبەر کرد و قاچم هێزی تێدانەبوو توانای هەڵگرتنی منی نەبوو، تا گەیشتمەوە ماڵ نازانم ئەو کوڕە چی دەگووت بیرم تەنها لە دایکە تەنها کەم دەکردەوە کە چۆن بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی کچەکەیەتی تا لەکۆلێژ دەربچێ و لەشوێنێ دابمەزرێ تا ئیتر دەست بۆ هیچ کەس پان نەکاتەوە تا ئێمە بێ پارە و ماڵ و حاڵ نەبین لەگەڵ برا بچوکەکانم، دایکم هێندە خۆی هیلاك کرد لەسەر ئێمە تووشی

فەقەرات و چەندین نەخۆشی بوو ، ئێستاش من بە داوێن پیسیەکەم پاداشتی ئەوم دایەوە.

گەڕامەوە ماڵ نەمتوانی وەکو چەندجارە دەستی ماچ بکەم و سەیری بکەم، نەمتوانی کەمێ لەلای دابنیشم و ماندووبوونم بحەسێنمەوە وەکو ڕۆژانی پێشوو، جگە لەوە نامەیەکم بۆهات لە ماسنجەرەکەم سەیرم کرد ئەوکوڕە بوو

ئەو زانی من زۆر تێکچوویمە بەو کارە هەندێ قسەی کرد تا هیچ نەڵێم دواتر هەڕەشەی کرد گەر هەرچیەك بڵێم ڤیدیۆکەم بڵاو دەکاتەوە، بەڵێ ئەو بێشەرەفە ڤیدیۆی گرتبوو، بۆی ناردم ئەوەی کەباش بوو بۆمن دەم و چاوم دەرنەچوو بوو ئەگینا ئەوەی تر عەورەتی خۆی و منی دەرچواندبوو من پشتم لەکامێراکەبوو لەبەر ئازاری زۆری دواوەم ئاگادار نەبووم ئەو ڤیدیۆ دەکا.

لەو کاتەوە لەمن دوورکەوتەوە پەیوەندیم پچڕاند، ئێستا نە دڵم بە بڕوانامەکەم خۆشە نە دامەزراندنیش، لەماڵێ کەوتووم زۆر بێهیوام تەمەنم هەڵکشاوە، داواکارم زۆر هات بەڵام نەمتوانی شوو بکەم لەبەر دووهۆکار:

یەکەم : کاتێ پیاوێ دەهاتە داوام وامدەزانی ئەویش وەکو ئەو بێ شەرەفەیە و یاری بەناموسی خەڵك کردووە بۆیە دڵم سارد دەبوو

دووەم : کاتێ پیاوێ دەهاتە داوام دەمگووت ئەوە پیاوێکی باشە من شایستەی ئەو پیاوە پاکە نیم من نابێ ببمە دایکی منداڵەکانی ، ئەو پاکە با بەهۆی منەوە شەرمەزار نەبێ گەرڕۆژێ ئەو تاوانەی منی زانی پێ دەشکێ .

بۆیە تائێستا شووم نەکردوە و تەمەنم گەیشتۆتە ٣٠ ساڵ هێشتا لەناو ئازارێکی دەروونی زۆر خراپدام.

کاتێ دایکم دەبینم دەمرم، کاتێ دەڵێ کچەکەم دەمەوێ منداڵەکانت ببینم پارچە پارچە دەبم ، ئێستا من چاوەڕێی یەك شتم بێ ئەو شتە نە باوك و نەدایك و نە برا و نە هیچ کەس و شتێك نیە، ئەوەی من دەمەوێ بێ کە هێشتا نەهاتووە ئەویش ...مردنە...بەڵێ مردن !!

**ئایا ئەوخۆشەویستی و دڵدارییەی کە بە زەواج کۆتایی پێ بێت هەرحەرامە ؟**

گومانی تیانیە ئەو پەیوەندیەی کە لەنێوان کچ وکوڕدا دروست دەبێت وخەڵکی ناویان ناوە خۆشەویستی حەڕامە ،هیچ کەسێکی عاقڵ گومانی لەوەدا نییە کە ئەم جۆرە پەیوەندیانە ڕێگەپێدراو نیە، چونکە کارەسات بەدوای خۆیدا دێنێت، وە ئەو خۆشەویستیە وا لە کچ و کوڕ دەکات قسەی سۆزداری و یەکتر بینین و دەرچوون بەتەنهای لیبکەوێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:- { لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ، وَلَا تُسَافِرُ امْرَأَةٌ إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ }[١]

واتە:- با پیاو لەگەڵ ئافرەتێکی (بێگانەدا) بەتەنها نەمێنێتەوە (ئیللا مەگەر ئافرەتەکە کەسێکی مەحرەمی لەگەڵدا بێت)، وە با ئافرەت سەفەر نەکات ئیللا مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت.

وە لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەست نیشان کردووە کە زۆربەی ئەو هاوسەرگیریانەی لەئەنجامی پەیوەندی حەڕام دێنە بەرهەم سەر کەوتو نابن، لەکاتێکدا ئەو هاوسەرگیریەی کە پێشینەی خۆشەویستی نیە سەرکەوتوو تر بووە لەوەی پێش هاوسەرگیری خۆشەویستی بووە .

لە لێکۆڵینەوەیەکدا ماۆستایەکی کۆمەڵایەتی بەناوی إسماعیل عبد الباري لەسەر (١٥٠٠) خێزان کردوویەتی لە ئەنجامەکەیدا هاتووە زیاتر لە (٧٥ %) ئەو زەواجانەی کە بەخۆشەویستی پێش زەواج دروست بووە بەتەڵاق کۆتایی هاتووە ، لەبەرانبەردا کەمتر لە (٥%) ئەو زەواجانەی کە بەبێ خۆشەویستی پێش زەواج دروست بووە بەتەڵاق کۆتایی هاتووە.

بۆچی خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری زۆرتر هەڵدەوەشێتەوە؟

چونکە کچ و کوڕ وا بیردەکەنەوە کە ژیان گەشتێکی خۆشەویستیە و کۆتای نایەت، ئەوەی بیری لێدەکەنەوە تەنها خەون وخەیاڵاتە ، هیچ عەیبێکی یەکتر

[١] مسند احمد : حكم الحديث: إسناده صحيح على شرط الشيخين

نابینن، هەر خەریکی بنیادنانی خەیاڵن، بۆیە کاتێ دێنە ناو واقع و ڕووبەڕووی زەحمەتیەکانی ژیان دەبنەوە توشی کێشە و گرفتی زۆر دەبنەوە، ئەوان بەهەشتیان لەخەیاڵ بوو بەڵام واقع پێچەوانەی خەیاڵە .

پێش هاوسەرگیری زۆر شت لەیەکتر قبوڵ دەکەن بەڵام دوای هاوسەرگیری ئەوەناکەن و کێشەکان بەرەو گەورەتر دەبەن

بەڵێن دان لەلایەن کوڕەکە،کە نایەڵێ ناخۆشی بێتە ڕێگای کچەکە، بەڵام واقع شتی ترمان پێدەڵێ.

کچە بەڵێنی پارچە نانێك و کەمێ ئاو دەدات، بە کوڕە دەڵێ بەس تۆم هەبێ و لەتەنیشت تۆوەبم هیچم ناوێ. بەڵآم کە شوی پێکرد دەڵێ هەموو شتێکم دەوێ بەس تۆم ناوێ بۆیە دوای هاوسەرگیری خاوەن بانکەکانیش لەترسی زۆری داواکاریەکانی دەلەرزن، وەبەردەوام پیاوەکەی بەڕەزیل ناو دەبات گەر داواکاریەکانی جێبەجێ نەکات.

ئەو هۆکارانە و کۆمەڵێ شتی تر وا لە پیاو و ئافرەتەکە دەکات دوای هاوسەرگیری زوو لەیەك بێزاربن و خۆشەویستی نێوانیان کاڵ دەبێتەوە و دواتریش بەرە و دادگاکان هەنگاو دەنێن بۆ جیابوونەوە و منداڵەکانیش بێ چارەی دەستی دایك و باوکیان دەبن.

## دووەم : شووکردن بەکەسێ کە دڵی نایەوێ

ئەوەشیان دەردێکی کوشندەی ترە کە کچان لەترسی قسەی ئەم کۆمەڵگا ئیفلیجە بەناچاری شوودەکەن بە کەسێ کە دڵیان نایهەوێ تەنها لەبەر ئەوەی قسەیان لەسەر نەکرێ و کۆمەڵگا ناخیان بریندار نەکا، بێگومان ئەو حاڵەتەش بێبەش نابێ لە تووش بوون بەتاوان و داوێن پیسی .

دراوسێیەکمان هەبوو ئافرەتەکە پیاوەکەی بەدڵ نەبوو، کاتێ لەماڵ دەهاتە دەر چاوی دەگێڕا بەدوای پیاوان تا دەگەڕایەوە، لەڕیگەی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانیش کۆمەڵە پیاوێکی لە دەوری خۆی کۆکردبوویەوە و لەکاتە گونجاوەکان دەیهێنانە ماڵەوە هەندێ جاریش بەفێڵی بازار و دوکان لەگەڵیان دەردەچوو بۆ کاری داوێن پیسی، خاوەنی دوو منداڵیش بوو قسە کردن و دەرچوون ببوە پیشەی پیاوەکەشی لەبەیانی تا ئێوارە خەریکی کرێکاریە و خێزانەکەشی لەولا خەریکی خیانەت و داوێن پیسی .

## دووەم : لەبەشە ناوخۆیی...

کاتێ قۆناغی ئامادەیی تەواو دەکەیت بەپێی نمرەکانت ناوت لەبەشە جیاوازەکانی کۆلێژ و پەیمانگاکان دێتەوە،جا کوڕ و کچێکی زۆر ناویان لەدەرەوەی شارەکەیان دێتەوە و ناچار دەبن بچن لەدووری ماڵ و شارەکەیان بخوێنن.

ئەو دووركەوتنەیەوە لەماڵ و دوور لە خێزان ئازادیەكی زۆر بۆ كوڕ و كچان دروست دەكات ، كە ئەمەش زۆربەی جارەكان كارەساتی ناخۆش و جەرگبڕی لێدەكەوێتەوە لەلایەن هەردوو ڕەگەز كەلەكۆتاییدا ئەوكارەساتانە دەبێنەهۆی تێكدانی دەروون و چارەڕەشی بۆیان، هۆكاری ئەو كارەساتانەش دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەی ناتەندروست و نەبوونی هۆشیاری و تێنەگەیشتوویی لە دین و بنەما ئەخلاقیەكان.

مامۆستایەكی بەڕێز بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ : ڕۆژێكیان تەلەفۆنێكم بۆ هات كچێك بوو، كە دەستی بە قسەكردن كرد هەستت بە ترس دەكرد لە قسەكانی دا، منیش ڕێگام دا و گوێم بۆ قسەكانی گرت و گوتی :

مامۆستا ئێمە چەند كچێك بووین لە یەكێك لە بەشەناوخۆییەكانی ئەم هەرێمە، یەكێك لە خوشكەكانمان لەگەڵ كوڕێك دەستی بە قسەكردن كرد، ئێمە هەمووومان ئامۆژگاریمان كرد كە دەست لەو كوڕە هەڵگرێ بەڵام سوودی نەبوو و بەردەوام لەڕێگەی مۆبایل و دواتریش چوونەدەرەوە لەگەڵ ئەو كوڕە بەردەوام بوو، كوڕەكە بەوە خۆی خستبووە ناو دڵ و مێشكی ئەو كچە كە دەچێتە داوای و دەیكاتە خێزانی داهاتووی، كوڕەكە وێنەی كچەكەی كەوتە لای و كچەكەش بەهەمان شێوە، خۆشەویستیەكە زۆر زۆر بوو لەلایەن كچەكەوە بۆ كوڕەكە و بەردەوام ئەو كچە باسی ئەو كوڕەی بۆ دەكردین، ئێمەش هەردەم ئامۆژگاریمان دەكرد بەڵام هەر سوودی نەبوو، تا ئەوەی لێی دەترساین ڕوویدا.

ڕۆژێکیان بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵی کرد حاڵی پەشۆکاو بوو، پێم گوت: چیتە باش دیارنیت، ئەویش بۆی گێڕامەوە و گوتی: ئەو کوڕەی کە خۆشم دەویست... گوتم: ئێ!! گوێم لێتە بڵێ!، گوتی: ڕۆژێکیان وەکو ڕۆژانی تر لەگەڵ یەکدا چووینەدەرەوە، بەڵام ئەوجارەیان جیاواز بوو، لە ڕۆژەکانی تر، منیش گوتم: جیاوازییەکە چ بوو؟، گوتی: ئەو کوڕەی کە خۆشمدەویست داوای ئەوەی لێمکرد، تا لەگەڵی جووت بم، گوتم: ئێ! ئەتو چیت کرد؟، ئەویش گوتی: من ڕازی نەبووم و خۆم نەدا بەدەستەوە، ئەو کوڕە زۆر هەوڵیدا بەڵام من هەر ڕازینە بووم هەرچەندە ئەو بەڵێنی هاتنە داخوازی دام تا ڕازیم بکا بەڵام من هەر خۆم نەدا بە دەستەوە.

لەگەڵ خۆشەویستەکەم یەکترمان جێهێشت، دواتر خۆشەویستەکەم تەلەفۆنی بۆ کردم هەڕەشەی وازهێنان و بڵاوکردنەوەی وێنەکانی لێکردم، منیش خەریك بوو شێت بم، ئەو کەسەی کە خۆشم دەویست ئێستا چیم پێدەڵێ!، بۆیە هەستم کرد وورده وورده ئەقڵم لەدەست دەدەم، بۆیە بڕیارمدا خۆم بکوژم ئەوەبوو خۆم دەرمان خوارد کرد و ئێستا دکتۆرەکان کەمتر لە هەفتەیەکیان بۆ داناوم، زۆر پەشیمانم بەڵام تازە کات بەسەرچوو...

کچەکە دەڵێ مامۆستاگیان ئێستا ئەو کچە لەژیان نەماوە و جێی هێشتین، بەڵام براکانی گومانیان لە مردنی خوشکەکەیان هەیە و بەردەوام پرسیاری ئەوە دەکەن کە خوشکەکەیان هیچ کێشەیەکی هەبووە؟، ئێمەش ناوێرین و ناتوانین ڕاستیەکە بڵێین، لەبەرئەوەی کوڕەکەش هەڕەشەی ئەوە دەکات کە

ئەگەر ئەو شتە ئاشكرا بكەن هەمووتان دەكوژم، ئێستا ئێمە تێدا ماوین نازانین چی بكەین و ڕوولەكوێ بكەین. لێرە قسەی ئەو كچە تەواو بوو، بەڵام كێشەكان بەردەوامن و چەندینی تر وا لەڕوودانن، بەڵام دەپرسم خوشكەكانم ئەگەر پیاوێك بە حەرامی تۆی بوێ بە حەلاڵی چۆن تۆی دەوێ!؟.

## لەیەكێكی ترلەبەشە ناوخۆییەكان ...

كوڕ هەبووە بۆتە ( سالب) ئەو كەسەیە نێربازی لەگەڵ دەكرێ هەیەشیانە بۆتە (موجەب ) نێرباز.

لەبەشەناوخۆیەكەی ئێمەدا دوو كوڕ هەبوون، دەست گەمەیان زۆر دەكرد دەستیان بۆدواوەی و پێشەوەی یەكتر دەبرد، تا وای لێهات لەگەڵ یەك تووشی داوێن پیسی بوون، ئەوەچەند ساڵێكە ئەوان ئەو كارە بەردەوام دەكەن و ناتوانن دەستی لێهەڵبگرن، جا ئەو كوڕەی لەگەڵی دەكرێ سالبەكە منداڵیشی هەیە و خێزاندارە.

## لەبەشە ناوخۆییەكی تركە كۆلێژەكەی ئەهلیە ...

برایەك گوتی من زۆر كچ دەناسم بەهۆی دووری لەكەس و كاریان و دووری لەدین و نەبوونی بیروباوەڕێكی پاك و نەترسان لەپەروەردگار دەستیان بەكاری داوێن پیسی كردووە جا بەشێكیان هەر بۆ حەزی خۆیان و بەشێكی تر بۆ پارە

پەیداکردن، جا ئەوانەی بۆ پارە داوێن پیسی دەکەن لەگەڵ هەموو کوڕێك دەردەچن، تا لەو ڕێگەیەوە بتوانن خەرجی زانکۆ دابین بکەن لەگەڵ خواردن و پێداویستی ڕۆژانەی خۆیان .

## هۆکاری نۆیەمی داوێن پیسی :

## کۆمپانیا و نەخۆشخانە ئەهلیەکان و کارکردن بە ئافرەت...

### یەکەم : کۆمپانیا ئەهلیەکان ...

کارەساتێکی تر و هۆکاری تر بۆ داوێن پیسی کارکردنی ئافرەتە لە کۆمپانیا ئەهلیەکان و پشتگوێ خستنی پیاوە،کە ئەرکی سەرەکیش لەسەر پیاوە کار بکات نەك ئافرەت.

ئێستا لەبەر ئەوەی لەم هەرێمە ژیانیان لەخەڵکی زەحمەت کردووە و خەڵکی بەرەو هەژاری هەنگاو دەنێ کارکردن بۆ پیاوان زەحمەت و کەم بووە و هەندێ جاریش هەر نیە،بۆیە ئافرەتانیش بەناچاری دێنە پێش بۆکارکردن تا برە پارەیەك بەدەست بخەن بۆ بژێوی ژیانیان.

جا بەشێوەیەکی گشتی پارەش کەوتۆتە دەست کەسانێکی خوانەناس و دەروون نەخۆش و علمانی،ئەوانیش یاری بە هەست و عەقڵ و دەروونی خەڵکی دەکەن.

بۆیە دەبینین کاتێ کۆمپانیایەك پێویستی بەکەسێکە بۆ کار ڕێکلام دەکات و داوای ئافرەت دەکات نەك پیاو،وە زۆربەی جارەکانیش بڕی پارەکە دیاری ناکرێ تا ئەو کاتەی ئافرەتەکە دەبینن ئەوکات جوانترینەکە هەڵدەبژێرن و پارەی باشی بۆ دابین دەکەن.

بۆ جوانترین ئافرەتەکان هەڵدەبژێرن؟ هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵ :

## یەکەم : ئەگەرکۆمپانیاکە کاری فرۆشی بێ .

کاتێك کۆمپانیایەك کاری فرۆشیە بەدوای ئافرەتی جوان و بەرچاو دەگەڕێت، ئەمەش بۆ ئەوەی کاڵاکانی خۆی بەجوانی ئەو ئافرەتە لەبازاڕ ساغ بکاتەوە جا کاڵاکان باش بن یان خراپ .

ئەو ئافرەتەش نابێ جلی شەرعی لەبەر بێت بەڵکو دەبێ جلێك بپۆشێ نیمچە ڕووت بێ تا سەرنجی پیاوان و کڕیاران ڕابکێشێ، بێگومان ئەوەش فیتنەی گەورەی لێ دروست بووە .

نوێنەر (مەندوب ) یێکی ئافرەت باڵاو ڕووخساری جوان بوو زۆرترین فرۆشی هەبوو، ئێمەش بەهەموو توانامان دەگەڕاین نیوەی ئەو زۆر کەمترمان دەفرۆشت، حەزم دەکرد بزانم هۆکاری ئەو هەموو فرۆشیەی ئەو ئافرەتە چیە!! دەمویست بزانم چۆن سەرەنجی کڕیار ڕادەکێشێ تامنیش فێری بم و سوودی لێببینم.

زۆرجار قسەم لەگەڵ دەکرد و پرسیارم لێی دەکرد هیچ شتێکی وای پێنەبوو کە سوودم پێبگەیەنێ بگرە من زۆر لەو باشتریش بووم بەڵام ئەو فرۆشی زۆر زیاتر بوو لە هەمووومان .

تا ڕۆژێك دەركەوت ئەو ئافرەتە بەهۆی جوانیەكەیەوە پەیوەندی لەگەڵ زۆربەی خاوەن سوپەر ماركێتەكان دانابوو، بەهۆی ئەو پەیوەندیەوە خاوەن سوپەر ماركێتەكان زۆرترین شتیان لێ دەگێڕاوە،تا ئاشكرابوو لەسەری ئەوەی من زانیم باوەش و ماچ كردنی لەگەڵ زۆربەیان كردبوو بەڵام داوێن پیسی نازانم.

## دووەم : ئەگەربۆ كاری ناوەوەی بینای كۆمپانیابێ .

بەڕێوەبەر ناسكترین و جوانترین هەڵدەبژێرێ و لەخۆی نزیكی دەخاتەوە، بەمەرجێ ئافرەتەكە پابەند نەبێ بەدینی ئیسلام و پۆشاكی شەرعی، تا بەو هۆیەوە حەزە پیسەكانی لەسەر ئەو ئافرەتە بەجێ بگەیەنێ .

لە كۆمپانیاكەمان، چەند ساڵێك كچێكی جوان سكرتێری بەڕێوەبەر بوو ئەو كچە هەرچی بویستبا بۆی جێبەجێ دەبوو ئەویش بەهۆی بەڕێوەبەرەكەمانەوە بوو، جگە لەمن فەرمانبەرەكانی تریش دەیانزانی پەیوەندی لەنێوان ئەو كچە و بەڕێوەبەرە هەیە، چونكە زۆر جار بەڕێوەبەر زوو دەڕۆیی و سكرتێرەكەشی لەگەڵ خۆی دەبرد و دەڕۆشتن.

جا ماوەیەك ئەو كچەكە دیار نەما، منیش پرسیارم لە دەستە خوشكەكەی كرد ئەو كچە لەكوێیە؟ سەرەتا كە وەڵامی دامەوە من زانیم ڕاست ناكا، دواتر بەڵێنم دا كە لەم كۆمپانیایە باسی ناكەم، بۆیە ئەمجارە گوتی: ئەو كچە لەو

ماوەیەی دیار نەبوو سکی هەبوو لە بەڕێوەبەر و بەڕێوەبەر بردبووی سکەکەی لەبار بردبوو وە بە نەشتەرگەری پەردەی کچێنی بۆ دانابوویەوە.

ئێستا ئەو کچە کەدێتە کۆمپانیا لەڕووی نایێ سەر بەرزبکاتەوە، پەیوەندیشی لەگەڵ بەڕێوەبەر تێکچووە، ئێستا کچە خەریکی پێچانەوەی شتەکانێتی و دەیەوێ بچێتە شوێنێ کەس نەیناسێ و نەزانێ کێیە .

## دووەم : نەخۆشخانە ئەهلیەکان ...

ڕاستیەك هەیە لەم وولاتە ئەویش ئەوەیە بەشێك لە خاوەن نەخۆشخانەکان و دکتۆرەکان، پێش هەموو کەس پێویستیان بەوەرگرتنی چارەسەری عەقڵی و هەوەس و گیرفانە، چونکە ئەوان ئەو نەخۆشیانەیان تێدا کۆبۆتەوە و ئاڵوودەی بوونە.

بۆچی عەقڵ و هەوەس و گیرفان ؟

چونکە عەقڵ و هەوەس و گیرفانیان لەڕێگەی ئافرەتەوە زۆر زووتر کارەکەیان بۆ جێبەجێ دەکات وەك لەڕێگەی پیاوەوە، ئەوان بۆ پرسگە و وەڵام دانەوەی تەلەفۆن و قسە کردن لەگەڵ نەخۆش و ئاگادار بوونی نەخۆش و چەند کارێکی تر ئافرەتان تایبەت تر ئەوانەی جوانن بەکار دێنن تا سەرنجی خەڵکی و نەخۆش بۆخۆیان ڕابکێشن، بێگومان ئەو جۆرە بیرکردنەوانەش ئەو پەڕی

نەفامیە، چونکە نەخۆشخانەکان شوێنی چارەسەرکردنن نەك شوێنی نمایش کردنی لاشەی ئافرەت و جوانی ئافرەت.

ژیان لێرە بۆتە تەختەی شانۆ تەنها خۆدەرخستن و نمایش کردن دەبینی،بۆیە لەجێگەی چارەسەری نەخۆش،نەخۆش دەردەێکی هەبێ دەبێتە دووان، گەر دوو دیناری هەبێ چواری تری پێ قەرز دەکەن و هێشتاش چارەسەری نیە.

برایەك گوتی: تەندروستیم باش نەبوو چوومە نەخۆشخانەیەك، کە لەدەرگاوە چوومە ژوورەوە ئافرەت پێشوازی دەکرد تا دەهاتیە دەر

دەڵێ: کە چووم بەشێکیان هێندە جوان بوون بیرم نەمابوو کوێم دێشێ هەر سەیری ئافرەتەکانم دەکرد، زۆر فەحسیان پێکردم و منیان هێنا و برد، دواتر هەندێ چارەسەریم وەرگرت لە دەرمانخانەی خۆیان هەمووشی بە پارەیەکی زۆر.

گوتی: کە چوومەوە سەیری خێزانم کرد، لە مێشکی خۆم بەراووردم دەکرد لەگەڵ جوانی ئافرەتە کارمەندەکانی نەخۆشخانە!

لەدڵی خۆم دا دەمگوت یەکێك لەو ئافرەتانە خێزانم با قەت نەخۆش نەدەکەوتم، ماوەیەکی باش جوانی ئافرەتەکان لە بیرکردنەوەکانم دەرنەدەچوون، تاقەتی سەیرکردنی خێزانم نەمابوو، حەزم دەکرد بەردەوام نەخۆش بام و لەو نەخۆشخانەیە بمابامەوە تا ئەو ئافرەتانە قسەم لەگەڵ بکەن و چارەسەرم بکەن.

دایکێك گوتی: من بە پەرۆشەوە چاوەڕێی دەرچوونی کوڕەکەمم دەکرد تا زانکۆی پزیشکی تەواو کرد

گوتی: منیش لەگەڵی چوومە نەخۆشخانەیەکی ئەهلی تا لەوێ دەست بەکار بکات و خزمەتی نەخۆش و کەسانی هەژار و کەمدەرامەت بکات، چونکە ئێمە دەردی نەبونیمان زۆر چەشت بوو

کە چووین بەڕێوەبەری نەخۆشخانە گوتی دایەگیان کوڕەکەت ئافرەت با ئێستا وەرمان دەگرت، ئێمە ئافرەت وەردەگرین نەك پیاو

دایکەکە گوتی: بەو قسەیەی کردی من لە نیەتی پیسی ئەو بەڕێوەبەرە گەیشتم، تێگەیشتم ئافرەتیان بۆ کۆکردەنەوەی پارە و بەتاڵکردنەوەی شەهوەتیان وەکو کاڵا بەکاریان دێنن، سوێند بەخوا کە وای گوت من قێزم لە ئافرەت بوونی خۆم و پیاوەتی ئەو دەکردەوە، ئاخر چۆن دەبێت ئافرەت واسوك و ڕسوا بکرێت چۆن دەبێ ئافرەت بکەنە کاڵایەکی بێنرخ و بەکاریان بێنن، ئیتر دەستی کوڕەکەم گرت و هێنامەوە بۆ ماڵەوە.

## زیانی داوێن پیسی لەڕووی دەروونی وکۆمەڵایەتیەوە :

لەڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە ئەنجامدانی داوێن پیسی بۆ کوڕ و کچ :

**یەکەم لەڕووی دەروونیەوە:** لەڕووی دەروونیەوە پیاوان کەمتر دەرونیان تێکدەچێ وەك لە ئافرەتان، ئەمەش لەبەر ئەوەیە پیاوان زیاتر لە دەرەوەی ماڵن و تێکەڵ بە ئیش و کارن و زیاتر مەشغوڵن، لەبەر ئەوهۆکارانە پیاو زۆر بیر لە ئەنجامدانی ئەوکارەناکاتەوە تا دەروونی تێکبدا، یان وەك کچ نین تا ئەنجامدانی ئەوکارە پەردەی کچێنیان ببا، یان گەر کۆمەڵگاش بەو کارەی بزانن لای ئاساییە، چونکە کۆمەڵگا بێدەنگە لە ئاست داوێن پیسی پیاواندا وەك ئەوەی هیچ خەتایەك لەپیاواندا نەبێت .

هەروەها پیاوان هەرچەند سەرەڕۆبن و کاری پیس و قێزەون بکەن یەك جار بچێتە مزگەوت و دووڕکات نوێژ بکات هەموو بەباشە باسی دەکەن و پشتگیری دەکەن، تەنانەت زۆر کەس هەوڵ دەدات کچی خۆی پێشکەش بکات، ئەوەش لەبەر ئەوەی کاکم تەوبەی کردووە.

**بەڵام** ئافرەتان پێچەوانەی پیاوان لەڕووی دەروونیەوە بەردەوام لەقەلەقی دەژین، ئازاری زۆری دەروونی خەو و نان و پێکەنینیان دەدزێ، زۆر جار کچێنیشیان دەبا

.

لێرە ئافرەت بچووك ترین تاوان بکا هیچ ئەگەر هەزاران جار تەوبەش بکا کۆمەڵگا پشتگوێی دەخا و نەفرەتی لێدەکات، وە کەس ئامادەنیە بچێتە داوای و بیکاتە خێزان و دایکی منداڵەکانی.

وە ئەو شتەی بەردەوام بەقورسترین شێوە لەڕووی دەروونیەوە ئازاری ئافرەت دەدا ئەوەیە کە وێنە و ڤیدیۆی لای کەسی بەرامبەر بێ، چونکە بەردەوام لەژێر هەڕەشەدایە هەتا ئەگەر شوو بکات بەهیچ شێوەیەك ئاسوودە نیە، چونکە کەسی بەرامبەر داوای داوێن پیسی لێدەکاتەوە گەر ڕازی نەبێت هەڕەشەی بڵاو بوونەوەی وێنە و ڤیدیۆی لێدەکات، گەر داوێن پیسی لەگەڵ بکات دیسان کێشەیە چونکە پیاوی هەیە و دەبێ حەیا و حورمەتی پیاوەکەی بپارێزێ .

هەروەها بەردەوام ترسی هەیە نەوەکو ڕۆژێ پیاوەکەی بەو کارە بزانێ کە ڕۆژێ لە ڕۆژان داوێن پیسی کردووە و پیاوی تری خۆش ویستووە.

بۆیە تاهەتا ئافرەت لەناو ترس و ئازاری دەروونیەوە دەناڵێنێ، ئەمەش وادەکات لەناخیدا پێکەنین و خەو و خەندە و خۆشی بنێژێ و چاوەڕێی مەرگ بکات پێش ئەوەی مەرگی پێش بخەن .

**دووەم : لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە :** لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە پیاوان دەتوانن ئاسانتر دەرباز بن وەك لە ئافرەت.

کاتێ ئەنجامدانی ئەو تاوانە ئاشکرا دەبێ پیاوەکە دەتوانێ بڕوا و بچێتە دەرەوەی ووڵات و خۆی حەشاربدا، یان هەندێ جار خزم و کەسەکانی داڵدەی دەدەن و بەرگری لێدەکەن، بۆیە پیاوان کەمتر مەترسی کوشتن یان هەرزیانێکی تر دەبن .

بەڵام ئافرەت یەکەم شت کەڕووبەڕووی دەبێتەوە هەڕەشەی کوشتنە، وە هیچ کەسێکیش ئامادە نیە لەخۆی بگرێ و داڵدەی بدات، گوێی بۆ ناگیرێ حیسابی ئاژەڵێکیشی بۆ ناکرێ لەهەموو لایەکەوە هێرشی هێندە توندی بۆ دەکرێ گەر بۆ هەرپیاوێك بکرێ بەرگەی ناگرێ، بۆیە لەم لایەنەوە ئەو ئافرەتە یان دەکوژرێ یان خۆی دەکوژێ.

مامۆستایەکی بەڕێز گوتی: تەلەفۆنم بۆهات ئافرەتێك بوو گوتی: مامۆستا خوشکەکەم داوێن پیسی لەگەڵ کوڕێك کردووە و کوڕە هەڵهاتوە چۆتە دەرەوەی وڵات منداڵێکیشیان هەیە، ئێستا ئەوە یەك لابۆتەوە کە خوشکەکەم دەکوژن بەڵام من منداڵەکەم لە دەست برا و باوکم دەرهێناوە ئایا گوناهبار نابم بچم ئەو منداڵە لەبەر دەرگای مزگەوتێ دابنێم؟ چونکە دڵنیام ئەو منداڵە لەم ماڵەوە ناتوانێ بژی و لەناوی دەبەن.

گوتی: منیش ڕەقەمی پارێزەرێکم ( محامی ) پێدا گوتم دادە قسەی لەگەڵ بکە با چارەسەرێکت بۆ بکات، ئەوە بوو پارێزەرەکەی هاوڕێم منداڵەکەی لێ وەرگرتبوو دایبوو بەخێزانێك کە منداڵیان نەدەبوو .

وە ڕۆژی دواتر لە ڕاگەیاندنەکانەوە بیستم کە ئەو ئافرەتە کوژراوە.

## بەگشتی ئەو نەخۆشیانەی لەڕێگەی سێکسەوە تووشی مرۆڤ دەبن.

لەسەرووی هەموویانەوە، ئایدز ...
ئەو نەخۆشیانەی لە رێگەی سێکسەوە دەگوازرێنەوە...
زۆر نەخۆشی هەن لەڕێگەی سێکسکردنەوە دەگوازرێنەوە، ڕەنگە تۆ خەیاڵت تەنیا بۆ نەخۆشی ئایدز بچێت کە لە رێگەی سێکسەوە دەگوازرێتەوە، بەڵام چەندین نەخۆشی دیکەش هەن بەو رێگەیە دەگوزارێنەوە، کە تۆ هەر بیریشت بۆی ناچێت. لەوانە:
١- بالووکە: بالووکە بەهۆی ڤایرۆسی پاپیلۆما (HPV ) دروست دەبێت. گواستنەوەی ڤایرۆسەکە پێویستی بە سێکسکردن نییە، بەڵکو بەرکەوتنی پێستی کەسی تووشبوو بە کەسێکی تەندروست دەکرێ ببێتە هۆی تووشکردنی بە بالووکەی کۆم یان ئەندامانی زاوزێ. هەندێ جۆری ئەم بالووکانە زیانی درێژخایەن لەسەر کەسی تووشبوو دروستناکەن، بەڵام هەندێکی دیکەیان دەبنە هۆی تووشبوون بە شێرپەنجەی کۆم یان شێرپەنجەی ملی منداڵدان. ئێستا ڤاکسین هەیە لە دژی هەندێ لە جۆرە ترسناکەکانی ڤایرۆسی پاپیلۆما.
٢- گەڕی: کرمۆکەیەکی بچووك پێست دەدڕێت، هێلکەی لەژێر دادەنێت و دەبێتە هۆی پەیدابوونی پەڵەی سووری پێست و خورویەکی بەهێز لە پێستدا دروستدەکات. بەرکەوتنی پێستی کەسێکی تەندروست بە کەسێکی تووشبوو

دەبێتە هۆی گواستنەوەی نەخۆشییەکە و یەکێك لە رێگا بڵاوەکان بەریەککەوتنە لە ئەنجامی پەیوەندی سێکسی.

٣- سوزەنەك (سەیلان): سوزەنەك بە ئاسانی لە رێگای سێکسەوە دەگوازرێتەوە و ئەگەر چارەسەر نەکرێ دەکرێ ببێتە هۆی نەزۆکی لە پیاوان و ژناندا، ئافرەتان درەنگتر پێی دەزانن بەهۆی سروشتی فسیۆلۆجیەوە لە حەیز و شتی تر .

بەڵام پیاوان زووتر پێی دەزانن ، بەهۆی ئەو ئیلتیهابەی کەلەداوێنی دروست دەبێت، وە ئیفرازاتی بۆگەنی لێ دەدرێت و دەسوتێتەوە، وەبۆنێکی زۆر ناخۆشی هەیە، وە ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێت و لە داوێن پیسی دوور نەکەوێتەوە ئەوە میکرۆبەکە دەگاتە پرۆستات و گون و بۆڕی میز و تەسکی دەکاتەوە و زیان بە کۆئەندامی میز دەگەیەنێ، دوای ئەوە دەبێ نەشتەرگەری بۆ کەسی تووش بوو بکرێت وە زۆرجاریش سەرکەوتوو نابێ.

چارەسەر لەڕێگای پێدانی دژە زیندە دەبێت.

نیشانەکانی: سووتانەوە لەکاتی میزکردندا، کێم لێهاتن لە ئەندامی زاوزێ، دواتر دەبێتە هۆی پەڵەی پێست و دەکرێ بۆ خوێن و ناو جومگەکان بڵاوببێتەوە.

٤- زوهری (سفلس): برینێکی خڕی نیمچە رەقی بێ ئازارە لە کۆم یان ئەندامی زاوزێ دێت. لێکەوتنی پێستی کەسی تەندروست بە برینەکە پێدەچێ ببێتە هۆی وەرگرتنی میکرۆبی نەخۆشییەکە و دواتر تووشبوونی.

بەبێ چارەسەرکردن، لەوانەیە کوێربوون، ئیفلیج بوون و مردنی لێبکەوێتەوە. چارەسەرەکەی بە پێدانی دژە زیندەی گونجاو دەبێت.

پیاوە هاوڕەگەزخوازەکان زۆرترین مەترسی تووشبوونیان بە زوهری لەسەرە. زۆرتر لە ٨٠%ی پیاوانی تووشبوو بە زوهری ئەوانەن کە سێکس لەگەڵ پیاوان دەکەن، بەگشتیش ٩٠%ی تووشبووانی ئەو نەخۆشییە لە پیاوانن.

٥- کلامیدیا: بە خێرایی لەڕێگەی سێکسەوە دەگوازرێتەوە و جگە لە کۆئەندامی زاوزێ، دەکرێ قوڕگ و کۆمیش تووش بکات. چارەسەرنەکردنی لەوانەیە ببێتە هۆی نەزۆکی.

نیشانەکان لە پیاواندا: خوران و سووتانەوە لە سەری چوکدا، کێم لێهاتن لە کونی چوکەوە، میزی بە ئازار.

نیشانەکان لە ئافرەتاندا: خورانی زێ، هاتنە دەرەوەی دەردراوی بۆن ناخۆش لە زێ، سێکسی بە ئازار و میزکردنی بە ئازار.

٦- تامێسك: لە ڕێگەی ماچەوە بۆ لێوی کەسی تەندروست دەگوازرێتەوە. بەڵام بەهۆی مژینی کۆئەندامی زاوزێش دەگوازرێتەوە، دواتر لە ئەنجامی کرداری سێکس بۆ کۆئەندامی بەرامبەر دەگوازرێتەوە.

٧- هەوکردنی جگەر :B : ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر جۆری B حاڵەتێکی مەترسیدارە، دەبێتە هۆی پەککەستنی جگەر و تووشکردنی بە شێرپەنجە.

ئەم ڤایرۆسە لەڕێگای شلەمەنییەکانی جەستەوە دەگوازرێتەوە. وەکو سێکسکردن و بەکارهێنانی دەرزی یان گوێزانێك کە پێشتر لەلایەن کەسی تووشبوو بەکارهاتبن.

نیشانەکانی: لەوانەیە بۆ چەندین ساڵ تووشبوو بیت، بێ ئەوەی نیشانەی نەخۆشیت هەبێت. ئێڵنج و سك ئێشە و زەردوویی و هەستکردن بە ماندوێتی لە نیشانەکانی نەخۆشییەکەن.

٨- ئایدز: ڤایرۆسی HIVدەبێتە هۆی لاوازکردنی کۆئەندامی بەرگری جەستە لەدژی میکرۆبە جیاوازەکان. ڕێگاکانی گواستنەوە بریتین لە هەمان ڕێگاکانی گواستنەوەی ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر جۆری B .

نیشانەکانی: لەوانەیە بۆ چەندین ساڵ هەست بە هیچ نیشانەیەك نەکات، یان هەستکردن بە نیشانەکانی هەڵامەت بۆ چەند مانگێك.

٩- هەوکردنی پرۆستاتی تیژ و درێژ خایەن : ئەم جۆرەیان تەنها تووشی پیاوان دەبێت، چونکە پرۆستات لە نێرینەدا هەیە کە بریتییە لە پارچە گۆشتێك ماددەی مەنی دەردات و دەکەوێتە کۆتایی بۆڕی میزەوە ، جا ئەم هەوکردنە زۆر جار لای گەنجان پەیدا دەبێت و سەرەنجام پرۆستات لەکار دەکەوێت و بۆڕی میزی دەگیرێت و پاشان گورچیلە لەئیش دەخات.

١٠- هرباز جینتالس: ئەویش هۆکارەکەی داوێن پیسیە و تووشی کۆئەندامی زاوزێی هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ دەبێت بەشێوەی برین و بڵقی گەورە کە بەردەوام ئازاری زۆری لەگەڵدایە [١]

[١]- سایتی ڕووداو – Webmdبەدەست کارییەوە.

## کورتە باسێك لەسەر ئایدز ...

مێژووی نەخۆشیی ئایدز

لە سالانی نێوان ١٨٨٤ – ١٩٢٤ لە ڕۆژئاوای ناوەڕاستی ئەفریقا ڕاوچیان ڕاوی مەیمونی شامپازیان دەکرد. کە گومان دەکرێت کە هەندێك لە خوێنی مەیموونەکان چووەتە ناو جەستەی ڕاوچییەکان "لە ڕێگای برین".

وە دەشلێن خوێنی مەیموونەکان ڤایرۆسێکی تێدابووە، کە بێزیان بووە بۆ مەیموون بەلام بکوژە بۆ مرۆڤ ئەویش بریتی بووە لە ڤایرۆسی ئێچ ئای ڤی "ڤایرۆسی دابەزاندنی بەرگریی مرۆڤ" ڤایرۆسی نەخۆشیی ئایدز.

ئەوەی کە گومانی تێدانییە، **ئایدز** بۆ یەکەم جار لە سالی ١٩٨١ لە ئەمەریکا دۆزرایەوە، لە لۆس ئانجلس لەسەر ٥ پیاوی "هاوڕەگەزخواز"ی گەنج کە تووشی جۆرێکی کەڕوویی هەوکردنی سییەکان ببوون، ئەم جۆرە هەوکردنە بە نزیەکەیی هەرگیز نەبیندرابوو لە کەسێك کە سیستەمی بەرگریی سەلامەتی هەبووبێت، وەهەروەها لە نەخۆشییەکەدا ئەو کەسانە سیستمی بەرگریی لەشیان تووشی کەموکورتی و لاوازی دەهات و لە دەرەنجامی ئەوەدا تووشی پەسیوی، شێرپەنجەی پێست و چەندین نەخۆشی تر دەبوون.

بەهۆی ئەوەی سەرەتا تەنیا نەخۆشییەکە لە نێو هاوڕەگەزباز و بەکارهێنەری ماددەی هۆشبەر و نەخۆشیی هێمۆفیلی تۆمار دەکرا، ڕاگەیاندنەکان بە نەخۆشیی "کەمی بەرگریی لەشی هاوڕەگەزبازەکان" ناویان دەبرد، بەلام دواتر ئاشکرا بوو کە ئەو نەخۆشییە تەنیا تایبەت بە هاوڕەگەزبازەکان نییە، بەو

هۆیە لە حوزەیرانی ١٩٨٢دا، بۆ یەکەم جار وشەی "ئایدز"یان بەکار هێنا و لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٢ دا، ناوەندی کۆنترۆڵی نەخۆشی لە ئەمەریکا، بە فەرمی وشەی "ئایدز"ی بەکار هێنا.

ساڵی ١٩٨٣، دوو گرووپی توێژینەوەی سەربەخۆ لە یەك بەرپرسایەتی "رابێرت گالۆ" و "لۆك مۆنتانیە" لە خوێنی نەخۆشی تووشبوو بە ئایدز، ڤایرۆسێکیان دۆزیەوە، ئەو گرووپانە هەر یەکەو ناویان بۆ هەڵبژارد، بەڵام دواتر لە ساڵی ١٩٨٦ دەرکەوت هەردوو ڤایرۆسی دۆزراوە، یەك ڤایرۆسن و پاش ئەوە ناوی "HIV" یان بۆ ئەو ڤایرۆسە دیاری کرد.

ساڵی ١٩٨٨ بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاگاداری لە نێو خەڵکدا لەسەر نەخۆشیی ئایدز و هەروەها بەرگریکردن لە تووشبوون بەو نەخۆشییە، رۆژی یەکی کانوونی یەکەم، وەك رۆژی جیهانیی ئایدز دەستنیشان کرا و ساڵی ٢٠١١ تا ٢٠١٥، سێ دروشمی "بەرگریی لە مردن بە هۆکاری ئایدز"، "بەرگری لە هەڵاواردن و ناونیتکەدان لە نەخۆشی ئایدز" و "بەرگری لە توشبوون بە نەخۆشیی ئایدز"، وەك دروشمی جیهانی بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ نەخۆشیی ئایدز دەستنیشان کراوە.

هەر ئەو ساڵە هێمای "دەسرۆکەی سوور" وەك هێمای بەرەورووبوونەوە لەگەڵ نەخۆشیی ئایدز دستنیشان کرا.

## جیاوازی نێوان ئایدز و (HIV) چیە ؟؟ ...

**HIV** : واتە : ڤایرۆسی کەمی بەرگری لەش .

(HIV) ڤایرۆسێکە پەلاماری کۆئەندامی بەرگریی لەشی مرۆڤ دەدات و نایەڵێت ئەو کۆئەندامە فەرمانی خۆی جێبەجێ بکات. بەشێوەیەکی سروشتی، کۆئەندامی بەرگری توانای بەرپەچدانەوەی زۆر لە ڤایرۆسەکانی هەیە، وە لەگەڵ ئەم ڤایرۆسەدا بەبێ وەرگرتنی چارەسەر، ناتوانێ شەڕ بکات.

## کەواتە ئایدز چییە؟

ئایدز یان "AIDS" کە کورتکراوەی Acquired immune deficiency syndrome و مانا کوردییەکەی دەبێتە نەخۆشیی کەمی سیستمی بەرگریی لەش، لەو نەخۆشییەدا سیستمی بەرگریی لەش لاواز دەبێت و هۆکاری نەخۆشییەکەیش "ڤایرۆسی کەمی بەرگریی لەش"ە.

ئەگەر کەسی تووشبوو بە ڤایرۆسی کەمیی بەرگری (HIV) هیچ چارەسەرێکی وەرنەگرت، ئەوا بڕی ڤایرۆسەکە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکات و لە ماوەی دە ساڵدا حاڵەتەکە لە ڤایرۆسی کەمیی بەرگرییەوە بۆ نەخۆشیی ئایدز یان قۆناغی سێی ڤایرۆسەکە دەگۆڕێ. کەواتە دەتوانین بڵێین، ئایدز دەرئەنجامی درێژخایەنی تووشبوونە بە ڤایرۆسی (HIV).

ئایدز : واتە: نەمان و لاوازبوونی بەرگری جەستە ، بەمەش جەستە بە بچوکترین ڤایرۆس کاری تێدەکرێت چونکە کۆئەندامی بەرگری لاواز دەبێت و لەکاردەکەوێت و بەهۆیەوە کەسی هەڵگری ئەم ڤایرۆسە ماوەیەك ئەم

نەخۆشییەی پێوە دەبێت و دەمرێت و هەتا ئێستا چارەسەری ئەم نەخۆشییە نەدۆزراوەتەوە ،ئایدز یەکێکە لە نەخۆشیە ڤایرۆسییە مەترسیدارەکان کە ساڵانە بەهۆیەوە چەندین کەس گیان لەدەست دەدەن ، نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە لە کەسێك بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت .

چۆن (HIV) بۆ ئایدز دەگۆڕێ؟...

ڤایرۆسی (HIV) خانەکانی خڕۆکە سپییەکانی خوێن وێران دەکات، بەمە ڕۆژبەڕۆژ ژمارەیان کەم دەبێتەوە، بەمەش بەرگریی لەش دادەبەزێ و تووشی جۆرەها نەخۆشی دەبێت. لەم بارەدا نەخۆشییەکە بە ئایدز دەستنیشان دەکرێ. ئەمەش قۆناغ بە قۆناغ دەبێ ...

قۆناغەکانی تووشبوون...

تووشبوون بە ڤایرۆسی HIV ناگۆڕێت بۆ نەخۆشی ئایدز هەتا وەکوو تووشبووەکان بەم سێ قۆناغەدا نەڕۆن.

قۆناغی یەکەم

بەقۆناغی یەکەمی تووشبوون بە ڤایرۆسی HIV دەڵێن "قۆناغی هەڵهاتن"، کە جیا دەکرێتەوە بە دەرنەکەوتنی هیچ نیشانەیەکی نەخۆشی یان زۆرکەم تێیدا، بەڵام ڤایرۆسەکان دوو هێند دەبن، ژمارەیان زیاد دەکات. کاتێک کە کۆئەندامی بەرگری دەست دەکات بەهێرشەکەی، پلازمەخانەکان دژەتەنەکان درووست

دەکەن بۆ پەلاماردانی ڤایرۆسەکە. بۆ تاقیکردنەوەی هەبوونی ڤایرۆسی HIV لەباری تووشبوون پێویست دەکات کە بڕی پەیداکراو لە دژەتەنەکانی ڤایرۆسی HIV زۆر بێت. ئەمەش پێویست بە تێپەڕبوونی چەند هەفتەیەك دەکات بەسەر تووشبوونەکەدا، کە لەوانەیە تووشبووەکان لەماوەی قۆناغی یەکەمدا هەست بکەن کە تەندرووستییان باشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان دەتوانن خەڵکی دیکە تووش بکەن. وە لەوانەیە قۆناغی یەکەم ماوە ١٠ ساڵ یان زیاتر بخایەنێت.

قۆناغی دووەم

سەرەتای دەرکەوتنی نیشانە خراپەکان، ئاماژەیە بەدەستپێکردنی قۆناغی دووەمی نەخۆشی ئەیدز. خانەکانی B بەردەوام دەبن لەبەرهەمهێنانی بڕێکی زۆر لە دژەتەنەکان بۆ ڤایرۆسی HIV، هەرچەندە ژمارەی خانەکانی T بەردەوام لە کەمبوونەوەدان، هەر لەو کاتەش کە ڤایرۆسەکە لەدووهێندبوونی خۆی بەردەوامە. لەگەڵ بێ توانایی کۆئەندامی بەرگری؛ لیمفەڕژێنەکان هەڵدەئاوسێن و هەست بە ماندووبوون دەکرێت و کێش کەم دەکات و تالێهاتن دەردەکەوێت، سکچوونیش ڕوودەدات و تووندیش دەبێت. لەهەندێک توشبوودا، لەوانەیە لەبیرچوونەوە و شێوازی بیرکردنەوەی نادرووستیش ڕووبدات.

قۆناغی سێیەم

لەقۆناغی سێیەمدا ژمارەی خانەکانی T یاریدەدەر کەمدەبنەوە، بەڕادەیەک نەتوانن خانەکانی B و خانەکانی T ژەهراوی چالاک بکەن لەپێناو بەرهەڵستیکردنی ڤایرۆسە هێرشبەرەکە. لەئەنجامی ئەمەشدا بڕی دژەتەنەکان بۆ دژەپەیداکەرەکانی HIV کەمدەبنەوە، لەناکاو ژمارەی ڤایرۆسەکانی HIV زیاد دەکەن، ڤایرۆسەکان لە تێکشکاندنی ئەو بەشە کەمەی خانەکانی T یاریدەدەر دەمێنێتەوە، بەردەوام دەبن. بەمەش دەستنیشانکردنی نەخۆشی ئایدز دەکرێت، ئەو کاتەی کە ژماری خانەکانی T یاریدەدەر کەمدەبنەوە بۆ ۲۰۰ خانە لە یەک میلی لیتری خوێن یان کەمتر لەو ژمارەیە، بەرامبەر بڕە ئاساییەکەی کە لەنێوان ۶۰۰-۷۰۰ خانەی T یاریدەدەر لەیەک میلی لیتر دایە. هەروەها دەتوانرێت دەستنیشانی نەخۆشی ئایدز بکرێت لەکاتی دەرکەوتنی تووشبوونی هەڵپەرست.

## چۆن تووشی نەخۆشیی ئایدزدەبین؟!...

بەگشتی سێ هۆکاری سەرەکی بۆ مەترسی تووشبوون بە نەخۆشیی ئایدز هەیە:

۱- سەرجێیکردن "پێوەندی سێکسی.

باوترین هۆکاری تووشبوون بە نەخۆشیی ئایدز، سەرجێیکردنە و زۆربەی حاڵەتەکانیش بە گشتی لە جیهاندا سەرجێیکردنی پیاو و ژنە و هاوڕەگەزبازیی نێو نێرەکان یەکێکی تر لە هۆکارەکانە. بەگشتی ٦٤%ی هۆکاری تووشبوون بە

نەخۆشیی ئایدز، دەگەڕێتەوە بۆ "سەرجێکردنی پڕ مەترسی" سەرجێیکردن لەگەڵ لەشفرۆشان.

کاتێ کەسێك نەخۆشی یان برینی لە کۆئەندامی زاوزێ هەبێت، مەترسیی تووشبوون بە ئایدزی زۆرترە.

مەترسی گواستنەوە لە ژنەوە بۆ پیاو زیاترە، واتە ئەگەر ژنێك تووشی نەخۆشیی ئایدز بووبێت و پیاوێك سەرجێی لەگەڵدا بکات، مەترسیی تووشبوونی زیاترە تا پیاوێك تووش بووبێت و ژنێك سەرجێی ئەو پیاوە بکات؛

پێوەندی سێکسی لە زارەوە ( زمانەوە) مەترسی کەمە، بەڵام زۆریش روون نییە و ناکرێ بگوترێ هەر مەترسی نییە.

سەرجێیکردن لە دواوە، مەترسیی تووشبوونی نەخۆشیی ئایدز زیاتر دەکات.

٢- خوێن

دووەمین رێگەی تووشبوون بە نەخۆشیی ئایدز، ئاڵوودەبوون بە خوێنی نەخۆشیی ئایدزیە رێگەی ئالوودەبوون زۆر جیاوازە

١: بەکارهێنانی دەرزی پیس.

٢: برینی جەستە بە چەقۆ، یان ئامێرێکی تیژ کە پێشتر ئاڵوودەی خوێنی نەخۆشییەکی ئایدزی بووبێت.

٣: ئامێرێکی پزیشکی کە ستریل نەبێت، مەترسیی گواستنەوەی نەخۆشیی ئایدزی لەسەرە.

زۆربەی ئەو کەسانەی لە رێگەی سرنجەوە ( دەرزی ) ماددەی هۆشبەر بەکار دێنن، مەترسیی تووشبوونیان بە نەخۆشیی ئایدز لەسەرە و بە پێی ئاماری

ساڵی ٢٠٠٩، ١٢%ی ئەوانەی تووشی ئایدز بوون، بەکارهێنەری مادەی هۆشبەر بوون کە دەرزی ئاڵوودەیان بەکار هێناوە و لە دەرنجامی ئەوەدا تووشی هاتوون.

لە خاڵکوتان و تاتۆکردندا مەترسیی تووشبوون بە نەخۆشیی ئایدز هەیە. هەروەها لە کاتی خوێن تێکردنەوەدا مەترسیی تووشبوون هەیە، بەڵام ئێستە لە بانکی خوێنەکان بۆ هەموو ئەو خوێنانە پشکنینی نەخۆشیی ئایدز دەکرێت، بۆیە ئەو مەترسییە زۆر کەمە.

لە وڵاتانی دواکەوتوو بەهۆی ئەوەی پاك و خاوێنی تەواو لە کاتی ددانکێشان و راژە پزشکییەکان لەبەرچاو ناگیرێت، مەترسی هەیە کەسانێك لە شوێنە تەندروستییەکان تووشی ئایدز ببن.

٣- لە ڕێگەی دایکەوە بۆ کۆرپەڵەکەی

سێیەمین هۆکاری تووشبوون بە نەخۆشیی ئایدز، مەترسیی ئەوە هەیە کۆرپەی دایکێك کە نەخۆشیی ئایدزی بێت، کۆرپەکەیش تووشی ئایدز ببێت، ئایدز لە ڕێگەی شیری دایکەوە دەگوازرێتەوە.

## گرنگترین نیشانەکانی نەخۆشی ئایدز...

تووشبوون بە ئایدز، واتە کۆئەندامی بەرگریی لەش لە خراپترین باری تێکچوون و دارِماندایە، لەبەر ئەوە، بەئاسانی جەستە دەبێتە نێچیری نەخۆشییەکان، وەك شێرپەنجەی جۆری ئینتهازی، واتە لە شوێن دۆخێکی لاوازی جەستەدا دەگەڕێ و نەبوونی بەرگریی لەش بە هەل دەزانێت. کەسی ساغ (واتە ئەم ڤایرۆسەی نەبێت) تووشی ئەم شێرپەنجانە نابێت، چونکە کۆئەندامی بەرگری بە شێوەیەکی سروشتی کار دەکات و دەیپارێزێت. بەگشتی نیشانەکانی ئایدز ئەمانەن:

یەکەم: تا، بە یەکەم نیشانەی ئایدز دادەنرێت وە پلەی گەرمی تای ئایدز دەگاتە ١٠٢ پلەی فەهرەنهایت واتە ٣٩ پلەی سیلیزی، لەگەڵ تووشبوونی مرۆڤ بە ڤایرۆسی ئایدز لە تەك تادا تووشی شەکەتی بەردەوام و ئاوسانی لیمفە گرێکان و ئازاری قورِگ و لاوازی سیستەمی بەرگری لەش دەبێتەوە.

دووەم: هەستکردن بە ماندوویەتی، ئەو هەوکردنەوەی کە تووشی لەش دەبێت بەهۆی نەخۆشی ئایدزەوە، سیستەمی بەرگری لاواز دەکات وە هەست بە ماندوویەتی و تەمبەڵی و نەمانی چالاکی لەش کە یەکێکن لە نیشانەکانی تووشبوون بە ڤایرۆسی ئایدز.

سێیەم: هەڵئاوسانی لیمفە گرێیەکان و درووستبوونی گرێ، زۆر جار دەرکەوتنی ئەم نیشانە بە هەڵامەت دەست پێ دەکات، یان نەخۆشی دیکەی ڤایرۆسی وەکو ئاوسانی جگەر، هەمان نیشانەن وەکو ئازاری جومگەو ماسولکەکان و هەڵاوسانی لیمفەکان. لیمف یەکێکە لە بەشەکانی سیستەمی

بەرگری لەش لەکاتی بوونی هەوکردندا هەڵدەئاوسێن زۆر جار دروست بوونی ئەم گرێیانە لە بنباڵ و بەر میزڵدان و ملدا دروست دەبن.

چوارەم: ئازاری قورگ و سەرئێشە، لەکاتی بوونی بڕێکی زۆر لەم نیشانانەدا پێویستە تاقیکردنەوەی ڤایرۆسی بکەن، بۆ ئەوەی لە زووترین کات دەست بەسەر گەشەکردنی ڤایرۆسەکەدا بگیرێ و ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی بکرێت، ئەم جۆرە سەرئێشەیە بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێت بەبی پشوودان زۆر توند دەبێت.

پێنجەم: زیپکە و سووربوونەوەی بەردەوامی پێست، دەتوانن لە قۆناغی سەرەتای نەخۆشی ئایدزدا دەربکەوێت ، کە بە هۆی هەستەوەری یان سەرماییەکی کەمەوە دروست دەبێت کە وەکو زیپکە وان لەگەڵ سووربوونەوەی ئەو ناوچەیە کە بە شێوەیەکی ئاسانی چارەسەر ناکرێت.

شەشەم: هێڵنجدان و ڕشانەوە و سکچوون، لە هەرکوێیەك تووشبوویەك هەبێت بە نەخۆشی ئایدز ئەوە بە ڕێژەی ٪۳۰ بۆ ٪ ٦٠ توشی هێڵنجدانی بەردەوام دەبن، لە قۆناغی سەرەتاشدا ڕشانەوە و سکچوونی ماوە درێژ بوونی دەبێت.

حەفتەم: کەمبوونەوەی کێشی جەستە، لەکاتی کەمبوونەوەی کێشدا ئەوە نەخۆشییەکە دەگاتە حاڵەتی مەترسی و زاڵبوونی نەخۆشییەکە بە سەر هەموو لەشدا کە بە هۆی سکچوونی زۆرەوە بڕێکی زۆر کێش لە دەست دەدرێت، بەپێی ئەو توێژینەوەی کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کراوە و چاودێری تووشبوانیان کردووە دەرکەوتەوە نەخۆشەکە لەماوەی

مانگێکدا ٪ ١٠ کێشی لەشیان لە دەست دەدەن بەهۆی ئەو سکچوونەوە ڕێژەیەکی زۆر ئاو لە خانەکانی لەشدا کەم دەبێتەوە.

هەشتەم: نەخۆشی لە سییەکان، کۆکە و هەناسەتەنگی و دابەزاندنی کێش لەگەڵ هەوکردنێکی زۆر هۆکاری کەمبوونەوەی بەرگری لەشن کە بە شێوەیەکی ڕێك کار و چالاکییەکانی لەش جێبەجێ ناکەن، وە زۆر جار ئەم هەوکردنانە تووشی دیوارەکانی مێشك دەبن و بەهۆی جۆرە ڤایرۆسێکەوە کە پێی دەوترێ "toxoplasmosis " تۆخۆپلاسمۆسیز .

نۆیەم: گۆرینی شێوە و ڕەنگی نینۆك، نیشانەیەکی دیکەی هەوکردنی نەخۆشی ئایدز گۆڕینی شێوەی نینۆکە وەکو ئەستوربوون و چەمانەوەی نینۆك وە جیابوونەوەی نینۆك یان گۆرینی ڕەنگی نینۆك بۆ قاوەی یان رەشبوونی بە شێوەی ستوونی یان ئاسۆی بە شێوەی هێڵ لەسەر نینۆکەکە دەردەکەوێت.

دەیەم: هەستکردن بە شەکەتیی بێ هۆ و بە بەردەوامی.

یانزەیەم: زیپکەی سەر پێست.

دوازدەیەم: سەرئێشەی بەردەوام و بەهێز

سیانزەیەم: ئارەقکردنەوەی زۆر بەتایبەت لە شەودا

چواردەیەم: تێکچونی توانای بینین

پانزەیەم: هەوکردنی قورگ و برینی ناودەم و دەوروپشتی لێو

شانزەیەم : لەگەڵ هەڵئاوسانی ڕژێنە لیمفاوییەکان بەتایبەتی لە ملدا

حەڤدەیەم: هەروەها دەرکەوتنی زیپکە لەسەر پێست.

بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی نەبوونی بەرگرییەوە لەش تووشی جۆرەها نەخۆشی سەخت دەبێت، کە باوترینیان ئەمانەن: سیل، هەوکردنی پەردەی مێشك و دڕکە پەتك، دروستبوونی چینێکی ئەستووری سپی لەسەر لینجە پەردەی ناو دەم، زمان، سورێنچك، یان ناوچەی زێ. شێرپەنجەی سارکۆما، کە وەرەم لەسەر دیواری بۆرییەکانی خوێن دروست دەبێت، ئەم جۆرە شێرپەنجەیە زۆر بە دەگمەن تووشی کەسانی غەیرە تووشبووان بە ئایدز دەبێت. شێوەی پەڵەی سوور، یان ئەرخەوانیی مەیلە و پەمەیی لەسەر پێست و ناو دەم دەردەکەوێ، پەڵەکان لە کەسانی ڕەشپێستدا ڕەنگیشیان تاریك بێت. بەمە دەڵێن ماکەکانی تووشبوون بە ئایدز.

تێبینی: بەگوێرەی ڕاپۆرتی کۆمەڵەی پزیشکانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئایدز لە ئەمەریکا، کاتێك ئەم جۆرە ڤایرۆسە بەیەکێك لە هۆکارەکانی گواستنەوە دەگوزارێتەوە بۆ نێو جەستەی کەسێکی تر دەرکەوتنی نیشانەکانی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاواز دەبێ، هەیە دوای دوو هەفتە و هەشیانە ماوەی ساڵێك و تەنانەت دوای ١٠ ساڵ تووشبوون ئینجا نیشانەکانی ئایدز لە مرۆڤەکە دەردەکەوێت.

## دەستنیشانکردنی ئایدز...

نەخۆشی ئایدز بە پشکنینی خوێن ئەنجام دەدرێت کە بە بوونی دژەتەنەکانی دژی ڤایرۆسی ئایدز HIV لە خوێن یان لە شلەکانی لەشدا ئینجا پۆزەتیڤ دەردەکەوێت. لەپاش گەیشتنی ڤایرۆسی ئایدز بە لەش و دروستکردنی هەوکردن بە ٦ هەفتە تا ٣ مانگ ئینجا لەش دژەتەنەکان دروست دەکات و پشکنینی خوێن بۆ دەستنیشانکردنی ئایدز پۆزەتیڤ دەبێت، بەم ماوە کاتییەش دەووترێت ماوەی پەنجەرە Window period، هەر لەبەر ئەمەشە کە پشکنینی خوێن راستەوخۆ لەپاش گەیشتنی ڤایرۆسی ئایدز بە لەش نێگەتیڤ پیشان دەدات کە لەوانەیە پاش ٣ مانگ پۆزەتیڤ پیشان بدات. ماوەی پەنجەرە چەندی بڵێی هەستیارە، چونکە لێرەدا تووشبوو ئەگەرچی بە پشکنینی خوێن دەستنیشان نەکراوە، بەڵام ئەگەر ڤایرۆسی ئایدز لە لەشیدا هەبێت ئەوا بۆ کەسانی تر دەیگوازێتەوە بۆ نموونە بە رێگای سێکسکردن یان بەخشینی خوێن. زوو دەستنیشانکردنی نەخۆشی ئایدز بایەخی تەندروستی زۆری هەیە، چارەسەرکردنی زوو ئەگەری ئاڵۆزییەکانی ئایدز کەم دەکاتەوە و مەترسی مردن دوور دەخاتەوە، هەروەها وا لە کەسی تووشبوو دەکات کە بە شێوەیەکی تر رەفتار بکات بە مەبەستی بڵاونەکردنەوەی ڤایرۆسی ئایدز بۆ کەسانی تر. بۆ دەستنیشانکردنی ئایدز دوو پشکنینی خوێن ئەنجام دەدرێن، پشکنینی ئەنزیمی EIA یان پشکنینی ئێلیسا ELISA کە ئەگەر پۆزەتیڤ بوو ئەوا پێویست بە پشکنینی دووەم دەکات کە زۆر تایبەتمەندە بە ناوی پشکنینی

وێسترن بلۆت Western Blot بۆ چەسپاندنی دەستنیشان کردن ڕێگای کوردستان.

## ئایدز دۆخێکی مەترسیداری بۆ جیهان دروست کردووە...

نەتەوەیەکگرتوەکان هۆشداریی دەدات لە بڵاوبونەوەی ئایدز لە جیهاندا و ئاشکرای دەکات وەك پێویست بەرەنگاری ئەو نەخۆشییەوە نەبوونەتەوە.
لە نوێترین راپۆرتی هاوبەشی ڕێکخراوی بەرەنگاربونەوەی ئایدز و رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا ئاشکرا کراوە، جیهان وەک پێویست بەرەنگاریی ئەو نەخۆشییە نەبوەتەوە و رێژەی توشبوانی ئەو نەخۆشییە لە ماوەی حەوت ساڵدا بە رێژەی (%٣٤) زیادی کردوە و لە کۆی (٣٧) ملیۆن توشبو تەنها یەک ملیۆن کەس چارەسەری بۆ کراوە. راپۆرتەکە ئاماژەی بەوە کردوە؛ کە جیهان لە رێڕەوی تەندروستی خۆی لایداوە و وەك پێویست بەرەنگاریی ئەو نەخۆشییە نەبوەتەوە و دۆخی ئێستا مەترسییەکەی گەورەیە بۆ گیانی دانیشتوانی گۆی زەوی بەجۆرێک تەنها لە ماوەی ساڵی (٢٠١٧)دا زیاتر لە (١٨٠٠٠) منداڵ گیرۆدەی ڤایرۆسی ئایدز (HIV) بون. رونی کردوەتەوە تەنها لە ساڵی (٢٠١٧) رێژەی توشبوان بە ڤایرۆسەکە (١.٨) ملیۆن کەس بوە کە پێدەچێت ژمارەکە لەوە زیاتر بێت بەهۆی تۆمارنەکردنی بەشێک لە توشبوان بەو ڤایرۆسە. نەتەوە یەکگرتوەکان نەیشاردوەتەوە کە لە ماوەی حەوت ساڵدا نەتوانراوە وەک پێویست بەرەنگاری ئەو نەخۆشییە ببێتەوە و ئەوەش بوەتە هۆی ئەوەی لەسەرەتای دۆزینەوەی ڤایرۆسی ئایدز تا ساڵی (٢٠١٧) لە کۆی (٧٧) ملیۆن

توشبو، زیاتر لە (٣٥) ملیۆن کەس بەهۆی کەمتەرخەمییەوە گیانیان لەدەستداوە[١] وە لە سەرچاوەیەکی تر و بە پێی راپۆرتی ساڵانەی نەتەوە یەکگرتوەکان، ئێستا ژمارەی توشبووان بە ئایدز HIV لەهەموو جیهان گەیشتووەتە ٣٥ ملیۆن و ٥٠٠ کەس . رێکخراوەکە رایگەیاندووە لەگەڵ زیادبوونی رێژەی توشبووان، چارەسەرکردنیشی زیادی کردووە. لە راپورتەکەدا هاتووە ساڵی ٢٠٠٥ دوو ملیۆن و ٣٠٠ هەزار کەس توش هاتبوون، بەڵام ساڵی ٢٠١١ رێژەکە چوار سەد هەزاری چوەتە سەر. ساڵی ٢٠١٢ ملیۆنێك و ٦٠٠ هەزار کەسی توشبوو بەو نەخۆشییە گیانیان لەدەستداوە. پسپۆڕانی نەخۆشیی ئایدز رایانگەیاندووە بەگشتی لەوڵاتانی هەژار و پێشکەوتوو، نۆ ملیۆن و ٧٠٠هەزار کەسی توشبوو بەو نەخۆشییە چارەسەر کراون. بەوەیش رێژەی چارەسەرکردن گەیشتووەتە ٢٠%.

لەماوەی ١٢ ساڵی رابردوودا بەگشتی رێژەی توشبوون بەئایدز ٣٣% کەمیکردووە[٢]

---

١ سایتی (سبەی):

٢ ماڵپەری ئاژانسی ئانادۆڵۆڵ.

## ئایدزلە عێراق...

ساڵی ١٩٨٦ بۆ یەکەمجار ئایدز لەنێو عێراق دەستنیشانکرا. لەو ساڵەدا عێراق خوێنی لە کۆمپانیای ماریۆی فەرەنسیەوە هاوردە کرد، دواتر گوترا کە ئەو خوێنە هەڵگری ڤایرۆسی تووشکەری ئایدز بووە و بووەتە هۆی تووشکردنی ٢٧٣ کەس بە ئایدز. هەرچەندە عێراق سکاڵای لەدژی ئەو کۆمپانیایە تۆمارکرد و داوای قەرەبووکردنەوەی تووشبووانی کرد، بەڵام بێ ئەنجامبوو عێراق هیچی بەدەستنەهێنا لەو کۆمپانیایەوە،

لەو ساڵەوە ئایدز لە بڵاوبوونەوەدا بووە لە عێراق و بەپێی ئامارە فەرمییەکان تاوەکوو ساڵی ٢٠١١ بووەتەهۆی تووشبوونی ٦٠٩ کەس کە ٣٠٥ کەسیان دانیشتووی هەمیشەیی عێراق بوون.

بە گوتەی جێگری بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی تەندروستی عێراق، بە تێکڕا ساڵانە ٥٠ کەس لە عێراق توشی ئایدز دەبن.

## ئایدزلە کوردستان دا...

بەپێی داتاکانی وەزراەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان، لەساڵی ٢٠٠٤ تەنیا یەك حاڵەتی ئایدز لە هەرێمی کوردستان تۆمارکراوە کە ئەویش بیانی بووە، ساڵی ٢٠١٢ ژمارەکە گەیشتۆتە ٧ کەس کە دوانیان دانیشتووی هەرێم بوونە، ساڵی ٢٠١٥ ،( ١٤ ) حاڵەت تۆمارکران کە دوانیان دانیشتووی هەرێمی کوردستان بوون.
لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ٢٠١٦، ( ١٣ ) حاڵەتی تووشبوون بە ئایدز تۆمارکراون کە ٤ کەسیان دانیشتووی هەرێمن، ئەوانی دیکەش بیانی بوون و دوای دەستنیشانکردنی حاڵەتەکانیان رەوانەی وڵاتی خۆیان کراونەتەوە. تاوەکوو ئێستاش ٥ دانیشتووی هەرێمی کوردستان بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە مردوون، وە ڕێژەکەش بەردەوام لەزیاد بوونە . وە ئەوداتایانەش کەدراون ڕەنگەلەوانە زیاتر بێ و کەسەکان خۆیان ئاشکرا نەکردبێ یان تووشبوو پشکنینی پێویستی ئەنجام نەدابێت .

## چارەسەری ئایدز...

تا ئێستا توشبووانی نەخۆشیی ئایدز، چەندین دەرمان دەخۆن کە بە شێوەیەکی ڕێژەیی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەکە ڕادەگرێت و توندییەکەی سنوورداردەکات، بەڵام ئەو دەرمانانە ناتوانن ڤایرۆسەکە بە تەواوی لەناوبەرن، چونکە ڤایرۆسەکە لە هەندێك خانەی لیمفاوییدا دەمێنێتەوە و لەوێشەوە جارێکی تر بڵاودەبێتەوە.[1]

کەواتە ئایدز تائێستا چارەسەری نییە بۆکەسێکی تووش بوو بەڵام کەسێك سەرەتای تووشبوونی بێ تاڕادەیەك باشترە و لەم سەردەمەدا چارەسەری هەیە، ئەویش لە ڕێی وەرگرتنی ئەنتایبایۆتیکەوە دەکرێ ژیانی نەخۆش درێژ بکرێتەوە، بەڵام ئەستەمە ئەو داڕمان و زیانە گەورەیە چارەسەر بکرێ، کە لە کۆئەندامی بەرگریدا ڕووی داوە. لە حاڵەتی بەر لە گەیشتن بە قۆناغی ئایدز، دەرفەتی چارەسەرکردن گەورەترە، هەندێ جار لەدوای چارەسەرکردن، نەخۆش دەشێ ژیان بە سروشتی بەڕێ بکات. بەڵام ڤایرۆسەکە بەتەواوەتی بنبڕ نابێت، بەڵکوو چارەسەرەکە ڕێی گەشەکردن و زیادبوونی لێ دەگرێ و نایەڵێ بۆ ئایدز بگۆڕێ.

---

[1] - سەرچاوە: DW-

## پێشگیری کردن لە تووشبوون بە ئایدز...

لە جیهاندا ڕۆژی یەکی کانونی یەکەم بۆ ڕۆژی جیهانی نەخۆشی ئایدز ئەژمارکراوە، وە ساڵانەش نزیکەی یەك ملیۆن کەس بەهۆی ئەو نەخۆشیەوە گیان لەدەست دەدەن و سەرباری ئەوەش دوو ملیۆن کەسی دیکەش وەك توشبوی نوێی ڤایرۆسەکە دەبنە قوربانی.

بۆ ئەوەی دوور بی لە تووشبوون بە ئایدز دەبێ پێشگیری بکەی لەم پەتا پیسە، دەبێ بزانین سەرجێیکردن و ئاڵوودەبوون بە خوێن، هۆکاری سەرەکیی تووشبوون بە نەخۆشیی ئایدزن، بۆ ئەو سەرجێیانەی کە پڕ مەترسین (سەرجێیکردن لەگەڵ لەشفرۆشان) ، سەرجێیکردن لە دواوە مەترسیدارە، چونکە مەترسیی پچڕانی ماسوولکەی کۆم زۆرە و ئەوەیش دەبێتە هۆی ئەوەی خوێن و تۆ و تێکەڵ ببن کە مەترسیی تووشبوون بە ئایدز زیاد دەکات. ( دورکەوتنەوە لەم کارە قێزەونە )

بۆ کاروباری پزیشکی، بەتایبەتی دەرزی لێدان و برینپێچی و کاری پزیشکی ددان و.. سەردانی شوێنی پاك و خاوێن بکەن کە دڵنیایی تەندروستیی هەبێت. هەوڵ بدەن لە شوێنی وەك سەرتاشخانە، شتومەکی تایبەتی خۆتان بەکار بێنن و خۆتان بپارێزن لە بەکارهێنانی ئەو شتومەکانەی کە لە سەرتاشخانەکە بۆ هەمووانی بەکار دێنن. ئەو کەسانەی کە ماددەی هۆشبەر لە ڕێگەی دەرزیەوە بەکار دێنن، خۆ بپارێزن لە ئەوەی دەرزی بۆ دوو کەس بەکار بێنن. هەروەها منداڵەکانتان رابێنن کە شتومەکی تیژ و دەرزی فڕێدراو لەسەر شەقام و شوێنە گشتییەکان هەڵنەگرنەوە.

## لەئیسلام دا ...

پەروەردگارمان دەفەرموێ: { يَا بَنِي آدَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي فَمَنِ اتَّقَى وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ}[1]

واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم لە لایەن خوای گەورەوە پەیامبەرتان بۆ دێت کە ئایەتەکانی منتان بۆ ڕوون ئەکەنەوە ئێوە شوێنیان بکەون جا هەر کەسێك خۆی بپارێزێ لە تاوان وە کردەوەی چاك بکات و خۆی چاك بکات بە شوێنکەوتنی پێغەمبەران ئەوە لە داهاتوودا کە ئەمرن هیچ ترسێکیان لەسەر نیە، وە خەفەتیش لە ڕابردوو ناخۆن لە دونیا لەوەی کە بەجێیان هێشتووە، چونکە خوای گەورە باشتریان پێ دەبەخشێت.

{ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ}[2]

واتە: وە ئەو کەسانەیشی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە وە خۆیان بەگەورە زانیوە لە وەڵامدانەوەی ئا ئەمانە هاوەڵی دۆزەخن بە نەمری و هەمیشەیی تیایدا ئەمێننەوە بەهۆی کوفر کردنیان.

گومانی تێدانییە زینا لە ئیسلامدا ڕێگەپێدراو نییە و ئیسلام بە کارێکی قێزەون و ناشرین سەیری زینا دەکات و تەنانەت سزاشی بۆ ئەنجامدەرانی داناوە، بۆیە پەروەردگار لەلایەن نێردراوەکەیەوە پێمان ڕادەگەیەنێت کەبەهیچ شێوازێك

[1] - (٣٥) الاعراف
[2] - (٣٦) الأعراف.

نابێ نزیکی زینا بکەوینەوە و تەنانەت دەبێ خۆمانی لێ بەدووریش بگرین، ئەوەتا پەروەردگار لە قورئانەکەیدا دەفەرموێ:

{ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَاۖإِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا)[1]

واتە: وە ئێوە نزیکی زینا مەکەونەوە وە پێشەکیەکانی زینا هەمووی حەرامە، بەدڵنیایی ئەمە تاوانێکی بێزێنراوە وە خراپترین ڕێگایە لەبەر ئەوەی بەرەو دۆزەختان ئەبات.

وەلەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: (قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ)[2]

واتە: ئەی محمد ﷺ بڵێ: تەنها پەروەردگارم فاحیشەو بەدڕەوشتی و تاوانی حەرام کردووە ئەوەی بە ئاشکرا ئەکرێ و ئەوەی کە بەنهێنی ئەکرێ .

وەهەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ ئوممەتەکەی ئاگادار دەکاتەوە لەم کارە پیس و قیزەونە و دەفەرموێ:-

{ يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ، خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ : لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ، وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا... }[3]

واتە :- ئەی کۆچەرییەکان پێنج شت هەن ئەگەر تووشی ببن ( پەنادەگرم بە خوا کە تووشی ببن )، هەرکاتێك داوێن پیسی لەهەر گەلێکدا دەرکەوێت و بە

---

[1] - (٣٢) }الإسراء

[2] - (٣٣) الاعراف

[3] - ابن ماجه

ئاشكرا ئەنجامی بدەن ئیلا تاعون و دەرد و نەخۆشی سامناكی وا تیایاندا بڵاودەبێتەوە كە لەپێش ئەواندا لە باوك و باپیرانیان دەرنەكەوتووە.

بەڵێ ڕاستت كرد ئەی پێغەمبەری خوا ئێستا ئەوانەی ئەو جۆرە كارانە ئەنجام دەدەن دەرد و نەخۆشی وایان تووش بووە كەپێشتر شتی وا نەبووە .

ئەی ئەوكەسەی ئەو كارە ئەنجام دەدەی بیر بكەوە ئەگەر لەكاتی ئەنجامدانی ئەو كارە مردی و گەڕایتەوە لای پەروەردگارت بەبێ ئیمانی ؟ چی پێ دەڵێی ؟

{ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۖفَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةًۖوَلَا يَسْتَقْدِمُونَ)[1]

واتە: وە هەموو ئوممەتێك كاتی دیاریكراوی خۆیان هەیە كە تیایدا ئەجەلیان دێت وەكاتێك كە ئەجەلیان دێت تەنها یەك چركەو كاتێك نە ئەجەلیان دوا ئەكەوێ نە پێش ئەكەوێ.

ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەوكەسانەی كە داوێن پیسی ئەنجام دەدەن و ئیمان لەلاشەیان نامێنێ دەفەرمووێ: (لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ شَارِبُهَا حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ.)[2]

واتە: كەسێ داوێنپیسی بكات وە ئەوەی مەی بخواتەوە وە ئەوەی دزی بكات لەو ئان و ساتەدا هیچ ئیمان و بڕوایەكی لەناو دڵی نامێنێت.

كەواتە مرۆڤ دەبێ خاوەن شەرم و حەیا و خاوەنی ئیمان و باوەڕ بێ بۆ ئەوەی سوودمەند بن لەبەهەشتەكەی پەروەردگار و خۆ دووربگرێ لەو تاوانە

[1] - ( ٣٤ ) الاعراف

[2] - سنن النسائي

پیسانەی کە ئیمان لەجەستەدا ناهێڵن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەوانەی خاوەن شەرم و خاوەن ئیمانن دەفەرموێ: **(الْحَيَاءُ مِنَ الْإِيمَانِ، وَالْإِيمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْبَذَاءُ مِنَ الْجَفَاءِ، وَالْجَفَاءُ فِي النَّارِ )**[1]واتە: ئەوانەی خاوەن شەرم و حەیان خاوەنی ئیمان و باوەڕن، ئەهلی ئیمانیش ئەهلی بەهەشتن...

هەروەها پێویستە مرۆڤ ئاگاداری دەم و داوێنی بێ بۆ ئەوەی دوور بکەوێتەوە لە سزاو تاڵی و ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی ماڵی شەیتان کە " دۆزەخە".

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: مَا أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ الْجَنَّةَ ؟ قَالَ : " التَّقْوَى وَحُسْنُ الْخُلُقِ ". وَسُئِلَ : مَا أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ النَّارَ؟ قَالَ : " الْأَجْوَفَانِ : الْفَمُ وَالْفَرْجُ )**[2]

واتە :- پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا زۆرینەی خەڵکی بەچی دەچنە بەهەشت؟ ئەویش فەرمووی: بە تەقواو ڕەوشتی جوان، دیسان پرسیاری لێکرا : کە زۆرینەی خەڵکی بەچی دەچنە دۆزەخەوە؟ فەرمووی: بەهۆی هەردوو کوونەوە دەم و داوێن.

---

[1] - ابن ماجه

[2] - ابن ماجه

## چۆن وازدێنی لەوتاوانە پیس وکوشندەیە ...

ئەی مرۆڤ بیربکەوە و بترسە لەسزای خوا ئامۆژگاری وەربگرە و خۆت بەدوور بگرە لەتاوان، دەست لەسەرپێچی کردنی خوای گەورە هەڵبگرە و خۆت ڕزگار بکە لەدۆزەخی کۆتا نەهاتوو، ئەوانەی کە پەند وەرناگرن و سوود وەرناگرن ئەوانە هەڕەشەی گەورەیان لەسەرە، لەقورئاندا پەروەردگارمان لە سورەتی الاعلی دەفەرموێ :- { فَذَكِّرْ إِنْ نَفَعَتِ الذِّكْرَى }

واتە:- وە بەم قورئانە پیرۆزە یادی خەڵکی بکەرەوە ئەگەر هاتوو یادخستنەوە بۆ ئەوان سوودی هەبوو، بەڵام ئەگەر کەسانێك دوای ئەوەی کە ئامۆژگاریت کردوون و ئیقامە حوجەت لەسەر کردوون لە دوای ئەوە گاڵتەت پێ دەکەن و سوود نابینن ئەو کاتە ئەگەر یادیشیان نەخەیتەوە ئەوە هیچ شتێکت لەسەر نیە کە یادخستنەوەکە سوودی بۆیان نەبێ ئاساییە کە یادیان نەخەیتەوە، (لێرەیشەوە ئەدەبی بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی وەرئەگیرێ کە بە کەسانێك نەڵێی کە ئەهل نەبن و سوودی لێ نەبینن، بەڵکو کەسانێك کە سوودی لێ ببینن).

{ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ١٠ }

واتە: کەسانێك پەندو ئامۆژگاری وەرئەگرن و بیر ئەکەنەوەو یاد ئەکەنەوە کە ترسی خوای گەورە لە دڵیاندا بێ، ئەوان بەو یاد کردنەوەیە زیاتر ئەترسێن و زیاتر سوود وەرئەگرن.

{ وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى ١١}

واتە:- وە کەسێك کە بەدبەخت و خراپەکارو کافر بێ وە ڕۆچوو بێ لە تاوان و سەرپێچیدا ئەوان خۆیان لەو پەندو ئامۆژگاری و یادخستنەوەیە دوور ئەگرن.

{ الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَىٰ ١٢ }

واتە : ئەوانە دەچنە ناو ئاگرە هەرە گەورەکە کە ئاگری دۆزەخە -پەنا بە خوای گەورە- .

{ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ١٣ }

واتە:- کافران لەناو ئاگری دۆزەخدا نە دەمرن، نەدەژین ژیانێك کە سوودیان پێبگەیەنێت و بەژیان ناونابرێ، بەڵکو هەمیشە زیندوون بەڵام ئەوە ژیان نیە کە ئەوانی تێدان لەبەر ئەوەی هەمووی سزاو ئاگرو عەزابە -پەنا بەخوای گەورە-، جۆرەها سزاو عەزاب ئەدرێن ئەوە ژیانی پێ ناووترێ بەڵام ئەوەی کە ئەهلی تەوحید بێ و موسڵمان بێ و شەریکی بۆ خوا دانەنابێ بچێتە دۆزەخیشەوە لە دۆزەخدا وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێ: ئەوان لەناو دۆزەخدا دەمرن و دەبن بە خەڵوزو ڕەژوو وەکو ڕەحمەتی خوای گەورە بۆیان، وە دواتر دەرئەکرێن و ئەخرێنە بەهەشتەوە لە ئاوی حەیات ئاویان پیادا ئەکرێ لەلای بەهەشت ئەوکاتە ئەڕوێنەوە هەروەکو چۆن دانەوێڵە لە پەنای ئاودا ئەڕوێت بەو شێوازە ئەڕوێنەوە، ئەویش ڕەحمەتی خوای گەورەیە بۆ موسڵمانان ئەوانەی ئەهلی تەوحیدن ئەگەر بچنە دۆزەخیش لە دۆزەخدا دوای ئەوەی کە سزا ئەدرێن و ئەسووتێن و ئەبن بەخۆڵەمێش و ئەمرن لەناو دۆزەخداو دواتر دەرئەکرێن.

وە لە سورەتی " النازعات "دا پەروەردگاری جیهان دەفەرموێ :

{ فَأَمَّا مَنْ طَغَى (٣٧)}

واتە :- ئەو کەسەی لە دونیادا کوفری کرد بێت بە خوای گەورەو تاوان و سەرکەشی کرد بێت و سنووری بەزاند بێت.

{ وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا (٣٨)}

واتە:- وە ژیانی دونیای پێشخستبێ بەسەر قیامەت و دینەکەیداو لە حەرام نەگەڕابێتەوە.

{ فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى (٣٩)}

واتە:- ئەوە بە دڵنیایی دۆزەخ شوێنی گەڕانەوەی ئەوانەو لە دۆزەخدا ئەمێننەوە.

(( بۆ ئەوانەی گوێڕایەڵی دەکەن و لەخوا دەترسن ... ))

{ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ ٤٠}

واتە:- بەڵام کەسێك لە دونیادا ترسا بێت لە ڕاوەستان لەبەر دەستی خوای گەورەو زانیبێتی ڕۆژێك ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە وە لە ترسی خوای گەورە قەدەغەی نەفسی خۆی کردبێ لە هەواو ئارەزوو جڵەوگیری کردبێت.

{ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى (٤١)}

واتە:- ئەوە بە دڵنیایی شوێنی گەڕانەوەی ئەوان بەهەشتە، لەبەر ئەوەی لە دونیا خۆیان پاراستووە خوای گەورە لە قیامەت پاداشتیان ئەداتەوە بە بەهەشت.

## چاوت بپارێزه، خۆت بپارێزه ...

پەروەردگارمان فەرمان بە نێردراوەکەی دەکات و دەفەرموێ: { قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ( ٣٠ ) وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ( ٣١ )}[١]

واتە: ئەی محمد ﷺ بە پیاوانی باوەڕداران بڵێ: با چاوی خۆیان بپارێزن لە تێڕوانینی حەرام (چونکە زینای چاو بریتییە لە تێڕوانینی حەرام) وە داوێنی خۆیان بپارێزن لە زینا، وە لەوەی کە کەس نەیبینێت ئەمە بۆ دڵ و دەرون و دینیان پاکترە (ئەوەی چاوی بپارێزێت لە تێڕوانینی حەرام خوای گەورە روناکی بە بینایی دەبەخشێت و دڵی پاراو دەکات، وە تێڕوانینی حەرام تیرێکی ژەهراویە بۆ دڵ) بەڕاستی خوای گەورە زۆر زانیارەکی وردی هەیە بەو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی ئەدەن. وە ئەی محمد ﷺ بە ئافرەتانی باوەڕداریش بڵێ: با چاوی خۆیان بپۆشن لە تێڕوانینی پیاوانی نامەحرەم وە با داوێنی خۆیان بپارێزن لە

[١] - النور(٣٠- ٣١)

زینا، وە لەوەی کە کەس نەیبینێت چاو پاراستن دڵ بەپاکی دەهێڵێتەوە و پڕ نوور دەبێ و دڵی نابێتە دیلی هەوەس و ئارەزوو بازی، وە ئەو دڵەی پارێزراوە لە تاوان خۆشی خوای تێدا زیاتر و زۆرتر دەبێ و دەرگای دۆزەخ لەسەر کەسەکە دادەخات و دەرگای بەهەشت بەڕووی خۆیدا دەکاتەوە.

## دەروونت پاك بکەوە بەخوا پەرستی

پاککردنەوەی دەروون لە پیسیەکان و ڕاهێنانی دەروون لەسەر خواپەرستی، ڕق لێبوونەوە لەگونا ە و تاوان و دروست کردنی خۆشەویستی لەناخەوە بۆ خوا پاشان پێغەمبەرەکەی و دینەکەی، وە دواتر کردەوە پێ کردنی و ڕەنگ دانەوەی لەژیاندا، وەدەبێ وابژی و وە بەندایەتی خوابکەی و وا بیربکەیتەوە کە لەگەڵ هاویشتنی هەر هەنگاوێك پەروەردگارت چاودێریت دەکات و ئاگای لەهەموو هەڵسوکەوتەکانتە ،وەك ئەو فەرموودەیەی کە بۆمان هاتوە کاتێ جبریل علیه سلام دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و دەربارەی ئیحسان پرسیار دەکات و پێغەمبەریش ﷺ بەو شێوەیە وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێ:

**(أن تعبدالله كأنك تراه فأن لم تكن تراه فأنه يراك)**

واتە: ئەوها خودا بپەرستە وەك ئەوەی دەیبینی ئەگەر تۆش ئەو نابینی خودا دەتبینێ.

پەروەردگار هەموو کەسێکی لەسەر فیترەتێکی پاك دروست کردووە، وە ڕێگا ڕاست و چەوتەکەی نیشانداوە جا ئەوانەی گوێ ڕایەڵن و لەفەرمانی خوا

دەرناچن ئەوانە سەرکەوتوو و سەرفرازن وە ئەوانەشی ڕێگەخراپەکە دەگرنە بەر بۆ ئەوانە دۆزەخێکی پڕ لە ئێش و ئازار ئامادە کراوە .

پەروەردگار لە سورەتی الشمس دا دەفەرموێ:- **{ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا (٩) وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا (١٠)}**

واتە: وە سوێند بێت بە نەفس کە چۆن خوای گەورە مرۆڤی ڕێکخستووە، یاخود سوێند بێت بە نەفس کە خوای گەورە سەرەتا مرۆڤی دروست کردووە لەسەر نەفسێکی پاك و لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلام دروستی کردووە.

وە خوای گەورە ڕێنمایی مرۆڤی کردووە بۆ هەردوو ڕێگاکە: ڕێگای خراپ و ڕێگای چاك، کامە خراپەکارییەو کامە تەقوای خوای گەورەیە ڕێگای خێرو شەڕی بە مرۆڤ ناساندووەو بۆی ڕوون کردۆتەوە، وە فەرمانی پێ کردووە کە ڕێگای چاك بگرێتەبەرو خۆی لە ڕێگای خراپ دوور بگرێ.

بەدڵنیایی هەر کەسێك تەزکیەی نەفسی خۆی بکات و دەروونی خۆی پاك بکاتەوە لە هەموو تاوان و سەرپێچی و خراپەکاریەك ئەو کەسانە بەدڵنیایی سەربەرزو سەرفراز بوونە، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دوعای ئەکردو دەیفەرموو: **(اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا)** واتە: خوایە تەقوا بە نەفسم ببەخشەو نەفسم پاك بکەوە هەر تۆی کە بە باشترین شێواز پاکی ئەکەیتەوە، وە هەر تۆی کە سەرپەرشتی ئەکەیت.

{ وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا (١٠)}

واتە:- وە ئەوانەیشی کە نەفسی خۆیان وێڵ و گومڕاو سەرگەردان ئەکەن بە دڵنیایی ئەوانە زەرەرمەند بوونەو زەرەرمەندی ڕاستەقینە ئەوانەن کە نەفسیان هان نادەن بۆ گوێڕایەڵی خوای گەورەو کردەوەی چاك، بەڵکو جڵەوی نەفسیان بەر ئەدەنەوە بۆ ئەوەی کە هەموو خراپەکاری و تاوان و سەرپێچییەك بکات ئەوانە زەرەرمەندن.

## لەخوای گەورە بترسە ...

پەروەدگار دەفەرموێ: { فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ ۗ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ)[1]

واتە: خەڵك بوونە دوو بەش کۆمەڵێك هیدایەتیان وەرگرت وە کۆمەڵێکیش گومڕا بوون کە کافران بوون ئەوان شەیتانیان کردە دۆست و پشتیوان و یارمەتیدەری خۆیان لە غەیری خوای گەورەو گوێڕایەڵی شەیتانیان کرد وە وایان ئەزانی کە ئەوان لەسەر ڕێگای هیدایەتن ئەم ئایەتە ڕەددە بۆ سەر هاوبەشبڕیاردەران کە بە رووتی بەدەوری کەعبە تەوافیان دەکرد، وە لەسەر ئەوان دابەزی، ئەی ئادەمیزاد ئێوە لە هەموو مزگەوتێکدا خۆتان بڕازێننەوە وە عەورەتی خۆتان داپۆشن.

---

[1] - (٣٠)} الاعراف

دەبێ بزانین کە لەدونیادا هەموو لاشەمان ئەمانەتە لەلامان و لە ڕۆژی دوایيدا پەروەردگار پرسیاریان لێدەکات،وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ( فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا...)[1] واتە: بەڕاستی لاشەکەت مافی لەسەرتە.

مافی لاشەت بدە لەبەر ئەوەی کاتێ پەروەردگار پرسیار دەکات ئەوکات بەبێ ویستی تۆ هەموو لاشەت دێنە قسە، وەك پەروەردگارمان دەفەرموێ: {وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا}[2] واتە: وە لە شتێکیشدا کە زانیاریت نەبوو قسەی تیا مەکە بەتایبەتی لە دیندا، یاخود شایەتی ناحەق مەدە بەراستی بیستن و بینین و دڵی مرۆڤ هەر هەموو ئەمانە لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە پرسیاریان لێ ئەکات و ئەیانهێنێتە قسە.

کەواتە خۆت ئامادەبکە و بارگەت پڕکە لە چاکە و ڕەزامەندی پەروەردگارت بۆئەوەی کاتێ هەموولاشەت بە قسەهاتن بەباشە و بەچاکە شاهێدیت بۆ بدەن و بەهەشتە نەبڕاوە و ئاسوودەکەی پەروەردگارت بەدەست بهێنە .

وەك پەروەردگارمان دەفەرموێ: { وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ ٤٠ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ}[3] واتە: بەڵام کەسێك لە دونیادا ترسا بێت لە ڕاوەستان لەبەر دەستی خوای گەورەو زانیبێتی ڕۆژێك ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە وە لە ترسی خوای گەورە قەدەغەی نەفسی خۆی کردبێ لە هەواو ئارەزوو جڵەوگیری کردبێت.

---

[1] - البخاري

[2] - (٣٦) الإسراء

[3] - (٤٠-٤١) النازعات

ئەوە بە دڵنیایی شوێنی گەڕانەوەی ئەوان بەهەشتە، لەبەر ئەوەی لە دونیا خۆیان پاراستووە خوای گەورە لە قیامەت پاداشتیان ئەداتەوە بە بەهەشت.

کەواتە بەهەشت بۆ کەسانێکە کە خۆپارێزن لەگوناھ و تاوان و لەدونیادا باشترین ڕەوشتیان پێشکەش کردووە و کار و کردەوەیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا بووە.

پغەمبەری خوا ﷺ لە مەدحی ئەوکەسانەی کە کار و کردەوە و ڕەوشتیان جوانە، لەشوێنێ باس لەوە دەکات کە بڕواداری تەواوە و لەشوێنێکی تر ڕەوشتی جوان بە قورسترین شت وەسف دەکات لەتەرازوو دا و دەفەرموێ: ( أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا )[1] واتە: باوەڕداری تەواو ئەو کەسەیە کە باشترین ڕەوشتی هەیە.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: ( أَثْقَلَ شَيْءٍ فِي الْمِيزَانِ – يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْخُلُقُ الْحَسَنُ )[2] واتە: قورس ترین شت لە تەرازووی ڕۆژی دواییدا ڕەوشتی چاکە.

کەواتە بڕیاری ڕەوشت بەرزی و ڕەوشت جوانی بدە و سوودمەند بە لە بەهەشتە نەبڕاوەکەی پەروەردگار. بزانە بەردەوام بوون لەسەر زینا دینی کەسەکە ناهێڵێت و شەرم و ئابڕووی نامێنێت و لە عززەت و پیاوەتی داخا.

وە ڕووناکی لەدڵدا ناهێڵێت و تاریکی دەست بەسەر دڵی دا دەکێشێ و دڵ تەنگی ڕووی تێدەکات.

---

[1] - ابی داود حکم حدیث :حسن صحیح

[2] - مسند إمام أحمد

## تەوبە بکە ...

پێویستە لەسەر ئەوانەی گیرۆدەی ئەو جۆرەکارو تاوانانەبوون تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەن و بگەڕێنەوە لای پەروەردگار و بێئومێد نەبن لە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگاریان بەڵکو پەروەردگاریش فەرمانی لێخۆش بوون بدا و لەو تاوانانە خۆش بێ کە ئەنجامی داوە.

پەروەردگار لەکەسێك دەبورێت داوای لێخۆشبوونی لێبکات وە لەو کەسە دەبورێت کە تەوبە دەکات و پێشوازی لەکەسێك دەکات کە دەگەڕێتەوە ..

کەواتە موژدەبێ دەرگای لێخۆشبوون کراوەیە و پەروەردگار و پەیامبەرەکەشی ﷺ موژدەی خۆشیان پێیە بۆ کەسێك کە دەگەڕێتەوە ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەموێ: ( قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ، كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ )[1]

واتە: ئەو کەسەی تەوبە دەکات لەتاوان وەك ئەوە وایە گوناهی نەکردبێت.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێ: { قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ][2]

واتە: (ئیبنو عەبباس) دەفەرمێت: کەسانێك لە هاوبەشبڕیاردەران خەڵکیان کوشتبوو بە زۆری، وە زینایان کردبوو بە زۆری، هاتنە لای پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم – وتیان ئەی محمد -ﷺ – ئەوەی تۆ دەیڵێیت و بانگەوازی بۆ

---

[1] - سنن إبن ماجه

[2] - [سورة الزمر: (٥٣) }.

دەکەیت شتێکی چاکە بەڵام پێمان بڵێ: ئایا ئەو تاوانانەی کە پێشتر کردوومانە دەسڕێتەوەو خوا لێمان خۆش دەبێت؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: ئەی محمد ﷺ بەو بەندانەم بڵێ کە ئیسراف و زیادڕەویان کردووە لە تاوان و سەرپێچیدا: بێئومێد نەبن لە ڕەحمەتی خوا بەدڵنیایی خوای گەورە لە هەموو تاوانێك خۆش ئەبێ تەنها شەریك دانان نەبێت بۆی ئیتر لە هەموو تاوانێکی تر خۆش ئەبێت، (ئەمە ئومێدبەخشترین ئایەتە لە کتابی خوای گەورە، وە صەحابە زۆر دڵیان پێی خۆش بووە)، وە (ئەم ئایەتە بانگکردنی سەرجەم کافران و تاوانبارانە بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، وە ئەوەی تەوبە بکات چەندێك تاوانی زۆر بێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، وەکو ئەو کەسەی کە سەد کەسی کوشت و تەوبەی کردو خوای گەورە لێی خۆش بوو)، (ابن عباس) دەفەرمێت: (هەرکەسێك لە پاش ئەم ئایەتە خەڵکی بێئومێد بکات لە تەوبە ئەوا باوەڕی بە قورئانی پیرۆز نیە) وە بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەڕەحم و بەزەییە.

**وە مەرجەکانی تەوبەی ڕاستەقینەش ئەمانەن:**

* پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکان .
* پشت لێکردن و وازهێنان لە تاوانەکان.
* نەگەڕانەوە سەر تاوانەکان لە داهاتوودا.

وە مرۆڤ پێویستە پەلە بکات لەکردنی تەوبە بۆ ئەوەی کۆتایی تەمەنی بەخێر بێ نەوەکو کۆتاییەکی خراپی هەبێ، وە دنیا شوێنی کارکردنە و لێپرسینەوە نیە، سبەینێش لێپرسینەوەیە و کردەوە نیە.

## کۆتایی خراپی تەمەن ( ئاخرشەڕی ) چیە :

کۆتایی خراپی تەمەن ئەوەیە کە مردن بگاتە مرۆڤ، لەو کاتەدا ئەو مرۆڤە خەریکی سەرپێچی و تاوان بێ و پشتی لە فەرمانەکانی پەروەردگار کردبێ.
بێگومان ئەوەش کۆتاییەکی کارەساتبارە بۆ مرۆڤ .
زۆرن ئەوانەی کە تەمەنیان بەخراپ کۆتایی پێهاتووە، وە نیشانەی ڕوون هەن لەسەر کۆتایی خراپی تەمەن لەوانە :
* نەهێنانی شایەتمان یان ڕەتکردنەوەی.
* باس کردنی کاری ڕۆژانەی .
* باس کردنی تاوانەکانی خۆی.
* باسی جنێودان گەر دەمی پیس بوبێ.
* باسی غەیبەت کردن .
* پەرستنی سەرکردەکەی و ناوهێنانی لەجێگەی شایەتی هێنان .
* پەرستنی پەڕۆ و ئاڵا .
* پەرستنی هەواو و ئارەزووەکانی لەسەرە مەرگ داوای دەکات .
* پەرستنی پارە و سامان .

ئەو هۆکارانە و چەندین هۆکاری تر کە دەبنە هۆی کۆتایی خراپی تەمەنی مرۆڤ.

## پلەکانی کۆتایی خراپی تەمەن :

یەکەم : لەسەر دڵ ...
ئەمەیان زۆر مەترسیدارە، چونکە گومان یان کەم و کوڕییەکانی بیروباوەڕ یان لادان لە ڕێگە پاکەکەی ئیسلام دەگرێتەوە .
لەم حاڵەتەدا گەر مردن بگاتە مرۆڤ ئەوکاتە بە هەمیشەیی مانەوە لە دۆزەخ دا سزا دەدرێ.
دووەم : لەکاتی ئەنجام دانی سەرپێچی ...
ئەم جۆرە لە حاڵەتی یەکەم باشترە،بەو مەرجەی هیچ کەم و کوڕیەك لە بیر و باوەڕی ئەو کەسە نەبێ ، هیچ گومان لەدڵی نەبێ بەرامبەر ئیمان و ئیسلام.
ئەو کەسە لەکاتی سەرپێچی کردن دەمرێ ، وەك نەزەر یان گوێ گرتن لە گۆرانی و زینا و ستەم کردن و ...تاد، ئەو کەسە لەقیامەتدا گەر پەروەردگار ویستی لەسەر بێ لێی خۆش دەبێ گەر ویستی لەسەر نەبێ بە قەدەر تاوانەکەی سزای دەدات و دواتر دەچێتە بەهەشتەوە .
بزانە کۆتایی خراپی تەمەن تووشی ئەو کەسە نابێت کە ڕواڵەت و ناوەوەی چاك بێت، وەڕاستگۆ بێت لە ووتە و کردەوەکانی.

## هۆکارەکانی کۆتایی خراپ چین ؟

یەکەم : هیوا درێژی

ئەمەیان کارەساتە، چونکە شەیتانی نەفرینکراو لەم ڕێگەیە بە سانایی دەتوانێ فێڵ لە مرۆڤ بکات بەوەی کە هێشتا تەمەنی زۆر ماوەو کاتی تەوبە نیە و کە گەیشتە تەمەنی پیری تەوبە دەکات .

لەکاتێکدا مرۆڤ نازانێ کۆتایی خراپ پەیوەندی بە تەمەنەوە نیە، کۆتایی خراپی تەمەن ئەوکاتە دەست پێدەکات کە مرۆڤ تەکلیفی شەرعی دەکەوێتە سەر ، لەوکاتە بەدواوە ئیتر کۆتایی باش و خراپی تەمەن دەست پێدەکات تا مردن پێی دەگات.

وە هیچ مرۆڤێکی عاقڵ تەوبە دواناخات بۆ کاتی پیری چونکە پیری هەمووی ژانی لاشەیە،لەپیریدا عیبادەت ناکرێ لەبەر چوون بۆ عیادە ، لەپیریدا زۆرجار ناتوانی خۆت پاك بکەیتەوە دەبێ کەسانی تر پاکت بکەنەوە ، ئەی چۆن دەتوانی دڵ و دەروونت پاك بکەیتەوە؟

دەبێ بە دووکەس هەڵتبگرن ، بتهێنن و بتبەن چۆن دەتوانی خۆت بەتەنها هەڵسی بۆ عیبادەت ؟

مرۆڤی عاقڵ ئامادەکاری دەکات بۆ مەرگ لە هەموو کاتێ بەڵام مرۆڤی بێعەقڵ ئامادەکاری دەکات بۆ پیری بۆ عیبادەت کەپێشی ناکرێ.

دووەم : شڵەژانی بیر و باوەڕ :

ئەمەیان زۆر مەترسیدارە چونکە چونکە مرۆڤ گەر بیروباوەڕێکی ڕاست و جێگیری نەبێت کۆتایی تەمەنی باش نابێ پەنا بەخوا.

زۆرکرس هەن لەگەڵ ڕێبازی ئیسلام دەبنە هەڵگری ڕێبازی تری دژی ئیسلام،جا ئەو ڕێبازە چەوتەی کە هەڵیدەگرێ لەپێناو پارەبێ یان لەهەر پێناوێ بێ ، بیگومان ئەمە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە و ڕێگە پێدراو نیە،چونکە تۆ ڕێبازێکی چەوت و بۆگەن هەڵدەبژێری بەسەر ڕێبازە پاکەکەی ئیسلام بۆ بەرژەوەندیەکی کەمی دنیا ، هەرچەندە ئەوەی کە بەبەرژەوەندی دنیایی لێکی دەداتەوە هەڵەیە چونکە ئەوکەسەی ڕێبازی تر هەڵدەگرێ خۆی و منداڵ و خێزان و بەها ڕەوشتیەپاکەکان و دین و دنیا و قیامەتیش دەدۆڕێنێ .

سێیەم : خۆشەویستی دنیا و ڕق لەمردن :

مرۆڤ کاتێ دوای دنیا دەکەوێ بەشێوەیەك وەك ئەوەی قیامەت هەر نەبێ، چونکە پارە و سامان و خانو و ئۆتۆمبێلی جوان و مۆدێل بەرز دڵی مرۆڤ بۆخۆیان کەمەند کێش دەکەن و قیامەتی لەبیر دەبەنەوە، تا دەگاتە سەرەمەرگ ئەوکاتیش شایەتیدان بەهانایەوە نایەت چونکە لەدنیادا کارێکی بە لاالەالاالله نەبووە .

چوارەم : پشت کردن لە هیدایەت :

زۆرجار پەروەردگار ئەو ڕێگایەت نیشان دەدات کە تۆ بەردەوام گلەیی دەکەی بەوەی کە سەرت شێواوە و نازانی کامە حەقە و کامە هەڵەیە، بەڵام پشتی لێدەکەی و خۆتی لێ بێئاگا دەکەی فێڵ لەخۆت دەکەی، بەڵام بەدڵنیاییەوە ناتوانی فێڵ لە پەروەردگارت بکەی چونکە ئەو ئاگادارە بە نهێنی و شاراوەکان.

ئەوانەشی کە پشت لە هیدایەتی پەروەردگار دەکەن بێگومان کۆتایی تەمەنیان باش نابێ و سەربەرزانە ناگەڕێنەوە لای پەروەردگار.

پێنجەم : سوور بوون لەسەر تاوان و بەردەوام بوون لەسەری :

بێگومان پەروەردگار ئارام دەگرێ لەسەر تاوانەکانی بەندەی وە هەلی زۆری پێدەدا تا بگەڕێتەوە و تەوبە بکات ، بەڵام زۆرجار بەندە سوور دەبێ لەسەر تاوان و دەست هەڵناگرێ تا ئەوکاتەی مردن پێی دەگات .

مرۆڤی موسڵمان دەبێ ئەو هۆکارانە و چەندینی تریشی لەبەر چاو بێت و بیزانێت تا کۆتایی تەمەنی بەخراپ کۆتایی پێنەیە و بە ڕوویەکی سپی بگەڕێتەوە لای پەروەردگاری ، وە دەست بەو هۆکارانەوە بگرێ کە کۆتایی خێر بن بۆی .

## بەکورتی چۆن لە داوێن پیسی ڕزگارمان بێت؟...

یەکێك لە گەورەترین گوناهەکان زینایە ، چونکە کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر دڵ ، ئەمەش ترسناکەچونکە دڵ شوێنی خواپەرستی و خۆشەویستیە، کاتێ دڵ کاریگەری تاوانی دەکەوێتەسەر خۆشەویستی و خواپەرستی کاڵ دەبێتەوە و هەندێ جار هەر نامێنێ، بۆیە پێویستە بەندە ئاگاداری خۆی بێ و خۆی بە دوور بگرێ لەو شتانەی کە خۆشەویستی و خواپەرستی لەدڵ ناهێڵن.

بۆ ڕزگار بوون و خۆپاراستن لە کاریگەری خراپی تاوانی زینا ئەم ڕێگایانە بگرە بەر:

* بەدوای هۆکارەکانی هیدایەت دان بکەوە.

* بیروباوەڕەپاکەکە کە ڕێبازی ڕاست و دروستی خوا و پێغەمبەری خوایە وەربگرە نەك وەك خەڵکی بە تەقلید و عادەت شوێنی بکەوی .

* لەکاتی زینادا بیرت بێ و ئاگاداربە : مردن لەوکاتەدا خراپترین شتە کەپێت بگات ، بۆیە خۆت بپارێزە و شوێن پێغەمبەر و هاوەڵان بکەوە .

* خوێندنەوەی بەردەوامی قورئان : قورئان ڕێگرە لە تووش بوون بە تاوان و دەتپارێزێ وەباشترین ڕێگا نیشاندەرە بۆ کەسێ کە لێی تێبگات و کاری پێبکا .

* خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی دژی زیناکردنن .

* پابەند بوون بە فەرمانەکانی پەروەردگار، وە فەرمایشتەکانی پێغەمبەرﷺ ، وە نەهیەکانی پەروەردگار و پێغەمبەر، پەروەردگار دەفەرموێ :- (تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ* وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ)

* ئەنجامدانی ڕەوشتی باش و چاك و بانگەواز بۆکردنی لەناو خەڵکیش.

* بۆشاییەکانت بە عیبادەت و خوێندنەوە و هاوڕێیەتی کردنی کەسانی باش پڕ بکەوە.

* ئەنجامدانی نوێژەکان لەکاتی خۆی وە کردنی سوننەتەکان بەپێی توانا ، وە پەنا بۆ ئەوکارانە ببات کەزیاتر دەیپارێزن .

* خۆی لە تێکەڵبوونی هەڕەمەکی ژن و پیاو بپارێزێ .

* دوورکەوتنەوە لە کەسانی خراپ

* پەلەکردن لە ئەنجامدانی کاری خێر و چاك .

* پاککردنەوەی دڵ و دەروون و خۆ خەریك کردن بە نەفس و بیرکردنەوەی باش.

* لە پیاوان پاراستنی چاو و لە ئافرەتان داپۆشینی جەستەیان بە بەرگی شەرعی.

* زووتر هاوسەرگیری بکە .

## لەکۆتاییدا :

ئەو هۆکارانەی کە باس کران چەندین هۆکاری تریش هەن کە عەلمانیەت ئیشی لەسەر کردوون و بەبەرنامە ئەم ژەهرەیان بەگەرووی موسڵماناندا کردووە.

بەڵام ئێمە دەبێ بزانین کە پەروەردگار قورئانی ناردووە تا بیکەینە پەیڕە و پڕۆگرامی ژیان، گەر سەیری قورئان بکەین دەبینین لەهیچ شوێنێکی قورئان ڕێگری نەکردووە لەشوو کردنی ئافرەتان یان هاوسەرگیری پیاوان، تەنانەت کار ئاسانی زۆریشی کردووە بۆ ئەو پڕۆسەیە بە شێوازێکی حەڵاڵ و سەربەرزانە . بۆیە پێویستە مرۆڤ ڕێز لە قورئان و پەروەردگاری بگرێ و گوێڕایەڵی بێت، هەروەها وەك چۆن پەروەردگار بە پاکی مرۆڤی دروست کردووە و ژیانێکی جوانی پێ بەخشیوە ئاواش ئێمە ژیانەکە بەپاکی بکەین و خۆمان بەدوور بگرین لەهەر شتێك کە گومان دەخاتە سەر مرۆڤ بوونمان وە پێویستە بە ( عەقیدە ) بیر و باوەڕێکی پاکەوە بژین و( موەحید ) یەکخواپەرست بین کە ئەوەیان ئەصڵی دین و ژیانی یەکەمی مرۆڤە، نەك فرەخواپەرست و هەر ڕۆژێ لەسەر دینێ بین ، چونکە مولحید بوون یان دەست بردن بۆ تاوان و بەردەوام بوون لەسەری دەتبا بەرەو ژیانی دووەم ژیانی دووەمیش ژیانی ئاژەڵانە کە خواردن و خەو و پیسایی کردن و ئەنجامدانی هەرشتێکە کە بیانەوێ بێ گوێدانە هیچ بەهایەکی ڕەوشتی و جوان . داواکارم لە پەروەردگاری جیهان و بە موەحیدی بم ژێێنێ و بم مرێنێ، وە لەهەڵە و کەم و کورتی بەندە نەزانەکەی خۆش بێ

وآخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمین .    ٢١ -٣- ٢٠٢١ زاینی

## سەرچاوەکان ...


* قورئانی پیرۆز ... تەفسیری ڕێبەر
* فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ....
* سایتی سبەی ....
*ماڵپەڕی ئەلجەمەل ......
* سایتی ڕووداو....
* ٢٤ Kسایت ...
* ماڵپەڕی ئاژانسی ئەنادۆڵ ...
* D w....
* زاستی پۆلی ١٢
* Who
* © ٢٠٢١ State Urgent Care. All rights reserved. | Website by Healthcare Success.
* NBC News, HuffPost, ASACP, IWF
* www.vanderbilt.edu

MEDICAL NEWS TODAY

www.vanderbilt.ed

www.webmd.com

**The relative health benefits of different sexual activities:**

**The post-orgasmic prolactin increase following intercourse is greater .than following masturbation and suggests greater satiety**

**Sexual functioning and self-reported depressive symptoms among college women**

www.livescience.com/ کەمێ دەستکاری و ڕێکخستن

www.vanderbilt.edu

Mayo clinic

cdc.gov

www. Plannedparenhood.org

www.healthline.com

HIV.gov

https://www.unaids.org/en

* www.womenshealth

* وە سەرچاوەی تریش ...

# پێڕست

* فره خواپەرستەکان ئامانجی گەورەیان بێ ڕەوشت کردنی کۆمەڵگایە چونکە ئەگەر مرۆڤ لەفیترەتە پاکەکەی خۆی لایدا ناخەکان و بیرو باوەڕە پاکەکان پیس دەبن .هەرکاتێکیش ناخ و بیرو باوەڕ پیس بو مرۆڤایەتی دەچێتە ئاستی نزمترین ئاژەڵ.

* فره خواپەرستەکان هەمو هەوڵ و تێکۆشانیان بۆ ئەوەیە جیهان بەپوڕن بکەن واتا ژیانی هەمو چین و توێژەکانی نێو کۆمەڵگا بخەنە نێو بازنەیەك کەمرۆڤەکان بەگشتی بۆیان نەکرێ لەنێو ئەم بازنەیە دەرچن تەنهاو تەنها بیر لە شەهوەت و سێکسی بکاتەوە هەتا لەگەڵ گیاندارانیش.

* دڵی گەنجان بنچینەو بەردی بناغەی مزگەوتەکانن بەڵام فره خواییەکان لەڕێی کۆمەڵێ هۆکاری بەدڕەوشتییەوە دڵەکان ژەهراوی دەکەن ولەوڕێیەوە بناغەی مزگەوتەکان لەبنمیچەوە هەڵدەتەکێنن.

* سەدەی بیست و یەك سەدەی نەمانی شکۆو بێ نرخ کردنی ئافرەتە بەجۆرێ وەك کەل پەل و کالا کرین و فرۆشتنیان پێ دەکرێت لەژێر سێبەری بەناو ئازادی ئافرەتان .
ئافرەتان بناغەی پەروەردەو دروست کردنی کۆمەڵگایەکی تەندروستن فرەخواییەکان لەژێر ناوی قەبەو زل و بێ ناوەرۆك ژەهراوی یان دەکەن و بەمەش کۆمەڵگایەکی دور لەتێروانینی مرۆڤایەتی دروست دەبێت و دەبێتە هۆکاری هەرەس بونی کۆمەڵگا.

چاپی یەکەم
هەولێر ۲۰۲۱